# هەڵەبجە نیوز
# Halabja News

بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بەساڵیادی
کیمیابارانی هەڵەبجە
چوارشەممە ١٦ی٣ی٢٠١٦
ژمارە (١)
خاوەن ئیمتیازوسەرنوسەر
سەلاح سەعید ئەمین

# هەڵەبجە چاوەڕێتانە

سالێك تێپەردەبێت بەسەرکۆبونەوەی پەرلەمانی کوردستان لەهەڵەبجەو پەسەندکردنی پرۆژە یاسایی ئەنجومەنی پارێزگاکە،جێ ی نیگەرانیە تا ئێستا لایەنە سیاسیەکان نەگەشتونەتە ڕێکەوتن و ئەنجومەنی پارێزگاکە پێکنەهاتوە،لەکاتێکدا هەنگاوی یەکەم بۆ بەپارێزگابونێکی کردەیی لە پێکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگاوە دەست پێدەکات،خەڵکی شارەکە نیگەرانن لەبەڵێنی سەرکاغەزی بەرپرسان و تاقەتیان چوە. هەڵەبجە ئێستا لەهەموکات زیاتر پێویستی بەئاورلێدانەوە هەیە،دوای بریاری بەپارێزگابون هەڵەبجە چوەتە قۆناغێکی ترەوە قۆناغی بونیادنانی ژێرخانی پارێزگاو دروستکردنی پایەکانی،گرنگە هەرلەسەرەتاوە ڕەچاوی ئەوەبکرێت بەشێوەیەکی زانستیانە و بەرمەبنای ماستەرپلان و تیۆریە نوێیەکانی شارو ئاوەدانی نەخشەی ئەم پارێزگا نوێیەی هەرێم و عێراق دابرێژرێت،گرنگە هەمو لایەك و بەجیاوازی دەنگ ورەنگ و بیرکردنەوەمانەوە کار بۆ دروستکردنی پارێزگایەکی نمونەیی بۆ هەڵەبجە بکەین،پارێزگایەك وەڵامگۆیەکی کردارییی ئەو جینۆسایدە بێت کە ٢٨ سال بەرلەئێستا گەلەمان لەهەڵەبجە روبەروی بویەوەو هێمایەکیش بێت بۆ سەلماندنی ئاستی توانینی ئێمە بۆ ئاوەدانی و ژیانی شارو شارستانی،بۆ ئەمەش پێویستە لەسەرئاستی هەولێرو بەغدا بەچری کار بۆ هەڵەبجە بکرێت و،هیچ ناکۆکیەك لەمپەرنەبێت لەرێ ی زوو پێکگرتنی پایەکانی ئەم پارێزگا نوێیەدا .

لەبەردەم نەخۆشخانە تەواونەبوەکەدا

## گردبونەوەیەك ڕێکدەخرێت

هەڵەبجە نیوز:تایبەت رۆژی چوارشەمە ١٦-٣-٢٠١٦کە هاوکات ٢٨ هەمین سالیادی کیمیابارانی هەڵەبجەیە بەسەرپەرشتی دەستەی چاودێری پارێزگای هەڵەبجە گردبونەوەیەکی نارەزایی لەبەردەم نەخۆشخانە تەواونەبوەکەی بەرکەوتوانی چەکی کیمیاویدا ڕێکدەخرێت.

دانا عەدول،کەسەرپەرشتیاری دەستەکەیە بە هەڵەبجە نیوزی گوت:کومەڵێك گەنج کەزۆربەیان کادیری تەندروستین لە١٦ی ٣ دا لەبەردەم نەخۆشخانە تەواو نەبوەکەی بەرکەوتوانی چەکی کیمیاویدا بەسەرپەرشتی دەستەی چاودێری پارێزگای هەڵەبجە گرد دەبینەوە و داوای بەسزاگەیاندنی گەندەلکاران و بەدەمەوەچونی بەرکەوتوان دەکەینەوە،دانا ،ئەوەشیگوت:پاشان سەردانی مالی شەهیدی زیندوو "کامل عەبدولقادر"دەکەین و وەك سیمبولی قوربانیانی کیمیاباران پشتیوانی خۆمانی بۆ دوپات دەکەینەوە.

## ڕاپۆرتێکی شیکاری دەخرێتەرو

هەڵەبجە نیوز: بریارە ١٨ی٣ دەستەی چاودێری پارێزگای هەڵەبجە،لەهۆلی ژیار راپۆرتی خۆی لەسەر پارێزگا بخاتەرو،کەتیایدا ئەوەی بریاربوە بکرێت ونەکراوە وکیشەو ئاستەنگەکان باسکراون،هەروەك راسپاردەو پێشنیاریش لەوراپۆتەدا دێت.

سەرچاوەیەك بەهەڵەبجە نیوز راگەیاند:برگەیەکی تری راپۆرتەکە باس لەگەشەپێدانی دۆخی پایتەختی ئاشتی وگەشەپێدانی دەکات. هەمانسەرچاوە ئەوەشیگوت:راپۆتەکە رەخنەیی و شیکارییە وسالانە ئامادە دەکرێت.

هاوڵاتیانی هەڵەبجە: بێزارین لەدرۆ....ل٣

هەڵەبجە ناچێت بۆ بەغدا....ل٤

### ٩٧٠ بەرکەوتەی کیمیایی لەهەرێمدا هەیە
## ٤٥٠ یان لەسنوری هەڵەبجەدایە

زانا ئەحمەد

تەواونەبونی نەخۆشخانەی تایبەت بە بەرکەوتوانی چەکی کیمیاوی لەهەڵەبجە بۆتە مەتەل و ٩ سالە تەواو نەبوە ولەو ماوەیەشدا ٤٧ بەرکەوتەی چەکی کیمیاوی گیانیان لەدەستداوە. لوقمان عەبدولقادر سەرۆکی کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە کەخۆی یەکێکە لەبریندارە پلە یەکەکان و بەشێك لەسیەکانی لەناوچون ،گوتی:لە١٦ی٣ی٢٠٠٧ەوە بەردی بناغەی نەخۆشخانەیەکی تایبەت بەبریندارانی چەکی کیمیاوی دانراوە بەلام تائێستا تەواو نەبوە،بەپێ ی دواهەمین ئامار لەهەرێمدا ٩٧٠ بەرکەوتەی کیمیاوی هەیە ولەو رێژەیەش ٤٥٠ یان لەسنوری پارێزگای هەڵەبجەدایەکامیل عەبدولقادرجگە لەخوشکێکی کۆی ئندامانی خێزانەکەی لەدەستداوە لەکیمیابارانی هەڵەبجەدا

ئێستا بریندارەو چاوەرێ ی فریادرەسێك دەکات بۆ ناردنە دەرەوەی بۆ وەرگرتنی چارەسەر .
د. هونەر بەرێوەبەری گشتی تەندروستی شارەزوریش رەخنەی توندی لەحکومەت گرت و وتی:ئەوەی کیشەکەی زیاتر کردوە ئەوەیە دۆسێ ی بریندارانی تائێستا سەبەوەزارەتی شەهیدانە لەکاتێکدا کۆی پرۆسەکە پەیوەندیدارە بە وەزارەتی تەندروستیەوە.
بەگوێرەی زانیارییەکانیش سالی ٢٠١١ کۆمەڵەی قوربانیان سکالایان لەدژی کومپانیای جێبەجێکاری پرۆژەکە بەرزکردوەتەوەبەلام بەبیانوی نەبونی لایەنی سکالاکار لەگرێبەستەکەدا لەبەرژەوەندی کومپانیاکە کۆتای هاتوە

### بۆچی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە پێکنەهاتوە؟
## یەکگرتو:هۆکارەکەی بۆ حزبەسیاسیەکان دەگەرێتەوە

هەڵەبجە نیوز

سەرۆکی لیستی یەکگرتو بۆ ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە هۆکاری پێکنەهێنانی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە بۆ لایەنە سیاسیەکان دەگێرێتەوە.

ئەرسەلان حەسەن،سەرۆکی لیستی یەکگرتو بۆ ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە ،لەبارەی پێکنەهێنانی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجەوە وتی:هۆکارەکەی لایەنە سیاسیەکانن،پارێزگاری هەڵەبجە لە١-١٠-٢٠١٥ داوای لەلایەنە سیاسیەکان کرد ناوی کاندیدەکانیان بنێرن،ئێمە وەك یەکگرتو لە ١-١٠ ناوەکانمان پێدان ،بزوتنەوەو شیوعی و یەکێتی -یش ناوەکان ئامادەیەو گورانیش ناوەکانی رادەست نەکردوەو وپارتی-ش گرفتی هەیە.
ئەرسەلان حەسەن،ئەوەشیگوت:بۆ

دەستبەکاربونی بەرێوەبەرایەتیە گشتیەکان پێویستە ئەنجومەنی پارێزگا پەسەندیان بکات،ئەگەر کاتی خۆی لایەنە سیاسیەکان پابەندبونایە بەرێوەبەرایەتیە گشتیەکان بەئاسانی دەستبەکارئەبون،سەرۆکی لیستی یەکگرتو بۆ ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە ،پێکنەهێنانی ئەنجومەنی پارێزگا بەرێزنەگرتن لەبەپارێزگابونی هەڵەبجە دادەنێت:ئەوە رێزنەگرتنە لەبەپارێزگابونی هەڵەبجە،پەرلەمان لەهەڵەبجە کۆبوەوە وەك کاراکردنێك بۆ ئەو مەسەلەیە،ئەرسەلان حەسەن،وتیشی:دابەشکردنی کوسیەکانیش لەسەر دەئەنجامی دواهەڵبژاردن بوە وکاکەیەکانیش وەك کۆتا کورسیەکیان بۆ دانراوە. ئیش وکارەکانیش بە پارێزگار و دوو جێگرەکەی نارۆن بەرێوەو هاواریان لێ بەرزبوەتەوە.

## چیرۆکێک ٢٨ ساڵە سارێژ نەبوە

# چیرۆکی منداڵە ونبوەکانی هەڵەبجە

شارپرێس: نیقاش

چیرۆکی منداڵە ونبووەکانی هەڵەبجە سەرەڕای تێپەڕبوونی نزیکەی سێ دەیە، بەڵام هێشتا کۆتایی نەهاتووەو ساڵ بەساڵ گۆڕانکاریی نوێی تیا ڕوودەدات.

لەمساڵ ٢٨ ساڵ تێپەڕ دەبێت بەسەر کیمیابارانکردنی هەڵەبجە، هەموو ساڵێکیش لەگەڵ نزیکبوونەوەی دەیان چیرۆکی خەمهێنو کارەساتبار دەبنەوە باسو خواسی خەڵکی.

ڕۆژی ١٦ی ئازاری ١٩٨٨ فڕۆکەکانی ڕژێمی بەعس شاری هەڵەبجەیان کیمیابارانکرد (٨٣ کم باشوری ڕۆژهەڵاتی سلێمانی) بەپێی ئامارەکانی حکومەتی هەرێمیش زیاتر لەپێنج هەزار هاوولاتی بەژنو پیرو منداڵەوە گیانیان لەدەستداوە.

چیرۆکەکە تەنیا لێرەدا کۆتایی نایەت، بەڵکو سەدان برینی سارێژنەبوو بەیادەوەری خەڵکی ئەو شارەوە ماوە، یەکێك لەدیارترین دۆسێکانیش پەیوەستە بەو منداڵانەی لەکاتی ڕووداوەکە لەکەسوکاریان دابڕاونو تائێستا نەدۆزراونەتەوە.

لەترسی کیمیابارانو بۆمباران، ئەو خەڵکەی کاتی ڕووداوەکە بەرنەکەوتن بەکۆمەڵ ئاوارەبوون، بەهۆی ئەوەی ڕێگای سلێمانی لەخەڵکەکە گیرابوو، بۆیە سەرجەمیان بەرەو ئێران هەڵهاتن، لەم بێنەو بەردەیەشدا بەسەدان منداڵ لەکەسوکاریان دادەبڕێنو بەشێکیان ئەوکاتەو ساڵانی دواتر بەکەسوکاریان شاد دەبنەوە، بەڵام ژمارەیەکی تریان تائێستا چارەنووسیان بەنادیاری ماوەتەوە کەسوکاریشیان هەر لەسۆراغیان دەگەڕێن.

لەلای دەسەڵاتدارانی هەرێم بەرەسمی ئەو منداڵە ونبووانە وەك قوربانی تۆمارکراونو لەو کێلە ڕەمزیانەی لەهەڵەبجە بۆ قوربانییەکان دروستکراوە ناویان نوسراوە، بەڵام کاتێك یەکێکیان دەگەڕێتەوە، وەك ئەوە وایە لەگۆڕەکەی هاتبێتە دەرەوەو ناویان لەسەر کێلەکە دەسڕێتەوە.

عائیشە ئەحمەد (٦٥ ساڵ) ژنێکی دانیشتووی هەڵەبجەیە، کاتی کیمیابارانکردن پێنج منداڵی لێ بزر دەبێتو تائێستا چاوەڕێی گەڕانەوەیانە، عائیشە بە"نیقاش"ی وت "هەر پێنج منداڵەکەم لەگەڵ تراکتۆری دراوسێیەکماندا سەرخست بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێت، بەڵام ئەوە ئیتر دواجار بوو بیانبینم، چونکە لەوە بەدواوە نازانم چیان بەسەرهاتو تائێستا چاوەڕێی گەڕانەوەیانم».

ئەو ژنە تائێستاش کۆڵی نەداوە لەگەڕان بەدوای منداڵەکانیدا، بەڵام هیچی دەست نەکەوتووەو گلەیی لەحکومەتی هەرێمیش ئەوەیە کە خەمی چارەنووسی منداڵەکانیانی نەخواردووەو بەرەسمی هەوڵ بۆ دۆزینەوەیان نەدراوە، هەرچەند دڵنیایە لەوەی تا دیوی ئێران لانی کەم چوار منداڵی بەسەلامەتی دەربازیان بووە، بەڵام ئیتر لەوێدا زانیارییەکانی بچراون.

لەمڕووەوە دەڵێت "کە چوینە نەخۆشخانەی کەرەج لەنزیك تاران ناوی چوار منداڵم هەبوو کە چووبوونە ئەو نەخۆشخانەیەو وتیان ناردومانن بۆ خانەی بێ دایكو باوکانو بەڵام منداڵەکەی ترم ناوی نەبوو».

بیستو هەشت ساڵی ڕەبەقە عائیشەو کەسوکاری تری منداڵە ونبووەکان لەهەردوو دیوی ئێرانو عێراق بۆ منداڵەکانیان دەگەڕێن، بەڵام نە ئەوەتا بزانن لەکوێن، نە ئەوەتا گۆڕیشیان دیارە، هەر زانیارییەکیشیان بەر گوێ کەوتبێت شوێنی کەوتوون، بەڵام زۆربەیان بەهیوابراوی گەڕاونەتەوە.

سەلاح محەممەد (٤٥ ساڵ) یەکێکی ترە لەو کەسانەی کە لەڕۆژی ١٦ی ئازارەوە لەخوشكو براکانی دابراوەو ئیتر نەیبینیونەتەوە، لەلیستی منداڵە ونبووەکاندا ناوی دوو خوشكو برایەکی محەممەد هەیە کە ئەویش لەکاتی قەرەباڵغی ئاوارەبووندا وندەبنو تائێستا هیچ لەبارەیانەوە نازانێت.

سەلاح خەتای یەکەمی نەدۆزینەوەی خوشكو براکانی دەخاتە ئەستۆی بەرپرسانی هەرێمو بەکەمتەرخەمیان دەزانێت، بە"نیقاش"ی وت "ئەگەر حکومەت دڵی ئەوان نەماون ئەی بۆ ناوە ناوە هەندێك لەو منداڵانە دەدۆزرێتەوە، ئێمە هەموو ڕۆژێکمان هەر مردنەو دایكو باوکیشمان بەداخی دیار نەمانی منداڵەکانیانەوە سەریان نایەوە». لوقمان عەبدولقادر بەرپرسی کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە هەمان بۆچوونی سەلاحی هەیەو حکومەتی هەرێمو بەتایبەتی وەزارەتی شەهیدان بەکەمتەرخەم دەبینێتو بە"نیقاش"ی وت "چەندینجار بەوەزارەتی شەهیدانمان وتووە بۆ ئەوەی لەدیوی ئێران منداڵە ونبووەکان بهێننەوەو پشکنینی DNA یان بۆ بکرێت، بەڵام بەبیانووی سەرقاڵییەوە دۆسێکەیان فەرامۆشکردووە».

بەپێی ئەو ئامارانەی لەلای کۆمەڵەکەی لوقمان تۆمارکراوە، ١٠٩ منداڵ لەلیستی شوێن بزربووەکاندا هەن، لەماوەی چەند ساڵی ڕابردووشدا ژمارەیەك لەوانە گەڕاونەتەوەو بەکەسوکاریان شادبوونەتەوە.

عەلی عوسمان جێگری پارێزگاری هەڵەبجەو بەرپرسی لیژنەی منداڵە ونبووەکانی هەڵەبجە ئەوەی بۆ "نیقاش" پشتڕاستکردەوە ئاماژەی بەوە کرد کە ئەو ١٠٩ منداڵە، منداڵی ٦٧ خێزانو ئەوانەشی گەڕاونەتەوە سەرجەمیان ئەو چەند ساڵە لەئێران بوون، وتیشی "فشارمان خستوەتە سەر وەزارەتی داراییو شەهیدان بۆ ئەوەی پەلە بکرێت لەدۆزینەوەی ئەو منداڵانە». پێنج ساڵ پێش ئێستا (٢٠١١) عەلی یەکێك بوو لەو کەسانەی بەتەمەنی (٢٤ ساڵی) گەڕایەوە، تەنانەت چیرۆکی عەلی بوو بەبابەتی فیلمێکی سینەمایی، لەبەر ئەوەی پێنج خێزان خۆیان بەخاوەنی دەزانیو چاوەڕێی پشکنینی خوێنیان دەکرد، تا دواجار لەڕێی پشکنینی خوێنەوە دەرکەوت کە کوڕی کامە خێزان بووەو بەدایکی شاد بووەوە.



کێشەی عەلی ئەوە بوو کە لەزمانی خوشكو براکانی نەدەزانی، چونکە ئەو چەند ساڵە لای خێزانێکی فارسی زمان پەروەردە بووەو هیچ کوردی فێر نەبوو بوو.

ئەو کوڕە بەتەمەنی یەك ساڵان لەکیمیابارانی هەڵەبجەدا ون دەبێتو خێزانێکی ئێرانی لەشاری (مەشهەد) لەخۆی دەگرن، کاتێك خوێندنی ئامادەیی تەواو دەکاتو دەیەوێت لەزانکۆ بخوێنێت، بەهۆی ئەوەی ڕەگەزنامەکەی ئێرانی نابێت ڕێی خوێندنی پێنادان، ئیتر لەوێوە دەزانێت کە کەسوکارەکەی لەهەڵەبجەنو دەگەڕێتەوە. نزیکەی هەشت مانگ پێش ئێستا کچێکی تەمەن (٢٩ ساڵ) بەناوی مەریەم گەڕایەوە بۆ هەڵەبجەو پاش پشکنینی خوێن کەسوکاری خۆی دۆزیەوە، مەریەمیش بەهەمان شێوە لای خێزانێکی ئێرانی گەورە بوو بوو.

گێلاس ئەسکەندەر دایکی مەریەم بە"نیقاش"ی وت "هیچ هەستێك لەوە گەورەتر نییە دوای ٢٨ ساڵ ئەو کچەم ببینمەوە کە بەیەك ساڵی لێم ونبوو، وەك ئەوە وایە خوا تازە هاونازی پێ بەخشیبێتمەوە».

مەریەم ناوە ڕاستەقینەکەی لەلای دایكو باوکی (هاوناز)ە، بەڵام کەچووەتە ئێران خێزانێك لەوێ گرتویانەتە خۆو ناوی (مەریەم)یان لێناوە.

دایکی مەریەم (هاوناز) سێ منداڵی هەبووە، (ڕێباز) لەگەڵ خۆی دەربازی بووەو هاونازو کوڕێکی لێ ونبووە، ئێستا کە هاونازی دۆزیوەتەوە دەڵێت "تا مردن چاوەڕێی کوڕەکەی ترم ئەکەم کە لێم ونبووە، بەڵکو ئەویش وەك هاوناز ببینمەوە».

چوار مانگ لەمەوبەر کچێکی تر کە ئەویش تەمەنی (٢٩ ساڵە) بەناوی (شایلی حسێن) گەڕایەوە هەڵەبجەو پشکنینی خوێنی بۆ کراوە تا بەکەسوکاری شاد بێتەوە، چونکە هەموو ئەو کەسانەی منداڵیان لێ ونبووە، ناوی خۆیان تۆمارکردووەو سەمپڵی خوێنیان لێ وەرگیراوە بۆ ئەوەی ئەگەر منداڵێك دۆزرایەوە بەخوێنەکەی ئەوان بەراورد بکرێت، بەڵام تائێستا ئەنجامی پشکنینی خوێنەکە ساغ نەبووەتەوە.

شایلی ئەو کاتەی لەڕووداوەکەدا بزربووە ژنو پیاوێکی ئێرانی لەشاری کەرەج بەناوی حسێنو فاتیمە گرتوویانەتە خۆو گەورەیان کردووە، تا ئەوەی بووەتە ئەندازیاری کشتوکاڵ.

شایلی بە"نیقاش"ی وت "شەش ساڵ پێش ئێستا دایكو باوکم پێیان وتم کە من کچی ئەوان نیمو لەکارەساتی هەڵەبجە ونبووم، کاتێکیش لەڕێی تەلەفزیۆنەوە بینیم مەریەم گەڕاوەتەوە بۆ هەڵەبجەو کەسوکاری خۆی دۆزیوەتەوە، ئەوە منی هاندا کە منیش بگەڕێمەوە بۆ ئەوەی کەسوکارەکەم ببینمەوە».

ماوەیەك لەمەوبەریش دوانی تر لەمنداڵە ونبووەکانی هەڵەبجە بڕیاریاندا بگەڕێنەوە بۆ شارەکەیانو پشکنینی خوێن ئەنجام بدەن، ئەو دوو کەسەش ناویان (ئەعزەمو بارزان)ە.

بارازان تەمەنی ٢٩ ساڵەو لەشاری سنە خوێندنی تەواوکردووەو خێزاندارە، ئەعزەمیش تەمەنی ٣٠ ساڵەو لەتاران نیشتەجێیەو ئەویش خێزاندارەو دوو منداڵی هەیە، وەك ئەوەی سەرۆکی کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە بە"نیقاش"ی وت، پشکنینی خوێنی بارزانو ئەعزەم تەواو بووەو ئەمساڵە لەیادی کیمیابارانەکەداو لەڕۆژی ١٦ی ئازار بەکەسوکارەکەیان شاد دەکرێنەوە.

عەلیو مەریەم لەگەڵ شەش منداڵی تر بەکەسوکاریان شاد بوونەتەوەو شایلیو ئەعزەمو بارزانیش چاوەڕێی ئەنجامی پشکنینەکانن، بەڵام تائێستا نزیکەی سەد منداڵ چارەنووسیان بەنەزانراوی ماوەتەوەو ٢٨ ساڵە کەسوکارەکەیان بەشوێنیاندا دەگەڕێنو بەشێکیان بەو خەمەو خەفەتەوە سەریان نایەوە، بەڵام چیرۆکی گەڕاوەکان کۆتاییەکی دڵخۆشکەرە کە زۆربەیانی ئاسوودە کردووەو هیوایەکی کردووە بەبەریاندا بۆ شادبوونەوە بەوانەی کە ماون.

# خەڵکی هەڵەبجە لەساڵیادی کیمیابارانی شارەکەیاندا چی ئەڵێن؟

ئا:هەڵەبجەنیوز

خەڵکی هەڵەبجە لەیادی کیمیابارانکردنی شارەکەیاندا چی دەڵێن؟

لەیادی ٢٨هەمین ساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجەدا چەند هاولاتیەك لەشاری هەڵەبجە بەم جۆر بۆ هەڵەبجە نیوز دوان،کاندیدێکیش بۆ ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجەئاستەنگی گەورەی بەردەم پێکەهێنانی ئەنجومەنی پارێزگاکەش بۆ هێزە سیاسیەکان دەگێڕێتەوە.

## بێ ئومێد بوین لەدرۆ

لەتیف عوسمان،دوکاندار،وتی:بروام بەقسەی بەرپرسان نەماوە،خەڵك بەعەقڵی خۆی چی هات بەخەیاڵیدا ئەوە بکات،قسە بەتاڵەو ناچێتە گیرفانەوە،بێ ئومێد بوم لەهەرچی درۆ و دەلەسە هەیە،حکومەت بەرپرسەو گەوجاندنی خەڵك باوی نەماوە.

## بەکردەوە ببێتە پارێزگا

سەعید وەهاب،مامۆستا،ئاماژەی بۆ ئەوەکرد:پارێزگا تەواو بکرێت و بە کردەوە ببێتە پارێزگا و بەرێوەبەرایەتیە گشتیەکان دەستبەکاربن.

## وازمان لێ بێنن

دانا واحید،وەرزشکار،وتی:وازمان لێ بهێنن،هەرچی نەخۆشی دەرونی هەیە توشمان بو،بەسەئیتر،هەڵەبجە لادێیەکی گەورەیە هیچی لەپارێزگابون ناچێت.



## شەقامەکان چاك بکەن

سەرکو موحەمەد،مامۆستا،وتی:شەقام و ڕێگاوبانەکانی ناوشار چاك بکەن،ئەو دەولەمەندانەی لەدەرەوەی هەڵەبجەن پرۆژە بۆ هەڵەبجە جێ بەجێ بکەن،سەرکو ئەوەشیگوت:ئەو نەوتەی کەلە هەڵەبجە هەیە دەستکاری نەکرێت تا حکومەتێکی دامەزراوەیی دەست بەکار دەبێت.

## تەجاوەزەکان لاببەن

گۆران کەریم،خوێندکاری زانکو،وتی:هەڵەبجە تەجاوەزی زۆر تیایە داوا ئەکەم لەبەرپرسان و شارەوانی بەتایبەت ئەو تەجاوەزانە لاببەن و کۆتایی بە زیادەرەوی و تەجاوەز بهێنرێت لەهەڵەبجەدا.

## هێزەکان ئاستەنگن

یەحیار نەوزەر جاف ،کەکاندیدی یەککگرتوە بۆ ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە ،وتی:زۆرێك لەحزبە سیاسیەکان تا ئێستا ناوەکانیان بەفەرمی رادەست نەکردوە بۆ ئەوەی ئەنجومەنەکە پێك بێت وەك یەکێك لە هەنگاوە گرنگەکانی بەپارێزگابونی هەڵەبجە.

## لەکۆتایدا

پێویستە حکومەتی هەرێم و دام ودەزگاو لایەنەپەیوەندیدارەکان بەجدی ئاور لەداواو خواستەکانی خەڵکی هەڵەبجە بدەنەوە،چیتر تەنها ساڵانە ئەم شارەیان بیر نەکەوێتەوە بەتایبەت دوای بەپارێزگابونی شارەکە کەبەرپرسیارێتی سەرشانی حکومەت وکاربەدەستانی زیاتر کرد بەوەی زوو ئەم پارێزگا نوێیە پێویستیەکانی دابین بکرێت ولەسنوری بەڵێن و قسە دەربچێت

# سەرکەوتنی یەکجاری



هۆشیار ئەحمەد

بەدەست هێنانی سەرکەوتن نیوەی سەرکەوتنەلە مێژوی نوێ و هاوچەرخدا ئەو جوگرافیایەی کوردی تیانیشتەجێیە هەمیشە مەیدانی شەڕ و ململانێکان بووە لە نێوان هێزە جیاوازە دژبەیەکە فراوان خوازە تەماحکارەکاندا و زۆرجار کوردیش بەخواستی خۆی یان بە ناچاری لایەنێک بوە لە لایەنەکانی شەڕەکان و زۆرجاریش ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی گێڕاوە و قوربانی گەورەشی داوە .

ئازایەتی کورد لە ڕو بەڕوبونەکاندا کەم وێنە بوە ودۆست ودوژمن ناتوانن نکوڵی لێبکەن بەڵام هەر ئازایەتی گرنگ نیە بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن وڕبەڕوبونەوەی کارەسات و ڕوداوەکان بەڵکو چۆنیەتی مامەڵەکردن لە گەڵ قۆناغەکانی دوای سەرکەوتن وپاراستنی دەست کەوتەکان نیوەی دوەمی سەرکەوتنە . زۆر گرنگە بەشێوازی مەیدانی و واقیعی لەگەڵ پێشهاتەکان مامەڵەبکرێتو بەدور بیت لە بیرکردنەوەو بۆچونی عاتفی و خۆشباوەڕی بە وتەو دروشمەکان چونکە بەردەوام کەسانی هەلپەرست و خۆپەرست زۆر بەئاسانی سواری شەپۆلەکانی سەرکەوتن دەبن ئاراستەی کاروانەکە دەگۆڕن و لەو ڕوە وەری دەگێڕن کە بڕیاربوو پیایدابڕوات تادەگاتەجێ هەر ئەوەی لە شۆرشی گەورەی فەرەنسی ڕویدا لەماوەیەکی کەما هەندێک لە سەرکردەکانی ئەو شۆڕشەمەزنە بە پێچەوانەی خواستی خەڵکەوە بوون کە بەخوێنی هەزاران مرۆڤی چەوساوەو ئازا سەرکەوت بەڵام گەلی فەرەنسی لەو سەردەما لێنەگەڕان وڕزی نەبون بەرهەمی شۆڕشەکەیان خەڵکانی هەلپەرست لەباری بەرن توانیان سەرکردە خائینەکانی شۆڕیکەیان دەستگیر بکەن و بەسزای هەڵەوخراپەکاریەکانیان بگەیەنن بەم شێوەیە نیوەی دوەمی شۆڕشەکەیان تەواوکرد بونە خاوەنی شۆڕشێکی سەرکەوتوو وبەناوبانگ لەمێژوی مرۆڤایەتی.کوردیش وەک میللەتێکی چەوساوەو خاک داگیرکراو داوای ساڵانێکی درێژی خەباتکردن و هەڵکەوتنی هەلێکی لەبار لە (٥ ـ ٣ -١٩٩١ ٠ ڕاپەڕینێکی قارەمانانەی ئەنجامدا لەدوای چەند ڕۆژێکی کەم تەواوی باشوری کوردستانی لەدەستی دڕندەترین دەستەڵاتی ئەوکاتەی عیراق ڕزگارکرد بەڵام نەی توانی نیوەی دوەمی ڕاپەڕینەوەکەی بەئەنجام بگەیەنێت کە بریتی بو لە قۆناغی دوای ڕاپەڕین و دەستەڵاتی دایەدەست هەندیکەس و لایەن ئەوانیش لە پاداشتی ئەم گەلەدا کەوتنە تاڵان و روخاندنی ژێر خانی ئابوری و ئاودیوکردنی کەلو پەلە بەنرخەکان و پاشان دروستکردنی شەڕی ناوخۆ ودواتریش پەرەپدانی گەندەڵی و ناعەدالەتی و لەناوبردنی زۆرێک لە شانازی و بەهاکانی کورد.دەبو کوردی باشوری کوردستان لەبەهاری ١٩٩١دازۆر بەجدی چاودێری ئەوکەسانەی بکردایە دەستەڵاتی خۆیان دەچەسپاند بەسەر ناوچەڕزگارکراوەکان ولە دەر کەوتنی یەکەم لادانە یاسای وکۆمەڵایەتیەکاندا ڕێگریان بکردایەو زۆر بەتوندی بیان وەستاندنایە ئیتر کەس جورئەتی ئەوەی نە دەکرد نابەرپرسانە مامەڵەی بکردایە ودەبوینە خاوەنی وڵاتێکی ئاوەدان وپڕ شانازی بەڵام بەداخەوە ئەمە نەکراوبەبڕوای من کورد نەی توانی نیوەی دووەمی سەرکەوتنی ڕاپەڕین بە ئەنجام بگەیەنێت وببێتە خاوەن ڕاپەڕینێکی تەواو سەرکەوتوو .

**ئەوجوگرافیایەی کوردی تێدا نیشتەجێ بوە هەمیشە مەیدانی شەرو ململانێکان بوە**

"



# هەڵەبجە

حسن نازدار

١

هەڵەبجە ناچێت بۆ بەغا
چوون لەهاوینی تەمەنیا
بەگازی ڕەشی کیمیاوی
لەباوەشی سەوزەگیادا
بەبێ کەسی شەهید کرا
بۆ یە بەغدا...
دەبێت بەسەری شۆڕەوە
لەبەردەمی پەیکەرەکەی
عومەر خاوەر کڕنووش ببا
داوای لێبوردنی لێ بکا..

٢

بەیانیەک هێرۆشیماوناکازاکی
بەجلی ڕەشی پرسەوە..
لەهەڵەبجە لەسەر..
گڵکۆی شەهیدەکان ،،
بەڕێزەوە هەردوو وەستان
دەستیان بەسنگەوە گرت و
توند توند هەردوو چاویان نووقاند
فرمێسکی بەخوڕیان داباراند
گوتیان : نەفرەت لەو کەسەبێ
کە ئەم گوڵانەی هەڵوەراند..

بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بەساڵوەگەری
بۆردومانی هەڵەبجە
ژمارە(٢)
سێشەممە٢٦ی٤ی٢٠١٦
خاوەن ئیمتیازوسەرنوسەر
سەلاح سەعید ئەمین


# هەڵەبجە نیوز
Halabja News

# بەغداد قەرەبوبکاتەوە

چل ودوساڵ بەر
لەئێستاحکومەتی بەعس
بەنیەتی شکاندنی ئیرادەی
گەلەکەمان وچۆکدادان
بەشۆرش وبەرخودانی
گەلی کورد بەچەکی
قەدەغەکراوی نێودەوڵەتی
لەهەردوو شاری قەڵادزێ و
هەڵەبجەدا دوو قەسابخانەی
گەورەی خولقاند،پیرومناڵ
وگەنج و ئافرەت وکاسب
و قوتابی زانکۆی
پێکەوە سوتاند،ئاوەدانی
وێرانکردوسیمای ژیانی
شێواند.بەڵام دوای ئەو
هەمو ماوەیە بەغداد
قەرەبوی قوربانیەکانی
نەکردوەتەوە،ئەرکی
کاربەدەستانی هەرێمەلەبەغداد
پێداگری‌لەهەردوو
قەسابخانەکە بکەن
وبەغدادناچاربکەن قەرەبو
بکاتەوە،ئێمە نابێت چاوەرێ
بین کاربەدەستانی بەغداد
ئەوەندە شەریف بن خۆیان
داوای لێبوردن بکەن و
قەرەبومان بۆ بکەنەوە،ئەوە
ئەرکی کاربەدەستانی هەرێمە
ئەم مەسەلەیە بجولێنن وماف
لەبەغدا وەربگرنەوە.


سێگۆشەکەی ناوبازار،بەعس بەناپاڵم وێرانیکرد

## چل ودو ساڵ بەسەر بۆردومانی هەڵەبجەدا تێپەردەبێت

هەڵەبجەنیوز:تایبەت
٢٦ی٤ی٢٠١٦، چل ودو ساڵ تێپەر دەبێت بەسەربۆردومانی هەڵەبجە و قەڵادزێدا لەلایەن فرۆکەکانی رژێمی بەعس بەچەکی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتی،سلوەگەری ئەو کارەساتانەش بێ یادکردنەوەی فەرمی .پێپەردەبن
لە٢٦ی٤ی١٩٧٤دا و پاش نیوەرۆ فرۆکەکانی رژێم بەچەکی ناپالم وشەستیر خەڵکی مەدەنی شارەکەیان کردە ئامانج ولەماوەی نزیك لە نیو کاتژمێردا قەسایخانەیەکیان لەشارەکەدا خولقاندو دەیان شەهید وبریندار و زیانێکی گەورەی مادیشیان بەژێرخانی .ئابوری شارەکە گەیاند
هەروەك خەڵکی شارەکە ئاوارە بون رویان کردە سنورەکانی هەڵەبجەو پاشتر ئاوارەی دیوی ئێران بون وبۆ یەکەم جار لەسەریاس-ی سەربەپاوەی رۆژهەلاتی کوردستان ئۆردوگا بۆئاوارەبوان دروست دەکرێت


عومەری حاجی
عینایەت:
بۆهەڵەبجە
بۆردومانکرا؟
ل...٣

ناوی شەهیدان
و بەرکەوتوانی
بۆردومانەکە
عەبدولقادرشادی
ل....٧


## خەڵکی هەڵەبجە پێشوازی لەو هاوڵاتیانە دەکەن کەبۆ پیشتگیری شۆرش هاتبونە شارەکە

هەڵەبجەنیوز:پێش بۆردومانی هەڵەبجەلە٢٦ی٤ی١٩٧٤ دا هاونیشتیمانیەکی زۆر لەناوچەکانی‌ترەوە رودەکەنە هەڵەبجەو دەروبەری،خەڵکی هەڵەبجەش بەدەمیانەوە دەچن و هاوکاری تەواویان دەکەن.
ئیبراهیم موحەمەدشەریف،خەڵکی هەڵەبجەو شاهیدحاڵی ئەو قۆناغەیە و دەڵێت:ماڵ هەبوە لەهەڵەبجەدا بە١٥ رۆژ خزمەتی‌میوانەکانی کردوە،حەکیم مەلا سالح-یش دەڵێت:خەڵکی هەڵەبجە زۆر بەدەم ئەوخەڵکەوە بون کەهاتبون بۆ هەڵەبجە،حەکیم،کەلەتیمە میللیەکان بوە دەڵێت:خەڵك بەسەرماڵاندا دابەشدەکران،جارێك نەبوە بەماڵێك بڵێین میوانتان هەیە وبڵێن میوان وەرناگرین،ئەگەر ماڵێك میوانی بەرنەکەوتایە گلەیی دەکرد.

## بۆپشتگیری لەشۆرش
## ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان رودەکەنە هەڵەبجەو ناوچە ئازادکراوەکان

هەڵەبجەنیوز:پێش بۆردومانی هەڵەبجە لە٢٦ی٤ی ٢٠١٦دا خەڵکێکی زۆر بۆ پشتگیری لەشۆرش رودەکەنە هەڵەبجەو ناوچە ئازاردکراوەکان،عومەری حاجی عینایەت هەڵەبجەیی کە ئەوکات لەو تیمەمیللیانەدا بەشداربوە وەك ئامادەکارییەك کەبۆ روبەروبونەوەی هەر پێشهاتێك پێکهێنراون،دەڵێت:ئەوەی هۆشیارییەکی نەتەوەیی هەبوێت تەنانەت لەبەغداو ناوچەکانی ترەوە رویکردوەتە ناوچە ئازاکراوەکان بۆ پشتگیری لەشۆرش،لەم چوارچێوەشدا زانکۆی سلێمانی برایە قەڵادزێ و ئامادەییەپیشەییەکانیش برانەهەڵەبجە.



# هەڵەبجە و تاوان وکارەسات

دەلیل جەمال

کارەسات چەمکێکە بۆ دوو مەبەست بەکاردێت،یان دوو رووداوی گەورەیە کەروودەدەن لایەنێکیان سروشتیەو بەکارەساتی سروشتی ناودەبرێت،ئەوی دیکەیان مرۆییە و بەکارەساتی مرۆیی دادەنرێت،هەڵبەتە لەم بابەتەدا لایەنە مرۆییەکەمان مەبەستە وردتر ئاماژەی پێبدەم،مەبەستم ئەو کارەسات وتاوانانەن کەلەمێژوی بەرخودانی شارێکی مەزنی وەك هەڵەبجەدا روویانداوە،بەتایبەت ئەو تاوان و کارەساتانەی کەلەئاستی بەرفراوان و وێرانی وقەتل و عامی مرۆڤدایە،هەمیشە کەباس لەهەڵەبجەدەکرێت راستەوخۆ و ناراستەوخۆ وێنەی کارەسات و تاوانی گەورە دێتە پێش چاو،مێژووی هەڵەبجە لەقۆناغە جیاوازەکاندا دەتوانین وپۆلێنبەندی بکەین و دەبینین قۆناغێك نیە لەم مێژووی ئەم شارەدا تاوانێکی مرۆیی گەورە یان کارەساتێك لەم شارەداو بەرامبەر بەم شارە ئەنجامنەدرابێت،فاکتەری سەرەکی ئەنجامدانی ئەم تاوانانەش بەرامبەر بەخەڵك و شارەکە ئەوەیە،ئەم شارە شارێکی زیندوو بوە لەروی چالاکی رۆشنبیری ومەعریفی وچالاکی سیاسی و بەرخودان وقوربانیدان لەپێناو ئازادی وسەربەستی،لەسەدەی رابردووەوە تا ئەمرۆ مێژویەکی لێوانلێو لەکارەسات وبەرخودان قوربانیدان هەیە.هەر لەسالآنی چلەکانی سەدەی رابردوەوەبەردەوام ئەم شارەئاراستەی چاوی دوژمنان ونەیارانی کوردی لەسەربوە،حکومەت و رژێمەکانی عێراق بەردەوام هەولی دەستەمۆکردن وکپکردنی دەنگی دلێرانەی ئەم شارەیانداوە،هەربۆیە دەبینین بەردەوام تۆپبارانکرداوە،وێرانکراوە،لەشەستەکاندا،لەحەفتاکاندا بۆردومانکراوەو چەندین مرۆڤی بێتاوان بوەتە قوربانی،لەهەشتاکاندا لە١٣ی٥ی١٩٨٧ دوای خۆپیشاندانی جەماوەری هەڵەبجەو نارەزایی بەرامبەر بەراگواستنی زۆرە ملێی گوندەکان بەلآم حکومەتی ئەوکاتی عێراق بەتانك و فرۆکە هەولی کپکردنەوەی راپەرینەکەیدا ودواجارگەرەکێکی وەك (کانی عاشقان)ی وێرانکرد،زۆرێك لەهاولآتی ئەم شارەی زیندەبەچالکرد وئەنفالکران.

### قۆناغێك نیە لەمێژوی ئەم شارەدا تاوانێکی بەرامبەر نەکرابێت

دواتاوان کارەساتی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە لە١٦ی٣ی١٩٨٨دا کەشارەکە بەتەواوی وێران کراو (٥٠٠٠)شەهید وزیاتر لە(١٠٠٠٠) برینداری لەوکارەساتەدا هەیە،لەبەرئەوەی هەڵەبجەشارێکی سەرسنورەو سنوری لەگەل ولاتی ئێران هەیە بەردەوام تۆپبارانکراوەو وەك ناوچەیەکی جەنگی بوە لەشەری ٨ ساڵەی ئێران عێراقدا.هەڵەبجە شارێکی زیندوە و بەردەوام لەخەبات وتێکۆشاندا بوە،بەبواری ئەدەبی و رۆشنبیریدا پێشەنگ بوە،نامەوێت بچمە ناو وردەکارییەکانەوە بەقەد ئەوەی ویستومە بەخێرایی باسێك لەکارەسات وبەرخودانی ئەم شارەبکەم.سال و قۆناغ و سەردەمێك نیە ئەم شارە کارەساتی گەورەیی تێدا روینەدابێت ونەبوبێتە قوربانی دەستی رژێمی داگیرکەر،هەربۆیە بەپێ ی دەقە مێژوییەکان لەچلەکانی سەدەی رابردوەوە تا هەشتاکانی ئەو سەدەیە بەردەوام وێرانکراوەو خەڵك و شارەکە روبەروی کارەسات بوەتەوە.بەداخەوە هێشتا ئاسەواری کارەسات و وێرانی پێوە دیارە،شارێکە جینیۆسایدکراوە بەلآم هێشتا لەم شارەدا رۆژانە هاولآتیان رەبەروی مەرگ دەبنەوە ودەبنە قوربانی،هێشتا قەرەبوی مادی ومەعنەوی ئەم شارە نەکراوەتەوە،بەجۆرێك کارەساتەکانی ئەم شارە کارەساتێکن بەرامبەر بەمرۆڤایەتی کراون،بەلآم هێشتا ئەم شارە ناراستەوخۆ لەناو تاوان و کارەساتەکانا ژیان دەکات.

- رۆشنبیر



# بیرەوەریم لەکارەساتی(حەفتاوچوار)دا

ئەحمەد رەنجبار

هەرکاتێك بمانەوێت بگەرێینەوە بۆ رابردو ئەوا دەبێت تەرکیزمان بەوردی بخەینەوە سەر ئەو روداوانەی کەرویانداوە،بۆ ئەوەی کەڵکی پێویستیان لێوەربگرین بۆخۆمان و بۆ ئەو نەوەیەی کەدەیانەوێت بپزانن ولێ ی شارەزابن.کارەساتی بۆردومانکردنی هەڵەبجە لە ٢٦ی٤ی١٩٧٤دایەکێك لەو کارەساتە گەورانەی بەسەرئەم شارەداهاتوە وخەڵکی توشی قوربانیدان ودەردیسەری بون.رژێمی بەعس دەیەویست بگەرێتەوە بۆ ناوچە ئازادکراوەکان،هەڵەبجەو قەلآدزێ دووشاری سەرسنوربون،هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەم دوشارەدا بارەگایان هەبو،کاروباری ئیداری و حوکمرانیان دەبرد بەرێوە،لەشاری قەلآدزێ زانکۆی سلێمانی وانەی تێدا دەخوێنرا،ئەمە بەلای رژێمەوە سەخت بوهەربۆیە هەردوو شارەکەی بۆردومانکرد.خەڵك ئاوارەبون،ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێهێشت،هێزی پێشمەرگە لەشاردا مابونەوە ،هەمو ئەو ماوەیەی کەشار چۆل بو،موڵك و ماڵی هاولآتیانی لێبو،تا گەرانەوەی خەلکەککە لەئاوارەی ،هێزەکانی پێشمەرگە چاودێری موڵك و ماڵی خەلکیان کردبو،کەس دەست بۆ ماڵەکەی نەبرابو،خەڵك کەگەرانەوە بەمە زۆر دلخۆشبون.ئەمە سەربەرزی بو بۆ هێزی پێشمەرگە کەلەو رۆژەدا وەك داستان باسدەکرا.

### سوپای عێراق تۆڵەی بەزینی خۆی لەهاولآتیانی مەدەنی ئەکردەوە

کاتێك کەسوپای عێراق هاتەوە بۆ هەڵەبجە،لەبەردەم پەیکەری عومەری خاوەر کە ئەوکات (محولە) یەکی کارەبایی لێبو،بەشێکی زۆری شاری کارەبا دەدا،(دەبابە)یەکی رژێم کەلەبەری جەنگدا لەبەردەم پێشمەرگەدا بەزیبون بەئەنقەست خۆیدا لەو (محولە)کارەبایەو بەشێکی زۆری شاری بێ کارەباکرد.هەروەها لەناوبازار ولەچوار رپانەکەی ئێستادادەبابەیەك خۆی وەرچەرخاند و مێرمنالێکی بە موحەجەرەی شۆستەکەوە پلیشاند.لەسەروتریشەوە دەبابەیەك گوللەتۆپێکی تەقاند و دای لەقاتی سەرەوەی بالەخانەی ئێستای وێنەگر زانیار.ئەمانە هەموی بۆ چاوترساندنی خەڵك بو تاکار گەیشتە کیمیابارانی ١٩٨٨ وهەر ئەو کارەساتەش بوە هۆی لەناوچونی ئەوان. بەلآم تێبینی لێرەدا ئەوەیە حکومەت وەك پێویست گرنگی نادات بەبۆردومانی حەفتاوچوار،دەتوانین بلێین هەرلەهەوالەکانەوە بایەخی پێدەدەن.تۆبلێیی ناوچەکانیان بەسەر کارەساتەکاندا دابەشکردبێت هەڵەبجە کیمیاباران و قەلآدزێ و بۆردومان وگەرمیانیش ئەنفال،شوێنی زیاد لەکارەساتێکی روبەرو بوەتەوە ناکرێت خاوەنی یەك کارەسات بێت

- نوسەر ورۆشنبیر.

# بۆچی هەڵەبجە و قەڵادزێ بۆردومانکران؟



عومەری حاجی عینایەت هەڵەبجەیی

١١ی ئاداری ١٩٧٤ کۆتایی ئەو رۆژەبو کەچوار سال دیاریکرابو بەیاننامەی ١١ی ئادار بچێتەبورای جێ بەجێکردنەوە ،سەرکردایەتی ئەوکاتەی حزبی بەعس بەسەرۆکایەتی(ئەحمەد حەسەن بەکر) دەیانویست بەویستی خۆیان جۆرێك لەئۆتۆنۆمی کارتۆنی بدەن بەکورد،سەرکردایەتی ئەو کاتەی شۆرشیش بەسەرۆکایەتی مەلامستەفای بارزان دەیویست ئۆتۆنۆمی راستەقینە بۆ کورد وەربگرن،لەم نێوانەدا حزبی بەعس تاك لایەنە بەیاننامەیەکی دەرکردبەپێچەوانەی ئەوەی کورد چاوەروانی ئەکرد لە١١ی ئاداری ١٩٧٤دا،پاشان خەلك رویانکردە ناوچە ئازادکراوەکان،لەکەرکوك و خانەقین وبەغداد و لەهەرشوێنێك کوردی تێدا بوبێت وهۆشیاری نەتەوەیی تێدا بوبێت روویکردوەتە ناوچە ئازادکراوەکان،لەگەل ئەوەشدا شوێنێك هەبو کەزۆر ستراتیژی کە ئەویش زانکۆی سلێمانی بو،قوتابی خوێندکارەکانی کەخۆم یەکێك بوم لەوانە وازمان هێناو روومانکردە ناوچە ئازادکراوەکان،شۆرش بەیاننامەیەکی دەرکردو داوایکرد ئەو کەسانەی لەزانکۆی سلێمانین پەیوەندی بکەن بەقەلادزێ-ەوە و زانکۆی سلێمانی برایە ئەوێ، ئامادەییە پیشەسازی و بارزگانی و کشتوکالیەکانیش روو بکەنە هەلەبجە،ئەم بەیانە کەبەرادیۆ راگەیەنرا حکومەت قۆستیەوەو کەزانی خەلکێکی زۆر لەم دووشارە کۆئەبێتەوە،رۆژی ٢٤ی ٤ بۆردومانیقەلادزی ی کردو شەهید و برینداریێکی زۆری لێکەوتەوە ،یەك لەوانە هاورێیەکی ئێمە بو،ناوی (ئازاد کەریم) بو گۆرانی بێژ بو،ئێمە قەلادزێ-مان رۆژی ٢٤ی ٤ بەجێهێشت و٢٥ی ٤ گەشتینەوە هەلەبجە.. خەڵکێکی زۆر لەهەلەبجەو قەلادزێ کۆبونەوە چونکە دوو شاری گەورەبون لەو کاتەدا،ئەمە هۆکاری ئەوەبو کەهەلەبجەو قەلادزێ کرایە ئامانج

## راستەلە١٨٨دا هەڵەبجەجینیۆسایدکرا بەڵام ئەمەناکاتەئەوەی تاوانەکانی ترلەبیربکرێن

لەهەڵەبجە "تیمی فریاگوزاری میللی"دروستکران،پارچە پەرۆیەکی زەرد بەبالمانەوە بو،چال هەلئەکەنرابیرمە بەرپرسەکانی مامۆستا قالەی رەش بو لەگەل عەبدورەحمانی برای ومامۆستایەکی تر بەداخەوە ناویم نایەتەبیر،ئەوانە سەرپەرشتی ئێمەیان ئەکرد چۆن بەدەم خەلك و بریندارەکانەوە بین،ئەو سەردەمە نەخۆشخانەی هەلەبجە لەدوکانی حاجی خرە بو لەنزیك مزگەوتی دار ئیحسان،من بیرم بێت دکتۆر حسێن ودکتۆر شیرین ودکتۆر سەردار موحمەد باقی لەهەلەبجە بون تیماری بریندارەکانیان ئەکرد،شەهیدەکانیش ئەبران بۆ مزگەوتەکان. ئەنجام ٥٦ شەهید و٢٠٠ بریندار وئاوارەبونی خەلکەکەی،راستە هەلەبجە لە١٩٨٨ دا تاوانێکی هێندە گەورەی بەرامبەر کرا بەلام ئەمە ناکاتە ئەوەی تاوانەکانی ١٩٧٤ و١٩٨٧ لەبیر بکرێن،پێویستە نوێنەرانی ئەم شارەیەخەی دەسەلاتدارانی هەرێم بگرن پێیان بلێن:ئێوە بەرپرسن بەرامبەر قەرەبوکردنەوەی ئەوانەی شەهید و برینداربون یان زیانیان لێکەوتوە لەهەلەبجەو لەقەلادزێش.

- ئەندامی پەرلەمانی کوردستان

موحەمەد داریانی:

# من عەدەد دۆشکا بوم



موحەمەد ئەحمەد موحەمەد ناسراو بە موحەمەد داریانی لەسەروەختی بۆردومانەکەی هەلەبجەدا عەدەد دۆشکابوە،داریانی ئەلێت:دۆشکاکە ١٢ ملم بو،گالیبەریان پێئەوت روسیشی بو. موحەمەد داریانی باس لە ژیانی پێشمەرگایەتی خۆی ئەکات:جار هەبوە بەیەك سال مالی خۆم نەبینیوە،مالم لە شیراز بوە،کەشۆرشی گەلانی ئێران-یش رویدا مالمان هاتە مەریوان و بۆ مامۆەی ٩ مانگ مالی خۆمم نەبینی. داریانی،رۆژی ٢٦ی٤ی١٩٧٤ کە بۆردومانەکەی هەلەبجە هەیە،عەدەد دۆشکابوە،ئەلێت:رۆژێك پێش بۆردومانەکە لە ملەسور بوین لەسەدەکەی دەربەندیخان،کە بۆردومانی قەلادزێ کرا یەکسەر دوو رۆژ دوای ئەوە هاتین بۆ هەلەبجە،دۆشکەکەمان بە ولاخ هێنا،بەرۆژ کردمانە ئەم بەری سیروان ودواتر بەشەو هێنامان. موحەمەد داریانی ،ئەلێت دۆشکاکە رۆلێکی زۆر باشی بینیوە رۆژی بۆردومانەکە:ئەگەر ئەو دۆشکا نەبوایەنیوەی هەلەبجە وێران ئەکرا،خەلك ئەیزانی دەروبەری دۆشکاکە مەترسی نیە هانایان بۆ ئەو ناوە هێنا بو،دۆشکاکەیش ١٢ ملم بو ،روسی بو،پێیان ئەوت گالیبەر،فرۆکەکانیش هەر روسی بون لەجۆری سیخۆی ١٦ .فرۆکەکان ٤ دانەبون دوانیان بەگرییان ئەکرد و دوانیشیان بۆردومانەکەیان ئەکرد. داریانی ئەلێت:دۆشکاکە لەخواری ئینحیسارەکەوە بو،کاتێك کەفرۆکەکانیش لەتریفەوە خۆیانکرد بەشاردا ئینحیسارەکە نەیهێلا دەرکەون،بەناپالم وشەستیر بۆردومانیانکرد. تافرۆکەکان رۆشتن ئێمە بەرگریمان کرد،بۆمن ئەو رۆژە بیرەوەرییەکی زۆر ناخۆشە،خەلکم ئەبینی چۆن هەولی خۆشاردنەوەیان دەدا ،زۆر ناخۆشبو،داریانی ئاماژە بەوەشدەدات:ئەو نەیبیستوە پێشتر ناپالم بەکارهاتبێت لەهەلەبجەوقەلادزی نەبێت.



# رۆژێک کەهەرگیز بیرم ناچێت

## تەها مەحمود هەڵەبجەیی

پێش ٤٢ ساڵ بەر لەئێستا کەلاپەرەیەکی خوێناویە ورۆژێکی ناخۆشە لەتەمەنی منالی من لەهەڵەبجەی هەردەم بەشمەینەتدا،بەروار٢٥ی چواری ١٩٧٤خەڵکێکی زۆر لەهەمو شاروشارۆچکەکانی تری ژێر دەسەلاتی بەعسەوە هەڵهاتبون و رویانکردبوە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی شۆرش،ئیدارەی شۆرشیش بەشێوەیەکی باش بەو خەڵکەو بەشاری هەڵەبجەدابو بۆ ئەوەی قەرەباڵخی دروست نەبێت وچەند تیمێکی بەرگری میللی-یان دروستکردبو بۆ ئامادەکردنی ژێر زەمینەکان وهەڵکەندنی چاڵ لە شێوەی چەند پیتێکی ئینگلیزی بەمەبەستی پاراستنی خەڵك لەهێرشی درندانەی بەعسیەکان کەبۆ سەرکوتکردنی شۆرشی کوردهەمو جۆرە هەولێکیانداوە،کاتژمێر ١٠:٣٠ سەرلەبەیانی ٢٥ی٤ی١٩٧٤ فرۆکەکانی عێراق بەسەرئاسمانی هەڵەبجەدا سورانەوە،زۆری پێ نەچو دەنگی فرۆکەکان نەمان بەلام لەبەر ئەوەی کەلەبەرواری ٢٤ی ٤ی ١٩٧٤دا بۆردومانی شاری قەلادزێ-یانکردبو خەڵکی شاری هەڵەبجە زۆر ترسیان لێ نیشت بو لەهەمانکاتدا تیمەکانی بەرگری میللی بەبلندگۆ خەڵکی هەڵەبجەو شارەکانی تر کەهاتبونە هەڵەبجەئاگادار ئەکردەوە کەلەزوترین کاتدا ناوشاری هەڵەبجە چۆڵ بکەن وئاگادارکرانەوە کەخۆیان ئامادە بکەن و لەکاتی هاتنی فرۆکەکاندا پارێزگاری لەخۆیان و ماڵ و منالیان بکەن،ئەو رۆژەمان بەترس ودلەراوکێ بەسەربردو بەیانی ٢٦ی ٤ی ١٩٧٤ کەچەند دوکانێك کراوەبون بۆ پرکردنەوەی پێداویستیە سەرەتاییەکانی رۆژانەمان،خەڵك زۆر ترسیان لێ نیشتبو،رۆژی هەینیە بەبەردەوامی لەبلنگۆی مزگەوت و ئەو ئۆتۆمبێلانەی کەتایبەت بو بەهێزی پێشمەرگەو تیمەکانی بەرگری میللی کەهەریەکەیان پارچەیەك قوماشی زەردی زەردیان لەبالیان بەستبو دانیشتوانی هەڵەبجەو ئەو خەڵکانەی بۆ پیشتیوانی شۆرش هاتبونە هەڵەبجە ئاگادار ئەکردەوە کەلەگۆرەپان وسەرشەقامەکان کۆنەبنەوە بەڵکو شار چۆڵ بکەن و برۆنە دەرەوەی شار چونکە لە٢٤ی ٤ دا بۆردومانی قەلادزێ کرابوبەچەکی ناپالم و زیاتر نزیکەی ٣٥٠ کەس شەهید بوبون وسەدانی تریش برینداربوبون،کات بەرەو نیوەرۆ دەروات،نوێژی نیوەرۆ کراو بو بەپاش نیوەرۆ و بەرەو عەسر ئەرۆین من یارمەتی ئامۆزایەکم ئەدا کەدوکانی جگەرخانەی هەبو،زیاتریش پارەی عێراقی و ئێرانی خەرج ئەکرا،خاوەنی دوکانەکە ئامۆزای خۆم بو سەد تمەنیەکی دا بەدەستمەوە کەبرۆم بۆی ورد بکەمەوەبەلام زۆربەی دوکانەکان داخرابون،لەشەقامی گشتی هەڵەبجە بەرەو بازار بومەوە گەشتمە دوکانی حاجی عەبدورەحمان کەبە ئەورەحمانە فێلە ناسراو بو،شاگردێکی هەبو بەناوی سۆفی عومەر پێموت کە سەد تمەنیەکەم بۆ ورد بکاتەوە زۆر بەشێوەیەکی نەشیاو لێم تورەبو منیش ویستم بگەرێمەوە بۆ شوێنەکەی خۆم لەکاتی هاتنەدەرەوەم بۆ دواجارباوکی ئازیزم مەحمود عەزیز سەعید ناسراو بەوەستا مەحمودی خەیاتم بینی وەك ئەوەی چاوەرێ ی دواچرکە ساتی ژیانی بێت سەیرێکی کردم وەك ئەوەی پێم بلێ ئەم ناوە ترسی لێ نیشتوەو لێرە مەوەستە وبرۆ هەر بەنیگای چاوەکانی دوا مالئاوایی لێکردم،ئەوکاتەش کەبینیم لەمزگەوتەوە گەرابوەوە بۆ دوکانەکەی خۆی میلی کاتژمێر چوبوەسەر ٤:٢٠ ی عەسر من شوێنەکەم بەجێهێشت و دە دوکانێك بەرەو خوار بومەوەبەمەبەستی گەرانەوە بۆ ئەو دوکانەی کەلێ ی هاتبوم لەکاتژمێر ٤:٢٤ ی عەسردا فرۆکەکانی بەعسی فاشیست وخوێنرێژ هاتنە سەرئاسمانی شارەکەم ودەستیانکرد بەبۆردومانکردنی خەڵکی بێ دیفاعی شار،خۆم فرۆکەکانم ئەبینی بەدەم راکردنەوە خۆم گەیاندە ئەو دوکانەی لێ ی هاتبوم،دەنگی فرۆکەو ناپالم ودارمانی دوکان وخانوەکانی هەڵەبجە تێکەل بەیەکتر بوبون،منیش لەژێر مێزی ناودوکانەکە خۆم حەشاردابو لەهەمانکاتدا و لەبەهێزی بۆردومانەکەوە دەرابەی دوکانەکە کەوتە خوارەوەو دای بەسەر ئەو مێزەدا کەخۆم لەژێریدا حەشاردابو،لەماوەی چەند خولەکێکی کەمدا تۆزێك بێدەنگی شاری داپۆشی و لەژێر مێزەکە هاتمەدەرەوە،یەکەم کەس کەرۆشتمە سەری هاورێیەکی خۆم بو بەناوی( عەبدوللەتیف حاجی حەمە سالحی دەلاك)،بەداخەوە کەپارچەی ناپالم بەرپشتی کەوتبو گیانی ئەداو هەر لەشوێنی خۆی شەهید بو،

# باوکێك شەهیدبونی کورەکەی بەددانەکانیدا ناسییەوە

لەوێشەوە بەراکردن بەرەو ماڵی خۆمان رۆشتم بۆ ئەوەی هەوالی باوك و براو خوشکەکانم بزانم ،کاتێك گەیشتمە مالەوە هەمو دەرگاو پەنجەرەی ماڵەکەمان لەسەر پشتەو زۆری دیوارەکان درزیان تێکەوتوەو بەلام بانگیان ئەکەم و کەس وەلامم ناداتەوەبەزووی لەمال دەرچوم رۆشتمە مالی دراوسێیەکمان،تەماشا ئەکەم زۆربەی ژن وپیاو کور وکچی کۆلانەکە لەحەمامی مالە دراوسێکەمان خۆیان حەشارداوە،خوشکێکم هاواری لێکردم کەمنیش برۆمە لای ئەوان بەلام جێم بەخۆم نەگرت وهەولم ئەدا هەوالێکی باوکم بزانم بەراکردن خۆم گەیاندە مزگەوتی گەورەی هەڵەبجە کەزۆر لەمالەکەمانەوە نزیك بو بەلام نەمبینی دیسانەوە بەرەو دوکانی باوکم کەلەدوکانەکانی مەحمود بەگی ئەورەحمانە فەنی دوکانێکی هەبو،ئیشی خەیاتی تیا ئەکرد لەکاتێکدا کەگەیشتم ئەوەی من بینیم هیچ کەس نەیبینێ بەدەیان لاشە لە سێ ریانی لای دوکانی حاجی عەبدورەحمان لەسەرشەقامەکە کەوتبون لەئەنجامی تەقینەوەی ناپالمێك کەلەناوەراستی گۆرەپانەکەی دابو کەبوە هۆی سوتان و وێرانکردنی دوکانەکانی دەوروبەری بەقولی سێ مەتر ناوەراستی سێ ریانەکەی کردبو بەگۆمێکی گەورە ،پر بوبو لەئاو،رێکەوتی بۆری ئاوی سەرشەقامەکەی کردبو،بۆرییەکە چالەکەی پر کردبو لەئاو.یەکێکی تر لە شەهیدەکان کەبەددانێکیدا ناسرایەوە،بەشێوەیەك سوتابو نەئەناسرایەوە،خەڵکی خانەقین بو،باوکی تا مزگەوت رۆشتبو ئەم کورەی چاوەروانی کردبو تاباوکی لەمزگەوت گەرایەوە ئەم بەو جۆرە شەهید بو،باوکی بەددانیا ناسیەوە کە کورەکەی ئەوە.زۆر لاشەی تر کەوتبون لەلایەن خەڵکی شارەوەئەبرانە مزگەوتەکان،منیش لاشە بەلاشە ئەگەرێم بۆ باوکم ئەڵێم بەڵکو سۆراغێکی بکەم زۆر گەرام نەمدۆزیەوە،کات ئێوارەیە ومن هەر ئەگەرێم وهەوالئەپرسم،لەم گەرانەمدا گوێم لێ بو وتیان چوار جەنازە براوە بۆ مزگەوتەکەی ناحیەی سیروان،شەوهات وملی رێگام گرت بەرەو سیروان بەپێ،هەتا من گەشتم لەگۆرستانی سیروان بەخاکیان سپاردبون،سەیری جلەکانیانم کرد جلی باوکی منی تێدا نەبو،کات ١٠:٠٠ شەو بەرەو هەڵەبجە گەرامەوە لەنیوەی رێگا گەیشتم بە برایەکم دوو خوشکم کەهاتبون بەدوای مندا،لەگەڵیان گەرامەوە بۆ مالەکەم لەهەڵەبجە،هەرچۆن بێت ئەو شەوەمان بەبێ باوکم بەسەربرد،رۆژ بویەوە،تاك تاك خەڵك لەناوشار ئەبینرا،ئێمەش هەرلەچاوەروانیدا بوین بۆ ئەوەی هەوالێکی باوکم بزانین،خەڵك دلنەواییان ئەکردین،یەکێك لەوانە کاك عەبدولای سەعەی جەواهێر بو وتی باوکتان زامدارەو ناردومانە بۆ شارۆچکەی تەوێڵەو و لەوێشەوە نێردراوە بۆ ئێران،هەرچۆن بێت کەمێك سەبوریمان بۆ هات وهەندێ کەلوپەلمان پێچایەوەو رۆشتین بۆ گوندی چاوگی باوەکۆچەك بۆ خۆلادان و خۆئامادەکردن کەبرۆین بەدوای باوکماندا،کات ئێوارەیە و دانیشتبوین بۆ نان خواردن گوێم لێ بو یەکێك هەوالی مالی ئێمەی ئەپرسی،راپەریم لەشوێنی خۆمداو لەبەرخۆمەوە وتم باوکم دۆزراوەتەوە،ئەو کەسەی کەهەوالی ئێمەی پرسی وئێستا کۆچی دواییکردوەکاك عوسمانی سەعەی بەیج بو کەهەر خزمی خۆمان بو،هاتە لامانەوەو وتی نانەکەتان بخۆن و بابرۆین بۆ هەڵەبجە گوایە خوشکێکمان لەبەغداوە هاتوەو داوامان ئەکات،من خۆم پێنەگیرا بەرەو هەڵەبجە بەراکردن کەوتمە رێ لەباوەکۆچەك دەرچوم و لەگۆرستانی گولان نزیك بومەوە،سەیرمکرد خەڵکێکی زۆری لێیە،کەچومە پێشەوە جەنازەیەکی لێبو ،وتیان ئەوە باوکتەو بوە بەژێر دوکانەکانی حاجی عەبدورەحمانەوە ،ئەو جێگایەی کەمن بەچەند چرکەیەك پێش شەهید بونی باوکم لەوێ بوم،لەم کاتەدا براو خوشکەکانیشم گەیشتن وداوامان لەخەڵکەکەکرد گۆرستانی ئێمە لێرەنیە و بەپێی وەسیەتی خۆی تەرمەکەمان برد بۆ گولانی گەورەو لەپال گۆری دایکم بەخاکمان سپارد. ئەوەی من دەیگێرمەوە دەگەرێتەوە بۆ ٤٢ سال بەر لەئێستا و مشتێکە لەنمونەی خەرواری لەمال وێرانی و نەهامەتی کەبەسەر ئێمەی خەڵکی هەڵەبجەدا هاتوە،هەزاران سلاو لەگیانی پاکی سەرجەم شەهیدانی کوردستان و بەتایبەت شەهیدانی شارەشەهیدەکەم وئەو شەهیدانەی رۆژی هەینی ٢٦ی٤ی١٩٧٤ بەبێ تاوان بەدەستی بەعسیەکان شەهید کران.

- کوری وەستا مەحمودی خەیات یەکێك لەشەهیدەکانی بۆردومانەکە.



## خالید رەشید ساڵح:

# لەبۆردومانی ٧٤ دا خێزانم دوو منالم شەهید بون لەکیمیاباڕانی ٨٨ یشدا خێزانم و سێ منالم شەهید بون

لەبۆردومانی٢٦ی٤ی١٩٧٤دا ژنەکەم و دوو منالم شەهید بون،خێزانەکەم ناوی(حەمیدە)بو کچەکانیشم(شیرین،دوو سال) و(بەناز، یەك سال) کورێکمان لەبۆردومانەکەی ٧٤ دا ماوەتەوەو لەژێرخانەکەدا دەرمانهێنا،دوای بۆردومانی قەلادزێ،٢٥ی ٤ دوو فرۆکە هاتن کەشفی هەلەبجەیانکردو رۆشتنەوە،(عیزەتی سەید مەحمود)لەمزگەوت جاریدا وتی:خەلکی هەلەبجە بلاوە بکەن داوێتی لەقەلادزێ نەك لەئێرەش بدات،ئەوەبو لە٢٦ی ٤ دا دوای نوێژی عەسر دوو فرۆکە هات لەتەلقیحەکەوە لێیدا تاناوبازار وبەردەرکی بەلەدێ،یەکەمجار ناپالمەکە دابوی لەمالی ئێمە کەوتبوە ناوبیرەکە،منالەکان بوبون بەژێرەوە مالی کاك قادرو کاك حەسەن-یش لەگەل ئێمە لەو حەوشەدا بون،مالی کاك قادر و کاك حەسەن یەکی دوو منالیان تیاچو،قادر-ێکی تر هەبو خەلکی سلێمانی بو خۆی دوو منالی تیاچون وتەنها ژنەکەی مایەوە.

# لەکاتی لابردنی داروپەردوی خانوە روخاوەکەدا (روناك) خوا عەفویکات،زەنگنێك کێشای بەسەریدا، ووتی: من ماوم دەرمبهێنن

دوای ئەوە لەبازارەوە بەرەو مال ئەچوینەوە سەیرمانکرد خانوەکە تەخت بوە بەسەر منالەکاندا،پێشمەرگە هات خۆل و شتەکەی لاداو ژنەکەی حەسەن مابو زەنگنێك چو بەسەری(رووناك)دا خوا لێ ی خۆش بێت،وتی :من ماوم،دەرم بهێنن،خێزانەکەی من منالێکی بچوك لەباوەشیدا بو شیری ئەخوارد،ئەویتریشیان لەپالیدا مرد بو(ئومێد)یشمان دەرهێنا منال بو،یەکسەر بردمان بۆ نەخۆشخانە لەکانی قولکە لەرێگا رشایەوەو دەرزیەکمان لێدا و هێنامانەوە بۆمال.خەلك لەهەمو شوێنێکەوە هاتبو بۆ هەلەبجە،شار زۆر قەرەبالغ بوبو،لەحەوشەکەی ئێمەدا ٨ کەس شەهید بون،ئێمە هەرشەهیدانەمان هەیە لای حکومەتی هەرێم و بەغدا هیچی بۆ نەکردوین،من لە١٦ی ٣ی ١٩٨٨ یشدا خێزانەکەم سێ منالمان شەهید بون،لە٧٤ کورێك و لە٨٨ کچێکم بۆ ماوەتەوە.



## فەرەج حاجی حەمەساڵح

## (فەرەج کوردستانی):

# ئێمە گەشتینەسەری و( عەبدول)ی برام شەهید بو

رۆژی بۆردومانەکە من ٨ بۆ ٩ سالان ئەبو،لەبەر ئەوەی ژێرزەمینمان هەبو،ئەوکات هێزی پێشمەرگە هەمو خەلکی ئاگادار کردبو،ئەوانەی کە ژێر زەمینیان هەیەدەرگای ژێر زەمینەکان بکەنەوە و والای بکەن چونکە حکومەتی بەعس بەنیازی ئەوەبو بۆردومانی هەلەبجە بکات،بێگومان دوو رۆژ پێشتر بۆردومانی قەلادزێ ی کردبو،کاتێك بۆردومان دەستی پێکرد رامانکردە ژێر زەمینەکە،خەلك و دەرودراوسێ هاتنە ژێر زەمینەکەو زۆر قەرەبالغ بو،تەپوتۆز شوشەی شکاو هاتە خوارەوە،ئەوەندەی پێنەچو کاك (مەعروف)ی برام هاتەوە بۆمال وتی دایکە وەرە دەرەوە عەبدول بریندارە،بەحوکمی ئەوەی منال بوم بەشوێن دایکما رۆشتم بۆ لای عەبدول،(عەبدول)بەرەحمەت بێت ئەوکات لای مزگەوتی دارئیحسان ژێر زەمینێکی لێبو،دوو پزیشکی لێ بو چارسەری بریندارەکانیان ئەکرد،لەوێبو،کاتێك چوینە سەری ئەوەندەی پێنەچو گیانی دەرچو و شەهید بو،سەیری برینەکانیمان کرد(عەمودی فەقەر)ی پێکرابو،قاچی چەپیشی زۆر بەخراپی پێکرابو

پورزایەکم،خۆیکرد بەمالی ئێمەدا منالێکی مەلۆتکەی پێبو ،هاواری لەدایکم کرد وتی با ئەو منالە بشۆین،لەژێر داروپەردوی مالی حاجی فەتحولا دەریانهێنا بو منالی کاك تۆفیقی حاجی فەتحولا بو،بەناوی( ئاواز) تازە لەدایك بوبو،دایکم شۆردی وپاکیکردەوە،سوپاس بۆ خوا ئێستا ماوەو و شویکردوەو لەهەندەرانە.

عەبدولی برام لای سۆفی ئەورەحماندا دوکانی هەبو،هەلبەتە لەکاتی بۆردومانەکەدا لەدوکانەکەی خۆیدا نەبوبو،ئەگینا جەنازەکەیشمان نەئەدۆزییەوە،چونکە ناپالمێك دابوی لەدوکانەکەی،بەلکو لەچایخانەکەی(عەلەی تەبەی کەبابچی)بو برای (عەبەی تەبە)کە ئەوکات چایخانەی هەبو،لەگەل برایەکی زاوایەکماندا کەئەویش سەری بریندار بو برای(مەلا موحەمەدی حەداد)بو بەبرینداری برا بۆ پاوەو سوپاس بۆ خوا چاك بوەوەو دواتر لەهەشتاکاندا بەروداوی ئۆتۆمبێك وەفاتیکرد،خوا لێ ی خۆش بێت.

ئەوەی من بیرم بێت مالی حاجی فەتحولا نزیك شارەوانی ئێستا تەخت بو،دەروێش حەمەشەریف کەئەسپ و عەرەبانی پێ بو لەویا شەهید بو،ئەسپ و عەرەبانەکەشی هاتە خورەوەو من بینیم لەنزیك وێنەگر زانیار ئەسپەکەی مرداربوەوە و کەوت.

پێش ئەوەی هەوالی کاك عەبدولی برام بگات،پورزایەکم هەبو بەناوی کاك(جمال جلال) لەکیمیابارانەکەدا شەهیدبو،خۆیکرد بەمالی ئێمەدا منالێکی مەلۆتکەی پێبو ،هاواری لەدایکم کرد وتی با ئەو منالە بشۆین،لەژێر داروپەردوی مالی حاجی فەتحولا دەریانهێنا بو منالی کاك تۆفیقی حاجی فەتحولا بو،بەناوی( ئاواز) تازە لەدایك بوبو،دایکم شۆردی وپاکیکردەوە،سوپاس بۆ خوا ئێستا ماوەو و شویکردوەو لەهەندەرانە.







ئیبراهیم موحەممەد شەریف:

# ئەم کارەساتانە بخرێنە پرۆگرامەکانی خوێندنەوە

٢٤ی٤ رۆژی بۆردومانی قەڵادزێ و زانکۆی سلێمانی بولەقەڵادزێ،بەفەرمانی شۆرش زانۆکی سلێمانی برایە قەڵادزێ،بەعس بۆ لاوازکردنی شۆرش ومیلەت بەگشتی بۆردومانەکەیکرد،رادیۆی شۆرش ئەوکات ئیعلانیکرد خەڵك لەئامادە باشیدا بێت،خەڵك لەخانەقین وکفری و کەرکوك تەنانەت دیالەو بەغدادیشەوە هاتبون،لەبێستان سور لەم لاوە لەژێر دەستی شۆرشدا بو،هەڵەبجە ئوتێلی لێ نەبو،جەماوەرێکی زۆر هاتبونە هەڵەبجە بەسەر ماڵاندا دابەش ئەکران،لەرێ ی مزگەوتەکانەوە یان لەرێ ی رێکخراوەکانەوە،من ئەتوانم شاهیدی بدەم ماڵ هەبوە ١٥ شەو خەڵکی گرتوەتە خۆی،ئەسڵەن خانودان بەکرێ لەهەڵەبجەدا عەیبە بوە،ئەمە میوان پەزێری هەڵەبجەی ناوئەنێت،جوانی هەڵەبجەی ناوئەنێت کەیفی خۆتە. لە٢٥ی٤ دا چاڵ هەڵکەنرابو،رادیۆش ئاگاداریکرد،کاتژمێر ١١ی بەیانی بو دوو فرۆکە هاتن بۆ کەشف،ئیتر خەڵك ترساودەرچون بۆ دەرەوەی شار بۆ عەبابەیلێ وناوچەی تەورۆڵی و هەورامان،ئەوکاتە لادێکان ئاوەدان بون،ئەگەر خەڵك دەرنەچوایە زیانەکان زیاتر ئەبون.٢٦ی ٤ من خۆم لەنزیك مزگەوتی بوخاری بوم لەسەر رێگەی بامۆك بەدیوی کولەبۆزدا،فرۆکەکان لەرۆژئاوای هەڵەبجەوە هاتن،چوینە ئەو چاڵانەوە کە هەڵکەنرابون،یەکەم بۆردومان لای ماڵی حاجی فەتحولا بو(بەرەحمەت بێت)(نزیك شارەوانی ئێستا)خێزانی کاك فەتحولا شەهید بو لەگەڵ دوو کوری کاك عەلی سمایلە فەنی،دوای ئەوە بە شەست تیر بۆردومانی نقلیاتی ئێستای سلێمانی کرد،کوشتارێکی زۆری کردبو لاشە بەملاوئەولادا کەوتبو.ناوبازاری هەڵەبجە شتی جوانی لێ بو،ئەوەی من بیرم بێت دوکانی حاجی ئەورەحمانە (بەرەحمەت بێت)دوکانێکی جوان بو،دوکانی شیرینی بو،حاجی ئەورەحمان پیاوێکی دینداری بالا بەرز بو،دوکانەکەی وێران بو،من هەرگیز بیرم ناچێت لەدوکانەکەی شتم وەرگرتبوو،کەسابەتم ئەکرد،مەسکەت و لوقم وکونجی ئەم شتانەی هەمو دروست ئەکرد،دوکانەکەی دوو قات بو،قاتی سەرەوەی خۆی ئیشی تیا ئەکرد وهەندێك دەزگای ئیشکردنەکەی تیابو لەگەڵ هەندێ سینی.کەمن بینیم تاسام. هەڵوەشانەوەی رێکەوتنامەی١١ی ئادار لەلایەن بەعسەوە بو،کورد پابەندی باشی بەرێکەوتنامەکەوە هەبو،ئیدارەیەکی والەناوشاردا نەمابو،حاکمی شۆرش لەتەویڵەبو،سجن لەتەوێڵە بو،من داوائەکەم:ەك:سەنتەرێك بۆ لێکۆڵینەوە لەکەسی پسپۆرو شارەزا وشاهیدحاڵەکان دروست بکرێت وخۆبەخشانە کاری تێدابکەن و لەم جۆرە کارەسانە بکۆڵنەوە.دوو:لەپرۆگرامەکان خوێندناو لەهەمو قۆناغەکاندا بخوێنرێت.سێ:ئەم کارەساتانە لافیتەی حزبیان لەپشتەوە نەبێت بەڵکو بۆ کورد بێت،وەك نەتەوە.

حەمەی حاجی موحەمەدی خەیات:

# خەڵك تادوای نسکۆی شۆرش لەئاوارەییدا مایەوە

دوای نیوەرۆ بو ،بۆردومانەکە نزیکە ٢٠ دەقیقەی خایاند،وەك رۆژی حەشر وابو،بەناپاڵم بۆردومانەکە دەکرا،(سێگۆشەکەی)ەکەی ناوبازاری گرتەوە،خەڵك چاوەرێ نەبو ،کتوپر بو،دۆشکەیەك بەرامبەر قەسابخانە کۆنەکە هەبو،تەقەی ئەکرد لەفرۆکەکان،بەعس ئەیویست کورد نەهێڵێ،بۆچی هەڵەبجەشی کردە ئامانج مەسەلەکە ئەوەبو شۆرش بو،خەڵك ئاوارە بون ،رویانکردە ئێران،هەندێکیش رویانکردە لادێکان بۆ ناوچەی تەورۆڵی و هەورامان،من خۆم نەچوم،شار چۆڵ بو ئیدارەی تیا نەمابو،حکومەت ئیدارەی لەشارەکە کشاندبوەوە،خەڵك لەئاوارەییدا مانەوە تا دوای نسکۆی شۆرش پاشان گەرانەوە.

## بۆردومانەکە وەك رۆژی حەشر وابو،بەناپاڵم دای لەسێگۆشەکەی ناوبازار

شێخ حەمەصاڵح شێخ موحەمەد:

# لە١٩٧٤ دا ژێرخانی ئابوری هەڵەبجە وێرانبو

بۆردومانەکە ٢٦ی٤ دوانیوەرۆ دەستی پێکرد،نزیکەی نیو سەعاتی خایاند،پێش بۆردومانەکە ئیدارەی حکومەت لەهەڵەبجە کشایەوە،رژێمی ئەوکاتە فشارێکی زۆری خستبوە سەر سلێمانی و گەرمیان و خانەقین،نیمچە ئیدارەیەك لەلایەن شۆرشەوە لەوکاتەدا لەهەڵەبجە دروستکرابو،خەڵکی هەڵەبجە خۆیان ئیدارەیەکی بەهێزیان دروستکرد،خەڵك لەهەڵەبجە مابویەوە،پێشبینی ئەوەش کرابو رژێم دەستی خۆی ئەوەشێنێت،هەڵەبجە زۆر قەرەباڵخ بوبو،جێگای خەڵك نەئەبوەوە.پێش بۆردومانەکە ئامادەکارە ئەکرا،ئێستاش هەندێك دیواری کۆن ماوە ئەتوانم بڵێم ئاسەواری لەسەر ماوە کەئامادەکاری بۆ خۆپاراستن کراوە،ئێمە وەك قوتابی ناوەندییەکان لەحەوشەی مەکتەب وشوێنە چۆڵەکاندا لەسەر شێوەی پیتە ئینگلیزیەکان وەك وەك دەبلیو و ڤی ،زێد چاڵ هەڵئەکەنرا،ئامادەکاری کرابو کەهەڵەبجە بۆردومان ئەکرێت. زیاتریش بۆردومانەکە ناوهەڵەبجەی گرتەوە،ناوەراستی شار،مپلپەکە،دوکانی حاجی ئەورەحمان و ئەوان،٢٥ی٤ فرۆکە بۆ کەشف هات،ئیتر دڵنیا بوین بۆردومان ئەکرێت ولەهەمو رویەکەوە خەڵك ئامادەیی خۆی وەرگرت،لەبیرمە ئەم شیعرەیان ئەوت:

رۆژی هەینی بو ٢٦ی چوار

تەیارەی سیخۆ هات بۆ قەسفی شار

بەعسی بۆگەن و یابای پێ پەتی

سەرلێشێواوی رێگای نەگبەتی

ناپاڵم تازەترین چەك بو ئەکاتە بەکارهات،لەهەرشوێنێکدا کانی تەقاند بو،زۆربەی چەکەکان لەکوردستان تاقیکراونەتەوە و بەتایبەتیش لەهەڵەبجە،حکومەت ویستی ترسێك دروست بکات لەناوهاوڵاتیاندا کە بەیاننامەی ١١ی ئادار شکستی هێنا شۆرش دروست نەبێتەوە و چاوترسێنی خەڵك بکات،رژێمەکان وبەتایبەت بەعس هەرچیەکیان هەبوبێت بەکاریانهێناوە،ئەو کاتەش دەنگی خەڵکی کوردستان ئێزگەیەکی سادە بو نەئەگەشتە هەموشوێنێك،زەعیم سدیق قسەیەکی هەیە ئەڵێت:ئەگەر کورد وەفایان هەبوایە پەیکەرێکیان بۆ من دروست ئەکرد چونکە ئەگەر زاڵمی من نەبوایە شۆرش دروست نەئەبو،بەعس ئەوەیکرد بەڵام زەعیم سدیق وعەبدولسەلام عارف لەو کەمتریان نەکرد،ئەبوایە ئێستا دادگایەك دابنرایە وئەوانیش دادگایی بکرانایە.لە٢٦ی ٤دا هەڵەبجە وێران بو،خانوەکان روخان،دوکانەکان وێران بون،رێگاوبانەکان خراپ بون،کارەبا نەما،دوای بۆردومانەکە شار سیمای نەما،خەڵك بەرەوهەورامان و گوندەکان وئێران رۆشتن،بۆ یەکەمجار ئۆردوگای سەریاس دورستکرا،شۆرش لەتەوێڵە نەخۆشخانەیەکی گەورەیی کردبوەوە،لەپێنجوێن تاقیکردنەوەی قوتابخانەکان دائەنراو تەسحیحیش ئەکرا،٧٤ کەم نەبو،بەراستی خەڵك زۆر لەنارەحەتیدا بو،ژێر خانی ئابوری هەڵەبجە وێران بو.



# ناوی شەهید و بریندارەکانی بۆردومانەکەی هەڵەبجە

عەبدولقادر شادی

هەروەها لە مانگی (٥)ی هەمان ساڵدا لە سەراوی ئەورۆلی لە بۆردومانکردنی تەیارەکانی بەعسدا ئەم هاوڵاتیانە شەهیدو بریندار بوون: (١١) شەهید(١٠) بریندار.

ئەمانەی خوارەوە شەهیدەکانن:

-قادر مامە رشید (لەگەڵ دوو منالی)

-عەبدولا حاجی حەمەسالح دەلاك

-عەبدولا ئەحمەد حەمەخان

-نەوزاد عەلی ناسراو بەپاڵەوان

-گوڵزار عوسمان شاه موحەممەد

تۆفیق عەبدوڵقادر سەراوی

-خێزانی رشید ئەمین

-دایکی خالید عەبدوڵقادر حەسەن

-ئەحمەد حەمەئەمین عەبدورەحیم(ئەورەحیم)

ئەمانەی خوارەوەش بریندارەکانن:

- نجم الدين احمد عبدالله
- ئەنور عبدالقادر
- فرج فتاح
- عاصمە محمد
- نازدار حسين
- ئەمنە علی عبدالكريم
- رئوف حاجی فتاح
- حمد حمەامين عبدالرحيم (اورحيم)
- رێبوار نوری
- تۆفيق عبدالقادر حسن (تۆفيق قادر)

نوسەرورۆژنامەنوس

- حاجی سید عەبدولقادر هانەسورەیی
- مەحموود عەزیز سەعید (وەستای خەیات)
- بەختیار قادر مەحموود
- حەکیم قادر مەحموود
- کاڵێ قادر مەحموود
- عەبدوڵڵا مەلامحەمەد ئەمین
- عەبدولرەحمان حاجی حەمەصالح
- عەبدوڵڵا عەبدولکەریم
- عەزیز محەمەد (عەزەی پەزە)
- عەبدوڵڵا حەمەفەرەج (باوکی محەمەد و مەحموود)
- شێرزاد حەسەن قادر (قەصاب)
- نەوزاد حەسەن قادر (قەصاب)
- شێرکۆ عومەر مەغدور
- شیرین حەمەعەلی رەشید
- سنەوبەر ئەحمەد عەبدوڵڵا
- فاتمە سیدفەتاح محەمەد بارام
- مەحموود عەبدولرەحمان قادر کەریم
- بورهان حسەین ئەحمەد
- حەبسە ئەحمەد فەتاح
- ئەحمەد حسەین قادر
- بەختیار نووری عەبدولمحەمەد
- محەمەد قادر محەمەد فەتاح تاوگۆزی
- مەریەم محەمەد قادر
- فوئاد محەمەد قادر
- ئەحمەد شەریف مەحموود
- فەیسەل محەمەد فەتاح حسەین (بریندار، ساڵێك دواتر مردووە).
- حاجی فەتاح ئەحمەد ئیسماعیل (بریندار، پاش دوو مانگ لە ئێران مردووە).
- حەمەنووری عومەر کاکی (بریندار)
- عەبدولقادر ئەحمەد فتاح (بریندار)

ناوی شەهید و بریندارانی (١٩٧٤/٤/٢٦) لە بۆردومانەکەی هەڵەبجەدا

- ئازاد ئەحمەد حمەکەریم کوردستانی
- حەمیدە مەحموود ئەحمەد(خێزانی خالید رەشید صالح)
- حیکمەت ئەحمەد بارام
- حمەرشید سەیدعەبدولقادر مەحموود چایچی
- دەروێش حمەشەریف (ئەسپ وعارەبانچی)
- قادر نادر محەمەد (چرۆستانەیی)
- حمەرشید مەحموود وطی
- حەسەن حمەرشید مەحموود
- شیرین خالید رەشید صالح
- بەناز خالید رەشید صالح
- بەهار ئەحمەد عەبدوڵڵا محەمەد
- کافیە مەحموود محەمەد (خێزانی حاجی فتح الله)
- بێستون هاشم کازم (وەستا هاشمی هەورامی)
- مەحموود عەبدولرەحمان ئەفەندی
- کەریم محەمەد نادر
- مستەفا سید قادر
- محەمەد حمەرشید مەحموود
- محەمەد قادر محەمەد فەتاح
- شیرین حمەعەلی رەشید
- بەناز حمەعەلی رەشید
- ناسکە قادر مەحموود
- عەبدولەتیف حمەصالح حمەرەزا
- ئازاد عەلی جوولەکە
- ئاری عەلی ئیسماعیل
- ئایار عەلی ئیسماعیل
- حەمەدشەریف مەحموود
- حاجی ئەمین جەوهەر
- ئیبراهیم ئەمین جەوهەر
- ئەحمەد غەفوور صالح

هەڵەبجە نیوز
لەهەڵەبجەدەردەچێت
ساڵی یەکەم ژمارە(٢)٢٦ی٤ی٢٠١٦
موبایل:٠٧٥٠٨٣٥٤٦٠٦ :
فەیسبوک:حلبجە نیوز



## (ساڵحەفەنی)



(ساڵح محمد عبدالله ) ناسراوبەساڵحەفەنی ساڵی ١٩٣٣ لە شارەدڵگیرەکەی هەڵەبجە لەدایك بووە هەر لە وێ خوێندنی سەرەتای و ناوەندي تەواو دەکات ، لەساڵی ١٩٥١/١١/٢٠ بۆتەواوکردنی خوێندن دەچێتە شاری (بعقوبە )لە (دار المعلمین الابتدائیە - فرع التربیە البدنیە ) وەردەگیرێ و بەسەرکەوتووی لە ١٩٥٣/١٠/١٥ تەواوی دەکات و دەگەڕێتەوە هەڵەبجەو بەماموٚستا دادەمەزرێت لە گوندی (حاصل )ی سەربەناحیەی ( وارماوا ) لەخوێندنگەکەیدا کە بریتی ئەبێت لە چوار پۆل کوران وکچان تێکەڵاو دەبن ،،، ماموٚستا هەرخۆی بەڕێوەبەرو ماموٚستا ئەبێت ،پاش ساڵێك دەگوازرێتەوە بۆ هەڵەبجە لە قوتابخانەی ئامادەی هەڵەبجە دەستبە کاردەبێت وەك ماموٚستای وەرزش . لەساڵی ١٩٥٥ لەگەڵ کچی (ناتیق) شاعیر کە ناوی (فاتمە ملا کریم ) ە هاوسەرگیری دەکات و بەرهەمی ئەو هاوسەرگیرییە پێنج کچ و سی کوڕ دەبێت .

ماموٚستا پاش ڕاپەرینەمەزنەکە ی بەهاری ١٩٩١ پاش دەرکردنی ڕژێمی فاشستی بەعس لەگەڵ منداڵەکانی دەگەڕێتەوە هەڵەبجە لە جێگای خانووە روخاوەکەی خۆیدا بەدارپەردووی خانوەکەی دووژوور بۆژیان دروست دەکاتەوە تێدادەژین . هەرلەوماوەیەدا هەوڵ دەدات کەجارێکی تر خزمەت بەهەڵەبجە بکات لەبواری وەرزشدا بۆیە دەبیتە بەڕێوەبەری کارگێڕ یانەی وەرزشی هەڵەبجە وتا کۆتای ژیانی لەخزمەت ئەو یانیەدا کاری کرد . بەداخەوە ماموٚستا ساڵح لەساڵی ٢٠٠٧ نەخۆش دەکەوێت پاش دوو نەشتەرگەری و چەند جار سەردانی دکتۆر لەئێران بۆچارەسەر بەیانی کات ژمیری ٦.٥ ی ڕۆژی ٢٠٠٨/١٢/٣١ دڵەگەورەکەی لەلێدان دەکەوێت شارەخۆشەویستەکەی بەجێ دێڵێت لەگۆڕستان ژمارە٣ ی گوڵان بەخاك دەسپێردرێت



وینەی تیپی دیدەوانی قوتابخانەکانی هەڵەبجە ساڵان 1955-1956
بە سە رپەرشتی ماموستا ( ساڵح ملا محمد سە ردانی تیپە کە بو لادیکان ناوچەی شارەزوور
ئەوەی لە وینەکەدا ناسراون بە ریزان ( ماموستا ساڵح قات لە بە رە کەو ئە وەی پالی مشکی لە سەرکە
کاکە حمەی فرە ج,,,,,
ئەرشیف/کاوەساڵح/ 27/6/2014



حەکیم مەلا ساڵح

# بەعس نەیتوانی چۆك بەشۆرش دابدات

ساڵی ١٩٧٤ پاش ئەوەی رژێم دانی نەنابەو بەڵێنانەی کەبۆ چارەنوسی کورد وچارەسەرکردنی کێشەکەی دابوی،پارتی-ش ئەوکاتە دەسەلاتی یەکەم بو هێزێکی توٚکمەو گەورەی سەربازی هەبو،لەروی جوگرافیشەوە سنورێکی فراوانی ئازاد کراوی هەبو،حزبی بەعس بیانوی ئەگرت،بۆردومانی قەلادزێ و هەلەبجەی کرد،شەری زۆزگی کرد،بۆ ئەوەی مەلا مستەفاو شۆرش تەسلیم ببن بەلام تەسلیم نەبون،کە ئەوە نەکرا چون لەگەل ئێران لەجەزائیر پەیماننامەیەکیان مۆرکرد،شۆرشەکەیان تێکشاند،ئێمە لەهەلەبجە کەنزیك سنورین ژمارەیەکی زۆر خەلکی ئاوارە هاتبون بۆ هەلەبجە،ئێمەش یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان،کاك موحەمەد فەتاح(حەمەی فەتەلیرە)سەرپەرشتی هەموی ئەکرد،تیممان دانابو،بۆ هاوکاریکردنی خەلکی لێقەوماو و هاوکاریکردنیان ودابەشمان ئەکردن بەسەر مالاندا،لەلایەکیترەوە راهێنانمان ئەکردلەسەر ئەوەی لەرۆژی لێقەوماندا چۆن بەرگری بکەین و زیانەکان کەمتر بن،تیم دروستکرابو لەناوشاردا،هەر شوێنێك ژێرزەمینی لێ بوایە بەهێلی سور دیاریدەکرا،دوای بۆردومانی قەلادزێ ئێمە دلنیابوین بۆردومان دەکرێین،هەروەها لەناوشاردا چال هەلکەندرا بو بۆ ئەوەی خەلك بچنە ناوی ئەگەر ژێر زەمینی دەست نەکەوێت.دارمەیتمان دروستکردبو بۆ گواستنەوەی بریندار،خۆمان رائەهێنا لەسەر کوژانەوی ئاگر،ئەگەر ئەو تیمەمیللیانە نەبوایە زیانەکان زۆر زیاتر ئەبون،بەلام بەداخەوە شەهیدەکان تا ئێستا نەناسێنراون بەناوچەکانی تر بۆ ئەوەی خەلك بزانێت هەلەبجە تەنهاکیمیاوی لێینەداوە.پێویستەدەزگای ئەیلول لەروی داراییەوە پشتگیری هەلەبجە بکات،سالانە یادەکە بەشێوەیەکی رێك و پێك بکرێتەوە و بکرێتە کتێبێك و شەریحالی درندەی بەعس بکات کەبەچەکی قەدەغەکراوی ناپالمی بەکارهێناوەو هەروەها باسی ئەوەش بکات کەخەلکی هەلەبجە خۆی ئامادەکردوە کەلێ ی بقەومێت بەلام شارەکەی چۆل نەکردوە،ئەو کتێبە ئەبێتە ناسنامەیەك بۆ رووداوەکەو پلەی شەهیدەکان و ئاستی ژیان وخوێنەوارییان دیاری بکرێت.هەلەبجە دوو بارەگای پارتی لێبو،بەعس هات هەمو شارەکە لەناوبەرێت،بارەگاکان زیانیان پێنەگەیشت،ئەوەی رویدا جەهەنەمێك بو،دوای ئەوە خەلکەکە کۆچیانکرد بۆ ئێران و هەندێکی چو بۆ سلێمانی و ،لەئێران ماینەوە تا نسکۆی شۆرش.ئێمە چاوکراوەبوین بەسەرئیش وکارەکانی خۆمانەوە،شۆرش دۆشکایەکی لەپشت سەرا دانابو(ئێستای مەلبەندی بزوتنەوە)،دۆشکاکە تەقەی لەفرۆکەکان کردوترسیان لێ نیشت،هیوادارم دەسەلات و دەزگای ئەیلول بتوانن تەواوی زیانەکانی،ئاوارەبون،بەرگری میللی دروستکردن و رۆلی ماموٚستایان کەورەی خەلکیان بەرزدەکردەوە،هەقی خۆی پێ بدات،دەبێت خزمەتی قوربانیەکانی بکرێت هەرچەند دەزگای ئەیلول خزمەتیان کردوەبەلام دەبێت خزمەتەکە بەقەد قەبارەی کارەساتەکە بێت.خەلکی هەلەبجە زۆر خزمەتی ئاوارەکانی کرد،شار بەسەر هەر پێنج گەرەکەکەدا دابەشکرا بو،خەلکمان بەسەر مالاندا دابەش ئەکرد،خەلکەکەش بەسنگێکی فراوانەوە میوان دۆستیەکی چاکیانکرد،لەهەلەبجە لەدەرگایەك نەدراوە بلێین میوانتان هەیە وبلێن رایناگرین،کەئاوارەمان دابەشکردوە،مال هەبوە وارێکەوتوە کەسی بەرنەکەوتوە،گلەیکردوە و وتویەتی من نانێکم نیە بیخۆن،بۆکەستان نەناردوە بۆ مالی من.

هەڵەبجە نیوز
Halabja News

بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بەساڵوەگەری
ڕاپەرینی هەڵەبجەوهەورامان و شارەزور
ژمارە(٣)
هەینی١٣ی٥ی٢٠١٦
خاوەن ئیمتیازوسەرنوسەر
سەلاح سەعید ئەمین

# ڕەتکردنەوەی ستەمکاری

## ٢٩ساڵ بەسەر ڕاپەرینی هەڵەبجەو هەورامان و شارەزوردا تێپەردەبێت

هەڵەبجەنیوز:تایبەت
٢٩سال بەسەر بەسەر ڕاپەرینی خەڵکی هەڵەبجەو هەورامان و شارەزوردا تێپەردەبێت دژ بەرژێمی بەعس،خەڵك لەرۆژی ١٣ی٥ی١٩٨٧دا دژ بەراگواستنی گوندەکان وزوڵمی بەعس ڕاپەری و بەپێی زانیاریەکان دەیان شەهید وبریندار هەبوە وهێزەکانی رژێمیش رەشبگیری هاولاتیانیان دەست پێکردەوەوسەدان کەسیان دەستگیرکردوەو و بەچەکی قورس و فرۆکەو بەجاش و جەیشەوە روبەروی خەلکی خۆپیشاندەربوەتەوە،ئەمە جگە لەتەقاندنەوەی گەرەکی کانی عاشقان بەتەواوی .هەروەهالە دەرئەنجامی ئەم ڕاپەرینەدا خەڵکێکی زۆری ناوچەکە ئاوارەبون وروویان لەئێران کردو لەئۆردوگاکان گیرسانەوە..بەعس تاوانی گەورەیی ئەنجامداو بریندارەکانی نەخۆشخانەی هەلەبجەو مورافیقەکانیانی لەنێوان هەردوو گوندی بامۆك و عەبابەیلێ دا زیندەبچالکرد




٢٩ ساڵ بەرلەئێستا خەلکیهەلەبجەو هەورامان و شارەزور بەژن و پیاوەوە،بەگەنج پیرەوە،بەجوتیاروکاسب وفەرمانبەر وریکخستنەکانەوە،بەزانایانی ئاینی وخوێنەوارانەوە،بەجیاوازی بیرکردنەوەو رەنگیانەوەدژ بەدەسەلاتی ستەمکاری بەعس ڕاپەرین و ستەم و ستەمکاریِ ئەو رژێمەیان رەتکردەوە.خەلك ستەمی بەعس و بیرکردنەوەی بەعس زۆری بۆهێنابو،لەنێوان ئەوەی بەعس دەیوست و مەرگدا خەلك مەرگیان پێباشتربو بۆیە بەسنگی روتەوە،رژانە سەرشەقامەکان و روبەروی تانك وجاش و جەیش بونەوە،دەیەی هەشتاکانی سەدەی ڕابردو بەتایبەت بۆ خەلکی هەلەبجەو ناوچەکە دەیەی بەرەنگاری بەعس و بیرکردنەوەی بەعس بو،دەیەی دەرسدادانی ئەو رژێمە بوکە ئەمرۆ خراوەتە دەرەوەی یاریگاوپارێزگای هەلەبجەو ناوچەکەش سەربەرزانە یادی ٢٩ ساڵەی ئەو ڕاپەرینە جەماوەرییە دەکاتەوە.

## بەپێی بەڵگەنامەیەکی ئەمنی هەڵەبجە کەدەست هەڵەبجە نیوز کەوتوە

# لەرۆژی یەکەمی ڕاپەرینەکەدا شەش شەهید و حەڤدە بریندار هەبوە

هەڵەبجە نیوز: تایبەت
بەپێی بەڵگەنامەیەك کەوەك پاشکۆ بۆ بروسکەی ژمارە ٢٨٥٦نوسراوەو لەرۆژی ١٣ی٥ی١٩٨٧دا یاریدەدەرێتی ئەمنی هەڵەبجە و بۆ بەرێوەبەرێتی ئەمنی هەڵەبجەی ناردوە ودەست هەڵەبجە نیوز کەوتوە،تیایدا ناوی شەهیدان و بریندارى ڕۆژی یەکەمی ڕاپەرینەکەی تێدا تۆمارکراوە.
بەپێی ئەو نوسراوە کە ئەفسەری ئەمنی هەلەبجە بەرزیکردوەتەوە ناوی شەش شەهید و حەڤدە بریندار نوسراون لەگەڵ دیاریکردنی تەمەن و شوێنی نیشتەجێبون و پیشەو گەرەك و رەگەزەکەیان.
لەناو شەهیدەکاندا کەنوسراوەکەی ئەمنی هەلەبجە بەکوژراو ناوییبردون تەمەن پەنجا ساڵ گەورەترین و حەوت ساڵیش بچوکترینە کەهاتون ،هەروەها لەناوبریندارەکانیشدا چل و پێنج ساڵ بەتەمەنترینەو پێنج ساڵیش بچوکترینە.
کاسب و قوتابی و یاریدەدەری پزیشك کارگوزار وشۆفێر و وجوتیار وژنی ماڵ و منالی لەهەردوو رەگەز تێدایە.
لەو نوسراوەشدا ئەوەش هاتوە:لەئەنجامی ئەو پێکدادانەی کەلەم رۆژەدا رویداوە لەنێوان هێزی هاوبەش و خۆپیشاندەراندا لەقەزای هەلەبجە ئەو کوژراو و بریندارانەی لێکەوتوەتەوە.
ڕاپەرینەکە چەند رۆژێکی خایاند و رژێمی بەعسی لەسەرکارلابراو بەتوندی بەرەنگای بویەوەو دەیان شەهید وبرینداری لێکەتەوە،ئەمە جگە لەدەستگیرکردنی سەدان کەس وتەقانەدنەوەی گەرەکی کانی عاشقان .

مهاباد شێخ حەمەئەمین
تاوانەکانی بەعس بەرامبەرهەڵەبجە
ل٢......

شوانِ هەورامی
بۆ هەڵەبجە کرایە ئامانج
ل٦..

نیشتیمان هەڵەبجەیی
سیانزە ماڵە
ل.....٧

# تاوانەکانی بەعس بەرامبەر بەهەڵەبجە



مەهاباد شێخ حەمەئەمین هەڵەبجەیی

بیرکردنه وه ی رژیمی به عس و تاوانه کانی بو هه له بچه ی شـــه هید له ناو بردنی خه لکه که ی ورووخاندنی وویران کردن ئه م شـــاره بوو . هه نکاونانـــه کی چون ده ســـت پی بـکات ئه که ر به کورتی باســی میژووی ئه م شاره بکه ین زور تو شـــی داگیر کاری بووه ته وه هه ر له سه رده می سالانی١٩١٩ وه تا ١٩٨٨ . به هوی پیك هاته ی سنوری جوکرافیایی شاره که و نزیکی له سنوری ئیرانـــه وه وه دروســـت بوونـــی شورشـــه کانـــی باشووری کوردستان شورشی ئه یلول و شورشی نوی زوربه ی که ســایيه تی و سه رکرده سیاسیه کانی و نووســـه رو ئه دیب و شاعیران و هونه ر دوستان له م شاره وه سه رچاوه ی دروست بوونی هه بووه هوکاریکی به هیز بووه . بو خاپورکردنی هه لـــه بچه له لایه ن رژیمی دکتاتوری به عســـه وه . تاوانـــه کان رژیـــم بـــو ســـه ر شـــاری هه له بجه ئه گه ر ته نها باســـی ٣ کاره ســـات بکه ین : لـــه ســـال وروژی ١٩٧٤/٤/٢٦لـــه کات ژمیر ٤ و٣٥ دقیقـــه هـــه لـــه بجـــه له لایـــه یـــن رژیمه وه بوردومـــان کـــرا زیاترلـــه ٥٣ شـــه هیـــدو ٢٠٠ برینـــدار و زیانیکی زور لـــه روخاندنی ماله کان و ئـــاواره بوونـــی زوری خه لکی شـــاره که و ئه وانشـــی روویان کردبووه هه لـــه بجه به ره و هه ورامان و ئیران مال و حالی خویان به جیهیشت . ئه م بوردومانه له دوایی ٤/٢٤ شـــاری قه لادزی روویـــدا بـــه مه دانیشـــتوانی هه له بچـــه ئاماده ی خویان وه رگرت شه وی ٢٥ له سه ر ٢٦ ژماره یـــه کی زور له هه له بچـــه چوونه ده ره وه ئه مه هوکاریـــك بوو که متر شـــه هیـــدو برینداری لیکه وته وه . هه له بچه له وکاته دا ناوچه یه کی ئازاد کراو بوو زوربه ی خه لکی کوردستان رویان له وی کردبـــوو میوانه کان دابه ش ده کران به ســـه ر مالـــه کاندا خه لکی هه له بچه زور به خزمه ت بوون لـــه وکاته دا ده رگای مالـــه کان کراوه بوو بـــو هه موولایه ك بو خزمـــه ت کردنی خوینکاره کان خوینـــدن به رده وام بوو بوییه زوریك له خه لـــك روویان کردبووه هه له بچه قوتابخانه کان له ســـه ره تاییه وه هه بوو تائاماده یی و پیشه یه کان به لام رژیمی دکتاتور ئه م شـــاره ی له ناوبرد به بوردومان کردن شـــاره کـــه له ته واوی چول کرا بـــه ره وهه ورامـــان و ئاواره ی ئیـــران بوون و ژیانیان له ناو خیمه ی ئاواره یدا به سه ربرد تاهه رسهینان وروخاندنی ئه وشورشه گه وره ییه له ئه نجامی دوژمنانی میلله ته که مان له ریکه وتنیکی نیوان ئیران و جه زائیر به ده سیسه ی ناحه زانی کورد ئاشـــبه تالیان به و شورشـــه که وره ییه کرد به زوره مللی هه موخه لکی کوردستانیان نارده وه ژیر چه پوکی دوژمنی کورد به شیکی که م له ئیران مانه وه و ئه وه شـــی بیویستایه شورشه که بـــه ته واوه تی له نـــاو نه چی ریگریان لیده کردن بویـــان نه بوو بـــه رده وامی به شـــورش بده ن و هه ره شـــه ی کوشـــتنیان لیده کرا ئا به م شیوه یه شـــورش له ناوبراو و هـــه له بچه زه ره رمه ندی ســـه ره کـــی بوو له ســـالانی ١٩٧٤ بـــو ١٩٧٥ .

٢- کاره ســـاتیکی تـــری هـــه لـــه بجـــه له ســـالی ١٩٨٧/٥/١٣ به هوی ناره زای خه لك بو رژیمی دکتاتوری به عس تاوانیکی تر به سه ر هه له بجه دابارا‌ند جاریکی تر به توب باران که وته تاوان به تاییه تی له که ره کی کانی عه شـــقان ژماره یه ك شه هیدو بریندارو وکاول کاری و گرتن و توقاندن و روخاندنی که ره کیکی ته واو له سه ر ئه وناره زاییانـــه کـــه وته وه گیانـــی ئه م شـــاره بریندار ه .

**گرنگە مەرزەکانی هەڵەبجە بکرێنەوەو کەرتی گەشتوگوزار لەپارێزگاکەدا بایەخی پێبدرێت**

**بەڵێنی هۆڵی نمونەیی دراوە بەم شارە لەلایەن سەرۆکی حکوتەوە کەجیاوازبێت لەهۆڵی شارەگەورەکانی کوردستان**

٣- کاره ســـاتیکی که وره ئـــه م جاره یان ده نکی دایـــه وه له هه مـــوو جیهاندا ئه ویـــش کیمیاباران کردنـــی هه له بچه بـــوو له ســـالی ١٩٨٨/٣/١٦ بـــو له ناوبردنی و نه هیشـــتنی و روخاندنی یه ك جـــاره کی شـــاره که بـــوو وای به ســـه ر هینا که جاریکی تـــر ژیانی تیادا نه بی و هه موو ئه مانی کـــرد ئه و رژیمـــه دکتاتوره به رامبـــه ر میلله ته کـــی خوی ته نها لـــه به ر ئه وه ی له ســـه رخاك ونیشـــتیمانی خویان بزین مافی کوردستان بوونی خویان هه بیت زیاتر له ٥٠٠٠ هه زار شـــه هیدو ١٠٠٠٠ هه زار بریندارو هه زاره ها مال ئاواره ی ئیـــران بوونه وه جاریکـــی تربه بیئه وه ی هیچ شـــتیکیان بو ده ربچیت به وه شـــه وه نه وه ستا که وته رووخاندنی ماله کان وخانوه کانی له ناوبردن . ئه مه بوو نییه تی عیزبی به عس بو ئه م شـــاره . ئـــه وه نده ده لیـــن بینیمان ئه ورژیمـــه درنده یه چـــون له ناوچو ئیســـتایش ده بینین شـــاره که مان له پای ئه و هه مووکاره ســـاته شـــه ره فی ١٩ هه مین پاریزکای شـــاری عیراق و ٤ هه مین شاری کوردســـتانی بریـــاری بـــو درا به لام لـــه که ل ئه وه شدا پیویســـته ئه م شاره سیمای پاریزگای پیوه دیاربیت وخزمه تی باشـــتر بکریت پیویستی زور ی مـــاوه بوی ئه نجام بدریت . له وانه ( ده روازه ی شـــاره که پیویسته جوان کاری بو بکریت - شه قامه کان ناوشـــار و ده وروبه ری فراوان بکریت - رووناکی شاره که زور پیویسته له رووی جوان کاری و رووناکی به رده وامی هه بیت - وه عدی هولی نموونه ی دراوه به م شـــاره له لایه ن ســـه روکـــی حوکمه تـــه وه و کـــه جیاوازبیت له هولی شـــاره کـــه وره کانی کوردســـتان هه مـــوو جوره هولیکـــی تری تیابیت ئه مه خـــوم ئه ماده بووم له ودانیشـــتنه دائه ی بو جی به جـــی نه کرا وه م وه عزه ٤ سال له م وپیش بوو ده لیم ده بوو ئیستا ته واو بکرایـــه نه وه ك هولیکی نـــه بیت - نه بوونی پارکیکـــی کـــه وره بو خیزانه کانی ئه م شـــاره له کاتی پشـــوویاندا روبکه نه کوی بوکات بردنه سه ر له که ل منداله کانیاندا وه که نجی شاره که یش پیویستی به شـــوینیکی واهه یه - گه شتوکوزاری ئه م شاره زوره پیویسته گرنکی پیبدریت تاوه کو گشـــتیار رووی زیاتریان هه بی بو ئه م ناوچه یه ده بیتـــه داهاتیکیش بو خه لکی شـــاره که - کردنه وه ی مـــه رزه کانـــی ســـه رسنووری ئیـــران بو ناوچـــه کـــه کرنگـــی ده بیت - گرنکـــی دان به که رتی کشـــتوکال و پیشه سازی زور پیویسته بو ئه م ناوچـــه یه له رووی زراع و به رهه مه کانی ده توانریت چـــه ندین کارگه ی لیبکریتـــه وه و ببیته خـــاوه ن بـــه رهه می خوی بو فروشـــتنه وه ی له کوردستان و عیراق ده ره وه ی وولات به مش ئه توانین ئاســـتی ئابوری شاره که به رز بکه ینه وه و ژمـــاره یه کی زور له و که نجانه ی ده رچوی زانکـــوو پیمانکـــه کان و ئامـــاده ییه پیشـــه یه کان بخرینـــه کار و هه لی ئیـــش کردنیان بو بدوزرینه وه بـــه مانـــه ئه توانیـــن پاریزکای هه لـــه بجه بکه بنـــه شـــاری نموونه ی بـــه ووه عدانی پیـــدراوه .

مامۆستا عەبدورەحمان فەرەج(مامۆستاعەبدول):

# راگواستنی گوندەکان و زوڵمی بەعس هۆکاری راپەرینەکەبون

عەبدورەحمان فەرەج(مامۆستا عەبدول): لەئەنجامی زوڵمی بەعس و راگواستنی لادێکان،ئەگەر کەسێك بچوایەتەوە بۆ سەرقەبری باوکی نەیانئەهێشت،بۆنمونە (عومەری حاجی حەمەئەمین) برای کاك شەریف ،خەڵکی سەراو بو،رۆشتبوەوە،تەقەیان لێکردبو،پێکرابو،کولەباڵەکەی خستبوە ژێر سەری بەکۆپتەر بۆیدابەزین و هەڵیانگرت و بردیان ،ئێستاش نازانن چی لێهاتوە.هەمو لادێکانیش راگوێزراِن جگە لەبامۆك و عەبابەیلێ،دێیەك نەما،ئیتر خەڵك وتی بکوژرێین باشترە،ئەمانە هۆکاری راپەرینەکەبون. ئەحمەدی حاجی ئەحە هەبو،بەرپرسێکی حزبی شیوعی بو،وتی:مامۆستا ماڵی ئێوە قەرەباڵخە و وەرە بۆ ماڵی ئێمە با بەرنامەیەك دابنێین،منیش مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولەزیز ومامۆستا مەلاعومەرم ئاگادارکرد،مامۆستا مەلا عوسمان وتی ئەم حکومەتە کافرە هەقە هەمو خەڵکی لێی هەڵسێت ،مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز لەمزگەوتی پاشا وتاری ئەداو یەکەم ماڵ تەقاندنیانەوە ماڵی مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز بو،مامۆستا حەسەن شەمێرانیش لەکۆروکۆبونەوەو بۆنەکاندا قسەی ئەکردو دەستگیریان کردو وتیان هانی خەڵکی داوە و بەکۆپتەر بردیان. بەعس بەفرۆکە داوای کرد خەڵك لەماڵەکانی خۆیان بمێننەوە،ئەگینا ماڵەکانیان ئەسوتێنین،گەنجەکان رۆشتن. من گیرام وبرام بۆ سانەوی کچان،رۆژی ١٤ی ٥ من خۆم ٢٣٢ کەسم ژمار کەگیرابون،دواتر وردە وردە زیادی ئەکرد وکەسی تریان ئەهێنا،پیاو ماقوڵی تیابو ،بەتەمەنی تیابو،هەندێکیان بەرنەبون و بران بۆ سلێمانی،ئێمە تا هەفتەیەك ماینەوە،یەکەم کەس کەبەربو مامۆستا عەزیز مەحمود بو،دووهەم من بوم وتیان مامۆستایە لەبەر مەکتەبەکەی بەریبدەن. لەگەرمەی خۆپیشاندانەکەدا گەرەکی کانی عاشقان تەقێنرایەوە،چونکە وتیان خۆپیشاندانەکە لەوێوە دەستی پێکردوە. ئافرەتانیش لەراپەرینەکەدا بەشداربون،(پیزەو ئایشێی ئەحمەدی موراویس) وتم پێیان (عەبدورەحمانی شێخ)گیراوە راکەن،گازییان گرتبو لەدەستی سەربازەکان عەبدورەحمانیان لێ سەندبونەوە،

## مامۆستا مەلا عوسمان وتی: هەقە هەمو خەڵك لەدژی بەعس راپەرێت

کچی حەمەی سافە،هوتافی ئەکێشا،من باوکیم ئەناسی بۆیە ناسیمەوە،ئەگینا زۆریتریش بەشداربون ومن نەمئەناسین. هەڵەبجە سێ نائاسایی بو ،فرۆکە بۆردومانی ئەکرد،(فاتمەی کچی حەمەسەعیدی تەنەکەچی) شەهید بو،لەخواریشەوە (عوسمان عەلی حەمە ساڵح) باوکی(عەلی،جێگری پارێزگار) وبریندارببوبون،وتم مەرۆن بۆنەخۆشخانە،وتی:وەزعم باش نیە و ناتوانم نەچم،فەرەجی برای لەگەڵ رۆیشت. شەوی ١٢ی٥ من و کاك ئەحمەد دانیشتین و ئەو وتی:بەڵکو سیروان و سەیدسادق-یش بەشداری بکەن ،من وتم سەیدسادق لەسەرمن،رۆشتم بۆ سەیدسادق بۆ لای مەلا ئیبراهیمی کوری مامۆستا مەلاعوسمان وئاگادارم کرد،تەنانەت پێشمەرگەی یەکێتی پاراستبویان،پێکەوە دەستمان پێکرد. یەکەمجار لەکانی قولکەوە دەستی پێکرد،من و عەبدورەحمانی شێخ وشێخ حەیدەرو مامۆستا رزگاری عەبەکەرەو سەعید سەیدقادر و ئازاد تۆفیق و ئەنوەری رابە،هەندێك دەڵەمەریشی تیابو،ناوەکانیان بیرنیە.لەناوبازار(مەریوان حەمە رەشید شەهید)بوهەر لەویا بەردمان ئەگرتە دەبابە وگەراینەوە کانی عاشقان،حکومەت هێزێکی هێنایە لای شارەوانی ئێستا،هێزی ئەمنی و سەربازیش بون لەوێوە رۆشتین بۆمەکتەبی کانی عاشقان وهەمو تەلەبەکانیان هاتن، و لەوێشەوە لای مزگەوتی جامیعەوە بەرەو بازار ئەچوین و وتیان مەترسی هەیە لەوێشەوە بەرەو مەکتەبی سەناعەکە. ئەو بریندارانەی لەنەخۆشخانە بون لەگەڵ (مرافق)ەکانیان گرتنیان و بردنیان لەنێوان عەبابەیلێ و بامۆك زیندەبەچاڵیان کردن.

---

ئەنوەری رابە:

# بەعس دەیویست سەرچاوەی هاوکارییەکانی پێشمەرگە ببرێت

ئەنوەری رابە: رژێمی گۆربەگۆری بەعس هەستا بەراگواستنی گوندەکانی دەروبەری هەڵەبجە بۆ ئەوەی سەرچاوەی دارایی وخواردن و هاوکاری لەهێزی پێشمەرگە ببرێت،ئەو هەنگاوە کارێکی کرد گوندەکان ژیانیان لێتێکچو،ئێمەش ئەو کات لەرێکخستنەکانی یەکێتی بوین،پێشتر بەرنامە رێژییەك کرابو،من خانویەکی خۆم هەبو،شەوانە کۆئەبوینەوە،رێکخستنەکانی یەکێتی(ئازاد تۆفیق،ئارام مەجید،سەعید سەید قادر،عادلی کەریم ئەوبەری)ئەوکایردانە بون کەدیاربون..لەدوای نسکۆی شۆرش لە١٩٧٩ یەکەم خۆپیشاندان لەسەرتاسەری کوردستان لەهەڵەبجەکرا،لەساڵی ١٩٨٢ لەیادی بۆردومانەکەی قەڵادزێدا شانبەشانی راپەرینەکەی قەڵادزێ لەهەڵەبجە خۆپیشاندانکرا،لەدانوساندنی ١٩٨٤ دا لەهەڵەبجە خۆپیشاندان کراوە،لە١٩٨٧دا کراوە،

## دوای نسکۆی شۆرش لەسەرانسەری کوردستاندا یەکەم خۆپیشاندان لەهەڵەبجە کراوە

## رێکخستنەکانی یەکێتی رۆڵی چالاکیان هەبو لەراپەرینەکەدا

هەمو ئەمانە بەبەرنامە بون،شەو جار درا لەمزگەوتی مامۆستا مەلا موحەمەدەوە بۆ ئەوەی بەیانی خەڵك مان بگرن و دوکان نەکەنەوە وەك هاوسۆزییەك بۆ کەسوکارەکانمان کەلەلادێکان رایانگواستبون. بەیانیەکەی من هەستمکرد خەڵك ئامادەیە،مامۆستا ئازاد تۆفیق وتی دەنگوباس چیە؟وتم خەڵك چاوەرێی کەسێکە قسە بکات ،وتی:من قسە ئەکەم،لای مزگەوتی دارئیحسان،وتارێکی زۆر جوانیدا خەڵك کۆبوەوە،لەوکاتەدا وتیان لەکانی عاشقان دەستی پێکردوە،ئێمە هەوڵماندا لەکانی قولکەوە برۆین بۆ کانی عاشقان بەلام لەچواریانی حەمەی سافە لەناوبازار پەرینەوە قورس بو،لەعومەری خاوەرەوە جاشەکان تەقەیان ئەکرد،لای بەلەدییەکەشەوە تەقەیان ئەکرد،ئەو برادەرانەی سەرپەرشتی راپەرینەکەیان ئەکرد هەوڵماندا بپەرینەوە کانی عاشقان بەلام بەداخەوە لەکاتی پەرینەوە(مەریوان حەمەرەشید) کورێکی جوان شەهید بو،چەند کەسێکی تر بریندار بون،راپەرینەکە چەند رۆژێکی خایاند و زۆربەی خەڵکی هەڵەبجە بەژن و پیاوەوە بەشداربون.

# شەهیدانی راپەرینەکەی ١٣ی٥ی١٩٨٧

## هەڵەبجەنیوز:تایبەت

لەناو شاری هەڵەبجە لەراپەرینەکەی ١٣ی ٥ی ١٩٨٧ دا بەپێی داتایەك كە لە(مامۆستا عەبدورحمان فەرەج-مامۆستا عەبدول)وەرگیراوە، ٢٤ شەهید ناویان هاتوە کەئەمانەی خوارەوەن:

١-سەید سلێمان

٢-ئەحمەد موحەمەد سەعید

٣-قادر ئەحمەد قادر

٤-شەهلا عەبدولکەریم رەحیم

٥-عەبدولکەریم حەمەرەشید

٦-عەبدولا رەشید

٧-حەمەکەریم حەمە سالح

٨-عوسمان عەلی

٩-فەرەج عەبدولا عەلی کەریم

١٠-عوسمان عەلی کەریم

١١-مینا فەرەج باوەیس

١٢-فاتمە حەمەسەعید حەمە کەریم

١٣-فاتمە حەمە ئەمین

١٤-مەریوان حەمە رەشید

١٥-حەمەکەریم دەرەی مەری

١٦-ئەحمەد (نەورۆڵی)

١٧-عەبدوسەمەد حەمەتل

١٨-موحەمەد عەزیز

١٩-حاجی موستەفا عەبدولقادر

٢٠-زوبەیدە ئەورەحمان موستەفا

٢١-موحەمەد رەسوڵ موحەمەد

٢٢-موحسین رەسوڵ موحەمەد

٢٣-موحەمەد مەحمود ئەولکەریم

٢٤-عەبدورەحیم هانەسورەیی

# قوربانیەکی ونبو!!

ئەحمەد رەنجیار

ئەگــەر بمانەوێــت بــاس لەنەهامەتیەکانــی هەڵەبجە بکەین ئــەوا دەبێت ئینســکلۆپیدیایەك پنوســین،هەر پەرەیەك هەلبەیتەوە مەرگەســاتێکی هەلەبجەی تێدایە. هەرکەس دەدوێنیت چیرۆك وبەسەرهاتێکی هەلەبجەی لایە،هەمو ئەمانە میراتی میلەتێکن پێوست دەکات لایەنە پەیوەندیــدارەکان بایەخی پێبدەن.دەربــارەی راپەرینی ١٣ی ٥ی ١٩٨٧ هەلەبجەو هەورامان و شارەزوور ونارەزایــی خەڵــك دژ بەرژێمی بەعس کەسیاســەتی راگواســتنی گوندەکانی پیادە دەکرد کەلەرێکەوتنامەی شومی جەزائیر دا لەنێوان عێراق-ئێران-دا هاتبو،دەبێت گونــدە ســنورییەکانی کوردســتانی عێــراق راپێچــی ئۆردوگــا زۆرە ملێکان بکرێن.گوندەکانی شــارەزور چۆلکران،خەلکەکانیــان راگوێــزان بــۆ خورماڵ یان بۆ هەلەبجــە هەلهاتن کەرازی نەبــون بچنە ئۆردوگا زۆرەملێکانــی وەك(نەســر و باریکــە)دوای ئەوەش رژێــم دەنگــۆی ئەوەی بــلاو دەکــردەوە کەدەیەوێت هەلەبجە رابگوازێت!ئەمەش بۆ ئەوەی باری سەرنجی خەڵــك لــەم روەوە وەربگرێت.ئەمــەش لای خەلکی هەڵەبجە کاردانەوەی لێکەوتەوە و شــەوی١٢ لەسەر ١٣ی ٥ ی ١٩٨٧لەمنــارەی مزگەوتــی گــەورەی هەلەبجــەوە بانگەوازی مانگرتن بــۆ هاولاتیان کراو وداواکرا هاولاتیــان دوکان و بازار نەکەنەوە وخەلك لەمالەکانــی خۆیان دانیشــن ونەیەنــە دەرەوە.رۆژی ١٣ی ٥ قوتابیــان و خوێندکاران بەتایبــەت( ئامادەیی کشتوکاڵ، ناوەندی شارەزور،ئامادەیی ئەحمەد موختار جاف)رژانــە سەرشــەقام و دەنگــی نارەزایی هوتافی شۆرشــگێرانە دژ بەرژێــم بەرزبویــەوە وهێزەکانی رژێمیش لەســەربازو جاش بەرەنگاری خۆپیشاندەران بونەوە.هاوکات لە(ســیروان و سەیدسادق)یش دەستی پێکــرد و رژێم تەنگــە پێهەلچنرا و ســەرنجام رژێم بێرەحمانــە بۆردومانــی هاولاتیانــی کرد و شــەهید و برینداریێکــی زۆری لێکەوتــەوە.و بریندارەکانیش کەلەنەخۆشــخانەبون لەپشــت ســەربازگەکەی هەلەبجــە زیندەبەچالکــران و هەندێکیشــیان بــران بــۆ بۆ بەندیخانەکانــی کەرکوك و موســل .یەکێك لەو قوربانیانە دوایدوســال لەبەندیخانەی موسل بەمجۆرە هەوالــی خۆیدابو:شــۆفێرێکی تەکســی هەلەبجەیــی بۆیگێرامەوە(نوســەری ئەم بابەتە)کەلەســالی ١٩٨٩ کاتێــك لەئۆردوگــای زۆرە ملێــی (گردەچاڵ)بویــن وبەســەربازی لەموســل دەوامم دەکرد.(پێنج شەممەو هەینی)یەك داپەزینمان هەبو لەگەل هاوەلێکم گەراینەوە هەولێر،بــەلام لەناوبــازاری هەولێــر گیراین چونکە مۆلەتمان پێنەبو،هەرچەند وتمان پێنج شەممەو هەینی پســولەی ناوێت بەلام نەیخوارد و دەســتگیریانکردین و رەوانەی موســلیان کردین لەبەندیخانەیەك بەندییان کردیــن کــە زیندانــی جۆراوجــۆری تێدابو!لەئێمەیان دەپرســی بۆچــی گیراون؟ئێمەش باســی خۆمانمان بۆ کردن،دەنگێــك لەپەنجەرەیەکی بچوکــەوە هات کەدیار بــو بەندیخانــەی تاکەکــەس بو،خۆیمــان نەبینی،وتی بەدەنگتانا دیــارە ئێــوە هەلەبجەیین؟وتــم بەلێ،وتی مــن ناوم(.........)کــوری (...........) ومالمــان لای تەجنیدەکــەوە بــوە لەموزاهەرەکــەدا لــە دەرگــای حەوشەکەی خۆمانەوە ســەرم دەرهێناوە،سەربازەکان لەبەردەرگاکەماندابــون پەخەیان راکێشــام و هێنامیانە دەرەوەو ئەمە دوو ســالە بەبێچ لێپرسینەوە لێرەم،جا داواتــان لێئەکەم ئەگەر بەربون بچنە مالی باوکم وبلێن من مــاوم و لێرەم.ئێمەش هەندێك مــات بوین،زانیمان ئەو بــەوەی نەزانیــوە کــە هەلەبجەکیمیابارانکراوە و شــار وێرانبــوەو خەلــك دەردەبــەر بون،رەنگــە دایــك و باوکی ئەویش نەمابن و شــەهید بوبن.وتمان بەســەرچاو هەوالەکــەت دەگەیەنین..بــەلام بەداخەوە ئەو برا شــۆفێرە نە ناوی ئەو کەسە و نەناوی باوکی بیرنەمابــو کاتێك ئەم بەســەرهاتەی بــۆ گێرامەوە....

**لەرێکەوتنی شومی جەزائیرداهاتبو دەبێت گوندە سنورییەکانی کوردستان راپێچی ئۆردوگا زۆرەملێکان بکرێن**

**بریندارو مورافیقەکانی نەخۆشخانەی هەلەبجە لەپشت معەسکەرەکەزیندەبەچالکران**



ئەکرەم کەریم

## رۆژی یەکەم نزیکەی ٣٠٠ کەس دەستگیرکراو نزیکەی ١٥کەس لەژورێکدابوین

پێش ئەوەی باسی ڕاپەڕینی هەڵەبجە بکەین،ئەوەلای هەمووکەس ڕونەکەدانیشتوای هەڵەبجەبەدرێژایی مێژوی قبوولی ژێردەستەیی وە زوڵمی نەکردووو،هەربۆیە چەندوهاجارتوشی کاول کاری و دەربەدەری و وەکیمیاباران بۆتەوە پیش ١٣ی٥مقۆمقۆی ئەوە هەبوو کەڕاپەڕین بکریت،چونکە حکومەتی بەعس زۆرخراپ ئەزەیەتی دانیشتوانی دەدا،لەوڕۆژەداهاونیشتمانی هەڵەبجەبەهەمووچینوتوێژەکانەوەڕاپەرینی کرد،ڕژیمیش نامەردانەبەهەمووشیوەیەک هاتە دەست بە(مدەرعەودەبابەوە) وهەمووچەکیکی بەکار هێنا ،وەژمارەیەکی زۆریش بریندارهەبو،من خۆم یەکیک بوم لەوبەشداربوانەکەراپەرین،رژیم بەوەیشەوەنەوەستا کۆپتری بەکارهینا،کۆمەلیکی زۆری لی گرتن و شەهید کردن،دواتر جوندیەکی زۆری هینا کە ئەردەنی بوون وەجوندی بسرەو خواری عیراقیان هینابوو بۆکۆنترۆل کردنی وەزعەکە،وەدواتر هەستابە گرتنی هاوڵاتیان کەهەم وچین وتوێژیکی تیدابوو ،من کەگیرام( ٧-٨)کەس بوین،بردنیان بۆقوتابخانەی دواناوەندی کچان سەروبینای قائم قامیەتی ئیستا، بینیم خەڵکانیکی زۆرلەوین تابانگی مغرب بوین بەنزیکەی (٣٠٠)هاوڵاتی وەزیاتر،نزیکەی ١٥نەفەرولەژوریکدابوین،مامەڵەیان سەرەتازۆرخراپ بوو وایان پی ووتبون ئەمانە گەلیکی دورلەخوان ماڵیان بۆئیوە سەریان بۆئیمە،دواچەندرۆژیک کەماینەوە کەبینیان کەئیمە نویژمان دەکرد پییان عەجیب بوو ،نزیکەی ٦ڕۆژماینەوە پییان ووتین یەک فیشەک بتەقێنرێ هەمووتان ڕەمی ئەکەین،وەگوێشمان لەتەقاندنەوەی خانووەکان بوولەگەرەکی کانی عاشقان کەئەیان تەقاندنەوە،من خویندکاربوم لەپولی ١٠ ،وەدوای ئەوچەندرۆژە ناویان خویندینەوەیەک یەک ئازادیان کردین



لەتیف عوسمان عەلی:

## بەعس سەربازی ئەردەنی هێنابو بۆ هەڵەبجە وایتێگەیاندبون کەئەمانە کافرن ودینیان نیە

بەعس سەربازی ئەردەنی هێنابو بۆ هەڵەبجە وای تێگەیاندبون کەئەمانە کافرن و دینیان نیە،هەروەها بەعس بۆ مەرامی سیاسیی خۆی بلنگۆی مزگەوتەکانی لابرد بۆ ئەوەی سەربازەکان گوێیان لەدەنگی بانگ نەبێت وبسەلمێت بۆیان کەئەمانە نوێژ ناکەن،بەلام بەعس ئەیوت بۆیە بڵندگۆی مزگەوتەکانم لابردوە بۆ ئەوەی بۆ ئەوەی بەمەبەستی جاردان بۆ خۆپیشاندان بەکارنەهێنرێن.

خەزورم (بەرەحمەت بێت) وتی:بەیانی بو بانگیدا چوم بۆ مزگەوت،سەربازە ئەردەنیەکان وتبویان بۆ کوێ ئەچیت؟وتبوی بۆ نوێژ ئەرۆم،بەسەرسورمانەوە وتبویان بۆ نوێژ؟ئێوە بێ بروان ،ئێوە کافرن،خەزورم وتبوی:(لاالــه الا الله) ،کافری چی ،ئێمە هەر لەکۆنەوە نوێژ ئەکەین و موسڵمانین..خەزورم وتی:سەربازەکان لەنێوان خۆیاندا بو بەمقۆمقۆیان ،وتیان بەعس ئێمەی فریوداوە هەتا ئەفسەرە ئەردەنیەکە وتبوی ئێستا تێئەگەین حکومەتی بەعس ئێمەی خەڵەتاندوە،تەقە لەکەس نەکەنو کەس نەکوژن،ئەمانە خەڵکێکی موسڵمانن و بەوترس و لەرزەوە ئەچن بۆ نوێژ،وایشبو دوای دوو و سێ رۆژیش گەرانەوە ،بەعس خۆی مزگەوتی ئەروخاندو قورئانی ئەسوتاندو ئەیویست رای گشتی عالەمی واتێبگەیەنێت کە ئەوە کوردە وادەکات،بەعس دەیویست سومعەی کورد بشکێنێت.

**بۆ ئەوەی سەربازەکان گوێیان لەبانگ نەبێت بەعس بڵندگۆی مزگەوتەکانی لابردبو بەڵام دەیوت بۆ ئەوە لابراون بۆ خۆپیشاندان بەکارنەهێنرێن**



جەبار عەلی قادر

## وەزیری ئێستای شەهیدان کاك مەحمود سالح لەگەڵ ئێمە دەستگیر کرا

ئێمە لەئامادەیی پیشەسازی ئاگادارکراین کەراپەرین دەست پێدەکات،وەك گەنجێك بەرێکخراوی کارمان دەکرد،مقۆمقۆی ئەوە پەیدابو کەبرۆین بۆ مەکتەبی شارەزور،ئەوانەی کەهاتن لەگەڵمان،وەزیری ئێستای شەهیدان کاك مەحمودی حاجی سالح بو،دەستگیریش کرا لەگەل ئێمە،لەمەکتەبی شارەزور گەمارۆ دراین لەوکاتەدا لەناوپۆل حەماسەت گرتمی ووتارێکمدا،مامۆستاکانیش خوا هەڵناگرێت پشتیوانیان ئەکرد،بەم دواییانە کوری خولەی سافەم بینی باسی وتارەکەی منی کرد،(من و رەفعەت ئێناخی و عەلی داروتەختەو کاك بەرزان عەبابەیلێیی)بوین لەمعەسکرەکە زیندانیکراین و لەپاش لێدانێکی زۆر ئازادکراین.

من وەك شاهید حالێك کەتەقەمان لەکۆپتەرەکانکرد(ئاسۆی فەتاح تریفەیی،حەمیدی رەشەی حەسەن،ئەنوەری کوێخا،کەمالی رەشەکەچەڵ)کۆمەڵێك بوین لەگەرەکی پیر موحەمەد لەتوەوەشك کۆبوینەوە،یەکەم کەس بوین تەقەمان لەکۆپتەرەکە کرد،کۆپتەرەکە گەرایەوەبۆ سیروان و لەوێوە بۆ کانی عاشقان و کانی عاشقانیش بۆردومانکردو بریندار لێکەوتەوە.

**یەکەم کەسبوین تەقەمان لەکۆپتەرەکەکرد**

# بۆچی هەڵەبجە کراوەتە ئامانج؟



شوان هەورامی

لــە دوو ســەدەی رابــردوودا هەڵەبجە ســەنتەرێکی گرنگی سیاســیی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی باشــووری کوردستان بووە ، لە لایەك پایتەختی پاشاکانی جاف بووە و لە لایەکــی تریش بەهۆی هەڵکەوتــەی جوگرافیەوە ، پێگەیەکی گرنگی کشــتوکاڵیی و ئاژەڵداریی و بازرگانیی بــووە لە نێوان خۆرهەڵات و باشــووری کوردســتاندا ، جگە لەو دوو خاڵەش بــە هۆی بوونی زانایانی گەورە و زانکۆ گرنگەکەی بیارەوە ئەو شارە و دەوروبەری بووەتە سەنتەرێکی گرنگی زانستیی و بە هەزاران زانا و شاعیر و سیاسەتمەداری پەروەردە کردووە . هەر بۆیە گەڕیدە و خۆرهەڵاتناسان و ســیخوڕەکانی خۆرئاواش گرنگیی تایبەتیــان بەم شــارە داوە و لــە کتێب و گەشــتەکانیاندا ئاماژەیان پێداوە ، تا ئێســتاش کاتێ ناوەندە زانستیەکانی خۆرئاوا توێژینەوە لەسەر دیاردە و بابەتێك بڵاو دەکەنەوە ، ناوەندە سیاســییەکانیش گرنگیی پــێ دەدەن ، هەر بۆیە راپۆرت و یاداشتی ئەو کەسانەش کە هاتوونەتە کوردستان بــە گرنگییــەوە بەدواداچوونیان بۆ کــراوە ، بگرە هەر هەمان کاراکتەرەکان بۆ خۆیــان هاتوون بۆ داگیرکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو ناوچانەدا . هەڵەبجە شــاری پێکەوە ژیان و برایەتیی و یەکڕیزیی بووە ، لەو شــارەدا تا سەرەتای پەنجاکانیش لە ســەنتەری شاردا گەڕەکێکی جولەکە نشــینی تێدا بووە و مامەڵەیەکی زۆر برایانەیان لەگەڵــدا کراوە ، لە خۆشــیی و ناخۆشــیەکانیاندا خەڵکی موسوڵمانی شارەکە مامەڵەی جیاوازیان لەگەڵدا نەکردوون ، کاکەییەکان تا ئێستاش لە گوند و گەڕەکەکانی شارەکەدا نیشتەجێن و بە برایەتیی و ئارامیی لەگەڵ برایانی تریاندا پێکــەوە دەژین و خاوەنی ژیان گوزەران و ســرووت و نەریتی خۆیانن . ئێمە ئەگەر بمانەوێت وێنەیەکی روون لە ژیانی سیاســیی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی هەڵەبجە و هەورامان نیشان بدەین ، خوێندنەوەی گەشتەکەی مامۆستا شــاکر فەتاح جوانترین وێنەمان لەو بارەوە نیشان دەدات ، ناوبراو لە ١٦ ی ئابی ١٩٣٣ دا گەشــتێك بۆ هەڵەبجە و هەورامــان دەکات و ئاماژە بە چالاکیی کشــتوکاڵیی و بازرگانیی و زانســتیی شــارەکە دەکات ، بە شــارێکی زینــدووی ناودەبات ، کــە لەو کاتەدا شــارەکە خاوەنی پۆست و تەلەگراف و خوێندنگە و فەرمانگەکانی دەوڵەت دەکات ، ئاماژە بەوە دەکات شــەوانە هەڵکردنی مەکینەی کارەبا و داگیرســاندنی گلۆپ لە لایەن ماڵی " حامید بەگ " ەوە بۆ ئەو ســەردەمە نیشانەیەکی پێشکەوتنی شارەکەیە ، کە لە زۆرێــك لە ناوچەکانی ئەورووپای خۆرئاواشــدا هێشتا کارەبا بەو فراوانیە بۆ هەموان دەستەبەر نەکراوە . ئەوەی جێکەوتە و بەڵگەنەویســتە ئەوەیە ، لە هەر شوێنێ خوێندەواریی و هۆشــیاریی هەبێت ، زیندوێتیی دەبێت و کۆیلایەتیش رەتدەکرێتەوە ، بۆیە لە رووی خەباتەوە هەر لە " داســتانی ئەشــکەوەڵ " ەوە تا خەباتی رووناکبیریی و چەکداریــی ئەحمــەد موختار جــاف و هاوڕێکانیی و دواتریــش خۆپیشــاندانی گەورە لــە دژی رێکەوتنامەی ئیستعماریی " پۆرتسموس " و زیندانیی کرانی رۆڵەکانی ئەو شــارە تا کودەتــای عەبدولکەریم قاســم ، زیندوێتیی سیاســیی ئەو شــارەمان نیشــان دەدات . بوونی چەندان شــاعیری گەورەی وەکو مەولــەوی و تاهیر بەگی جاف و ئەحمەد موختار جاف و گۆران و ... نیشانەی بەرزیی ئاســتیی رووناکبیریی ئەو شــارەن ، ئەمــە جگە لە زانا و رێبــەرە گەورە ئایینییەکان کە جێگە پەنجەیان بەســەر ئاینداریــی و ژیانــی کۆمەڵایەتیی تەواویــی پارچەکانی کوردســتانەوە دیارە . لەوانە شــێخانی بیارە و خوێندنگە ئاست بەرزەکانیان و مزگەوتەکانی هەڵەبجە و عەبابەیلێ و پریــس ، کە بە هەزاران زانایــان پەروەردە کردووە . کە گشــت ئەمانــە لەگەڵ ئەوەی بنکە ئاینیی و زانســتیی بوون ، لە هەمان کاتدا بنکەی سیاسیی و بەرپەرچدانەوەی ســتەمکاریی بوون و هەمیشە رۆڵیی پێشەوایەتییان دیووە بۆ هاندانــی جەماوەر و پێشــڕەوییان لە دژی ســتەم و ستەمکاریی دەسەڵاتی پاشایەتیی و دوای ئەویش کۆماریی .

**گەریدەو خۆرهەڵاتناس وسیخورەکانی رۆژئاوا**

**لەکتێب و گەشتەکانیاندا بایەخی تایپەتیان داوەتە هەڵەبجە**

**دۆسیەی هەڵەبجە دەوڵەمەندترین دۆسیەیە کەهەمو جیهانی سەرسام کردوە**

ئەم هۆکارە راستەوخۆ کاری کردووەتە سەر بۆچوونی سیاســەتمەدارانی هەموو ســەردەمە جیــاوازەکان و بۆ هەمیشە حسابێکی تایبەتیان بۆ ئەو شارە زیندووە کردووە ، بۆیە دەبینین لە دوای ئەوەی سەدان رۆڵەی ئەو شارە لە شۆڕشی ئەیلولدا بەشدارییان کرد ، حکومەتی بەعسیەکان هەروەکو سلێمانیی " زەعیم سدیق "یان ناردە سەر شارەکە و چەندین کەســیان شــەهید کردو چەند گوندێکیشیان لە تۆڵەی شۆڕشدا سوتاند ، دواتریش لە ٢٦ ئازاری ١٩٧٤ دا شــارەکەیان بۆ جارێکی تر خەڵتانی خوێن کردەوە و بە بۆمبــی ناپاڵم و بە فڕۆکەی نوێی رووســیی بۆمبارانیان کــردەوە . گەرچی دوای رێکەوتنامەی ئازاری ١٩٧٥ کورد رووبەڕووی نەهامەتیــی بووەوە ، گەرچیی دەیان خێزانی شارەکە لە تۆڵەی بەشــدارییان لەو شۆڕشەدا بۆ ناوەڕاســت و باشووری عێراق دوور خرانەوە ، بەڵام بۆ جارێکی تر رۆڵەکانی هەڵەبجە لە یەکەمین پێشــمەرگەی مەفرەزە ســەرەتاییەکانی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش بوون لــە دژی داگیرکەرانی بەعس ، جگــە لەوانەش چەندین خۆپیشــاندانیان لــە دژی بە عەرەبی کردنــی خوێندن و ســتەمکارییەکانی تری بەعس بەرپا کرد و لەو پێناوەشدا قوربانیی زۆریان پێشــکەش کرد ، کە بەڕاستیی هەڵەبجە یەکێکە لە ســەخاوەتمەندترین شــارەکانی کوردســتان لە قوربانیدانی لە پێناوی رزگاریی نیشــتمانیی و ئازادییدا .

سەرانســەری دەیــەی هەشــتاکان هەڵەبجــە وەکــو شۆڕشــگێرترین شــاری دژی بەعس بــەردەوام بوو لە خەبات و قوربانیدان ، گەر لە ناوچەیەکی تری کوردستان رژێم ســتەمی لە گەلەکەمان کردبێت هەڵەبجە راپەڕیووە و دەنگی خۆی خستووەتە پاڵ دەنگی ئەوان ، هەر بۆیە لە دوای هێرشی دڕندانەی بەعس بۆ وێرانکردنی پاشماوەی گوند و شارۆچکەکانی کوردستان بە گشتیی و شارەزوور بە تایبەتیی لــە ئایاری ١٩٨٧ دا بۆ جارێکی تر راپەڕیی و جەماوەر توانییان زۆربــەی بنکە و بارەگاکانی بەعس کۆنتــرۆڵ بکەن ، بەڵام بە فەرمانی راســتەوخۆی عەلی کیمیاویی بە دڕندانەترین شــێوە هێرشکرایە سەر خەڵکی شــارەکە و جگــە لە گوللــەبــاران کردنــی بریندار ان و گیراوانــی بەندیخانەکان ، گەڕەکی کانی عاشــقان وەکو هێمای راپەڕینەکە تەقێنرایەوە و لەگەڵ خاکدا یەکسان کرا . ژمارەیەکی زۆر بەهۆی دڕندایەتیی و ســەرکوتکردنی رژێمەوە ئاوارەی ئێران بوون ، بەڵام ســەرەڕای ئەوەش ســەدان لاوی شــارەکە خۆیان لەریزەکانی پێشمەرگەدا رێکخستەوە و رێگەی پڕ لە هەوراز و نشێوی تێکۆشانیان گرتەبەر . لێرەدا ئێمە کە باسی رابردووی پڕ لە خەباتی ئەم شارە دەکەین ، نە مەبەستمان گێڕانەوەی چیرۆکی بەر ئاگردانەو نە مەبەســتمان یادکردنەوەی بێتامی ســاڵانەی یادەکانە ، کە هەڵەبجەییەکان لەم جۆرە یادانە زۆر بێزارن ، پاداشــتی هەڵەبجەییەکان و رابردوویان تەنیا بە سارێژ کردنی بەشــێك لە برینە قووڵەکانیــان دەبێت ، ئەویش بە جێبەجێ کردنی دەیان بڕیار دەبێت کە لە ماوەی ٢٥ ساڵی رابردوودا بۆ شارەکە دراوە و هێشتا هەر مەرەکەبی سەر کاغــەزن ، بە تایبەتیی بڕیاری بــە پارێزگاکردنی کە تا ئێستاش جگە لە بانگەشــەی حیزبیی و شتێکی تر نەبووە ، ئەمە ســەرەڕای ئەوەی بزووتنــەوەی رزگاریخوازی کوردســتان زۆر قەرزداری هەڵەبجەیە ، لە گشــت ئەو بڕیارانەی لەو ماوەیەدا دراون و وەکو مەرەکەبی ســەر کاغــەزن ، خراپتریــن کارنامەی حکومەتــی هەرێمی کوردســتان ئەوەیە ، لە کاتێکدا هەڵەبجە وەکو کەیســێك دەکرێ بکرێتە بناغەی بەدەســتهێنان و پشتیوانیی کۆمەڵی نێودەوڵەتیی لە مافی چارەنووسی گەلەکەمان ، لەو رووەوە هیچ هەنگاوێك بۆ ناســاندنی وەکو جینۆســاید نەکراوە ، ئەمە جگە لەوەی دەکرێ وەکو هۆلۆکۆست بکرێتە بنەمای دادگایی دەیان کۆمپانیا و وڵاتی یارمەتیدەری چەکسازیی کیمیاویــی عێراق و ســەپاندنی قەرەبوو بەســەریاندا ، تەنانەت لەناو عێراقیشــدا کاریان بۆ قەرەبوو کردنەوەی هەڵەبجە نەکردووە - بە تایبەتیی حکومەتی ئێستای عێراق میراتگری حکومەتی پێشــووە و تا ئێســتاش قەرەبووی جەنگی داگیر کردنی کوەیت دەکاتەوە - کەچی لەم رووەوە هیچ کارێکیان نەکــردووە لە کاتێکدا دۆســیەی هەڵەبجە دەوڵەمەندتریــن دۆســیەیە کە هەموو جیهانی سەرســام کردووە ، کەچی لە بەرانبەردا کاری تەواو بۆ دۆسیەی تر دەکات کە ئەگەر بە جینۆسایدیش بناسێنرێت هیچ سوودێکی بــۆ گەلی کورد و خواســتی مافی چارەنووســی نابێت .

# سیانزە ماڵە ئاوەدانکەرەوەی هەڵەبجەن

نیشتمان هەڵەبجەیی

## دەستپێك

ئەم نوسینە باس لە سیانزە ماڵە ناکات وەك مێژووی ئەو بنەماڵەیە، بەڵکو تەنها لێرەدا دەمانەوێت ئەو راستیە بۆ هەموان دووپات بکەینەوە کە زۆربەی زۆری سەرچاوەکان باسیان لە سیانزەماڵە کردووە و کاتێك باس لە مێژووی شاری هەڵەبجە دەکرێت ناتوانرێت باسی سیانزەماڵەی تێدا نەکرێت، کە ئەمەش گرنگێتی و پێگەی ئەم بنەماڵەیە دیاریدەکات، ئێمە لەم باسەماندا تەنها تیشکێك دەخەینە سەر مێژووی ئەم بنەماڵەیە کە ئاوەدانکەرەوەی هەڵەبجەن.

دیمەنی هەڵەبجە

{گردە شارێکی جوان و خۆش بوو، بە چوار مزگەوت دەورە درابوو، لە رۆژهەڵاتەوە مزگەوتی تەکیە، کە لەساڵی ١٧٠٠ز سەید نەسروڵا (باپیری سەید ئەورەحیمی هانەسوورە) دروستی کردووە، لەلای رۆژئاواوە مزگەوتی خانم، کە عادیلەخان دروستیکردووە، لە باکوورەوە مزگەوتی پاشا کە وەسمان پاشا دروستیکردووە، و لە باشورەوە مزگەوتی جامیعە کە (شێخ مستەفای شێخ مەحمودی شێخ عەبدوڵای خەرپانی) لە ساڵی ١٧١٢ز دروستیکردووە، ئەم چوار مزگەوتە کەوتبوونە قەراغ شارەوە و لە پشتیانەوە خانوو و ماڵ نەبوو، یان باخ بوو یان کشتوکاڵ. زۆربەی زۆری ئەو سەرچاوە و کتێبانەی باس لە مێژووی هەڵەبجە دەکەن جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە (سیانزەماڵە) یەکەمین بنەماڵە بوون کە هەڵەبجەیان ئاوەدانکردۆتەوە، ئێمەش بۆ مێژوو باس لە هەندێك لەو سەرچاوانە دەکەین کە سەلمێنەری ئەو راستیەن.

## هەڵەبجەیی رەسەن (ئەسڵی)

نوسەری کتێبی (یادی جارانی هەڵەبجە) ئەحمەد محەمەد ئەمین (ئەحمەد لار) بەم شێوەیە باسی سیانزەماڵە دەکات بە {هەڵەبجەیی رەسەن (سەڵی)} ناویان دەبات و دەڵێت:

{بریتین لە کور و کورەزاکان و نەوەی حەمەچاوەش، کە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٦٥٠ز)، لەو کاتەدا (هەڵۆبەگ) کە بە (شۆرەبەگ)یش ناسرابوو، لە شیوەکەڵەوە هاتووەتە ئەم شوێنە و یەکەمین خانووی لەسەر (کانی نەواڵە) دروستکردووە، حەمەچاوەش کوری ئەم هەڵۆبەگەیە و سێ کوری هەبووە، بە ناوەکانی عەبدوڵا و سلێمان و پیروەیت، پیروەیت مندالی نەبووە، سلێمان چوار کوری هەبووە، بە ناوەکانی (ئەمین، محەمەد، قادر، فەرەج) عەبدوڵا شەش کوری هەبووە، بە ناوەکانی (حەمەساڵح، عەبدولرەحمان، ئەحمەد، مەحمود، سەعید، ئەمین). لەمەوە دەبن بە سیانزەماڵە، و کە دواتریش بەم ناوەوە ناسراون، ئەوانیش بریتین لە کۆمەڵێك مرۆڤی پیاوچاك و ئیشکەر و یارمەتیدەری خەڵکی، ئەوان زۆر بێوەی بوون، نە یەکێکیان کوشتووە، نە ئازاری کەسێکیان داوە و نە دزیان تێدابووە}.

{بە کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریك بوون و کەڵکیان لە ئاوی چەمی کولەبۆز وەرگرتووە بۆ ئاش و بۆ کشتوکاڵ، هەروەها جۆگەی گەورە و بچوکیان هەڵکەندووە بە دەوری خۆیاندا، وەکو جۆگەی مەرەزە، کە لە پردی پیرۆزەوە هەڵگیراوە بەرەو قەسابخانە و دەکەوێتە دامێنی فرۆکەخانەوە، ئاشی (مەحمودی یاروەیس) بەم ئاوە دەگەرا، ئەم جۆگەیە درێژدەبێتەوە تا نزیکی (تۆوشك) و لە لایەن خەڵکی هەڵەبجەوە دەکرا بە مەرەزە}.

{تەنانەت جولەکەکانیش کە دووەمین خەڵکن کە لە ئێرانەوە چەند ماڵێکیان هاتوونەتە هەڵەبجە، لە پاڵ هەڵەبجەییەکاندا (سیانزەماڵە) خانوویان بۆ خۆیان دروستکردووە}.

بەرێز (بەکر حەمە صدیق) لە کتێبەکەیدا (لاپەرەیەك لە مێژووی هەڵەبجە) دەڵێت:

{ریش سپیان و پیاوە دێرینەکانی شار هەندێکیان دەڵێن کە یەکەم خانوو لە هەڵەبجەدا بەگەکانی (شیوەکەڵ) دروستیانکردووە، و پاشان نەوەکانیان لەوێدا نیشتەجێ دەبن، کە ئەمانەن (حەمە چاوەش) و هەرسێ کورەکەی (پیرۆت و (سلێمان) و (عەبدوڵا) و ئەمانیش لەگەڵ خۆیاندا چەند بنەماڵەیەکی تریان دێنن کە ئەمانەبوون (حەمەی پیرۆت) موختاری تورك بووە، (ئەحمەدی پیرۆت) هەروەها (سلێمان)یش کە ئەم منالانەی بووە، (حاجی محەمەد)، (قادر)، (حاجی فەرەج) ، ئەمین) وە (عەبدوڵا) ش ئەم منالانەی بووە (ئەورەحمان)، (ئەحمەد)، (مەحموود) ، (سەعید)، (ئەمین)، (حەمەصاڵح)}.

{بە پێی ئەم بۆچوونە.. یەکەم بنەماڵەیەك هەڵەبجەی دروستکردبێ ئەم ماڵانە بوون کە ئێستا لەناو خەڵکی شاردا بە (١٣) سیانزە ماڵە ناسراون}.

بەرێز (عادل صدیق) نوسەری کتێبی {هەڵەبجە (١٨٨٩-١٩٣٠) لێکوڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسیە} سەبارەت بەوەی کە سیانزەماڵە یەکەم بنەماڵەبوون شاری هەڵەبجەیان ئاوەدانکردۆتەوە دەڵێت:

{شاری هەڵەبجە کە یەکێکە لە شارە کۆنەکانی کوردستان، سەرەتای ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ چەند سەدەیەك لەمەوپێش، هەندێك لە سەرچاوە مێژووییەکان باس لەوە دەکەن کە ئەوانەی ئەم شارەیان ئاوەدانکردۆتەوە لە رۆژهەڵاتی کوردستانەوە هاتوون، لە ئەنجامی شەر و شۆر و برسێتی هاتوون بەمدیودا و لەو شوێنەی کە پێی دەڵێن (هەڵەبجە) نیشتەجێبوون، بۆچوونێکی تر هەیە کە دەڵێت ئەمانە لە ناوچەی شارباژێرەوە هاتوون، نەك لە ناوچەی رۆژهەڵاتی کوردستانەوە، کە پێشتر ئاماژەمان بۆکرد، کە بە بروای ئێمەش ئەم بۆچوونەیان زیاتر لە راستیەوە نزیکترە، ئەم خەڵکانە لەناو خەڵك و شاری هەڵەبجەدا بە بنەماڵەی (سیانزەماڵە) ناسراون، ئەمانە تا رۆژگاری ئەمرۆش بنەچەیان ماوە و پێیان دەڵێن بنەماڵەی (سیانزەماڵە)}.

{پێشتر شوێنی هەڵەبجە ئاوەدانی تێدابوو، پاشان بە هەر هۆکارێك بووبێت ئەو ئاوەدانیەی تێدانەماوە، بەڵام هەڵەبجەی ئێستا سەرەتا لە لایەن (شۆرەبەگ)ەوە کە لە بەگزادەکانی شیوەکەڵ بووە لە ساڵەکانی (١٦٥٠-١٧٠٠ز) سەرلەنوێ ئاوەدانکراوەتەوە، پاش ئەوەی لەگەڵ ژمارەیەك لە کەسوکاریدا بۆ یەکەمجار لەو شوێنەی کە پێی دەوترێت کانی (هەشت هەڵوژە) وەك کۆچەر هەڵیانداوە، دواتر لە دەوروبەری مزگەوتی تەکیەی ئێستا خانوویان دروستکردووە، پاشان چەند ماڵێکی جوولەکەش لە خورماڵەوە هاتوون و لە نزیك ئەمانەوە نیشتەجێ بوون، بە پێی ئەم بۆچوونەش کۆنترین خانووەکانی هەڵەبجە لە دەوروبەری مزگەوتی (تەکیە) دروستکراون}.

ئەمەش بەڵگەیەکی تری مێژووییە کە جولەکەکانیش خانوەکانیان لکاوە بە خانووی هەڵەبجەییەکانەوە (سیانزەماڵە).. دواتر دوای نیشتەجێبوونی هەڵەبجەییەکان و چەند ماڵێکی جولەکە ئینجا جافەکان لەسەردەمی حەمەپاشای جافدا هاتوونەتە هەڵەبجە و تیایدا نیشتەجێ بوون.

{هەروەك پێشتر باسکرا دوای نیشتەجێبوونی ١٣ ماڵە، نزیکەی ٢٠ ماڵە جولەکەی بۆ هاتووە، کە بە تەنیشتی ئەوانەوە خانوویان دروستکردووە، پاشان لە سەردەمی دەسەڵاتی (حەمە پاشای جاف)دا ژمارەیەك ماڵە بەگزادەی جافی تێهاتووە، لەو شوێنەی کە ئێستا پێی دەوترێت (گەرەکی پاشا) رەشماڵیان هەڵداوە و چەند خانوویەکیشیان دروستکردووە، دوای ئەمانیش لە سەردەمی (مەلا عەبدوڵای خەرپانی)دا گەرەکی (پیرمحەمەد) کە ناوەندەکەی مزگەوتی (جامیعە) بووە ئاوەدانکراوەتەوە}.

لە یادی یۆبیلی زیویندا (وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان) نامیلکەیەکی دەرکرد بە ناوی {هەڵەبجە نامە} کە لیژنەی باڵای یادکردنەوەی (٢٥) ساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجە ئامادەیکردبوو... لە لاپەرە یەکدا ئەو راستیە دووپات دەکاتەوە کە سیانزەماڵە هەڵەبجەیان ئاوەدانکردۆتەوە:

{بە پێی هەندێك سەرچاوە و شوێنەواری کۆن وا دەردەکەوێت کە هەڵەبجە لە دێرزەمانەوە مەڵبەندی ژیان بووە، دواجار لە دەوروبەری ساڵی ١٦٥٠ زایینیدا ئاوەدانکراوەتەوە لە لایەن بەگزادەکانی شیوەکەڵەوە کە ئێستا بە سیانزەماڵە ناسراون و وردە وردە گەشەی کردووە و بووە بە شار}.

نوسەری کتێبی (هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا) حەکیمی مەلا ساڵح لە کتێبەکەیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە سیانزەماڵە یەکەمین بنەماڵە بوون کە شاری هەڵەبجەیان ئاوەدانکردۆتەوە و دەڵێت:

{یەکەمین ئاوەدانکردنەوەی هەڵەبجە دوای وێرانکردنی لە دەوروبەری ساڵی ١٦٥٠ز دا لە لایەن بنەماڵەی (حەمەچاوەش) شیوەکەڵیەوە بووە کە خۆی و کور و کورەزاکانی لە ناوچەی خۆیان گرفتێکیان بۆ پێشهاتووە سەری خۆیان هەڵگرتووە و لە هەڵەبجە گیرساونەتەوە}.

{ئیتر ئەم سیانزەماڵە لە دەوروبەری مزگەوتی (تەکیە) دا نیشتەجێ بوون و بۆ خواردنەوە و کشتوکاڵ سوودیان لە سەرچاوەی (کانی نەواڵە) وەرگرتووە، کە ئەو دەمە سەراوێکی گەورە بووە و ئێستە ئەکەوێتە ناو (باخی گشتی) شارەوە، ئەمە جگە لەوەی کە لە جێگەی مزگەوتدا (واتە مزگەوتی تەکیە) کانیەك هەبووە}.

{حەمەی باول کە خۆی لە نەوەی حەمەچاوەشە بە دەماودەم بیستوویەتی و ئەڵا ئەم سیانزەماڵە دەستێکی باڵایان هەبوو لە بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ و باخ و بێستاندا، گەنم و جۆ و چەڵتوکیان چاندووە و داری هەڵوژە و قۆخ و قەیسی و سێو و توویان رواندووە، بەم کارە شوێنەکەیان تەواو بووژاندۆتەوە، دوای ئەم سیانزەماڵە نزیك بە بیست ماڵە جولەکەی تێهاتووە، کە بە تەنیشتی ئەوانەوە ماڵیان دروستکردووە، پاشان لە سەردەمی دەسەڵاتی (محەمەد پاشای جاف)دا ژمارەیەك ماڵە بەگزادەی جافی تێهاتووە و لە شوێنی خۆیاندا کە ئێستەش پێی ئەگوترێ (گەرەی پاشا) رەشمالیان هەڵداوە و چەند ماڵێکیشیان دروستکردووە، دوای ئەمانە لە سەردەمی ژیانی مەلا عەبدوڵای خەرپانیدا گەرەی (پیر محەمەد)یش کە ناوەندەکەی (مزگەوتی جامیعە) بووە ئاوەدان ئەکرێتەوە. ئیتر وردەوردە خەڵکی دەوروبەر رووی تێ ئەکەن و گەورە ئەبێت}.

نوسەری کتێبی (کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە بەهاری ١٩٨٨) شەوکەتی حاجی موشیر لە کتێبەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات کە هەڵەبجە لە لایەن سیانزەماڵەوە ئاوەدانکراوەتەوە و لە باسی ناوی هەڵەبجە لە چیەوە هاتووە دەڵێت:

{سەرچاوەیەکی تر دەڵێت: لە ناو بەگزادەکانی (شیوەکەڵ)ەوە کابرایەك هاتووە و هەڵەبجەی ئاوەدانکردۆتەوە کە (حەمەچاوەش) وە هەرسێ کورەکەی ( پیرۆت و سلێمان و عەوڵا) لەوانەش چەند کور و کورەزا بووەتەوە کە بوون بە سیانزەماڵەی هەڵەبجە و تا ئێستاش بنەماڵەکەیان لە هەڵەبجەدا بە ١٣ ماڵە ناسراون}.

## سەرچاوەکان:


١- یادی هەڵەبجەی جاران- نوسینی: ئەحمەد محەمەد ئەمین (ئەحمەد لار)- ٢٠٠٩ز- چاپخانەی کاروخ.

٢- بەکر حەمەصدیق- لاپەرەیەك لە مێژووی هەڵەبجە(١٧٠٠-١٩٥٨)-چاپی یەکەم- ١٩٩٧ز-

٣- هەڵەبجە (١٨٨٩-١٩٣٠) لێکوڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسیە- عادل صدیق- چاپی یەکەم ٢٠٠٨-

٤ - گۆران هەڵەبجەیی- هەڵەبجە و کارەسات- گۆڤاری پەیڤ- ژ: (١٠ و ١١) ١٩٨٩ز-.

٥- هەڵەبجە نامە- ئامادەکردنی لیژنەی باڵای یادکردنەوەی (٢٥) ساڵیادی کیمیابارنی هەڵەبجە- یۆبیلی زیوین- ٢٠١٣ز- بە هەرسێ زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی-.

٦- حەکیم مەلا ساڵح- هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا- بەرگی یەکەم . چاپی یەکەم- ٢٠٠٤ز-.

٧- شەوکەت حاجی موشیر- کارەساتی کیمیابارنی هەڵەبجە بەهاری ١٩٧٧- چاپی یەکەم- ١٩٩٨-.

هەڵەبجە نیوز
لەهەڵەبجەدەردەچێت
ساڵی یەکەم ژمارە(٣)١٣ی٥ی٢٠١٦
موبایل:٠٧٥٠٨٣٥٤٦٠٦ :
فەیسبوک:حلبجە نیوز

دواڵاپەرە

## تیپی مۆسیقای شەم-ی هەڵەبجە

ئەم تیپە لە سەر دەستی عومەر حەمەڕەحیم ماچۆ ناسراو بە دانا هەڵەبجەیی، دەمەزرا، لە ساڵی ١٩٨٣ وە، توانی لە خوێندکاری خولەکان و چەند هونەرمەندێکی دیکە، تیپی مۆسیقای شەم دامەزرێنن. مامۆستا هەڵکەوت ئەحمەد و مامۆستا حیکمەت تۆفیق و دانا هەڵەبجەیی وەک مامۆستایەکی مۆسیقا رۆڵی سەرەکییان هەبوو لە پێگەیاندنی خوێندکارانی خولەکانی مۆسیقای ئەم تیپە.لە سەرەتای کارەکانیان لە چالاکی مەڵبەندی ڕۆشنبیریی و لاوان دەستبەکار بوون، پاشان لە ئاهەنگەکانی نەورۆز و سەری ساڵ لە هەڵەبجە و سلێمانی بەشداریان کرد، وە لە ساڵی ١٩٨٦ بە دواوە بەشداریان لە چەند فیستیڤاڵێکدا کرد. دوا چالاکیان زستانی ساڵی ١٩٨٧ بوو، کە بریتی بوو لە ئاهەنگێکی مۆسیقا و گۆرانی،کە جگە لە تیپی رۆژهەڵاتی توانیان بۆ یەکەم جارلە هەڵەبجە وەک تیپێکی جازی ڕۆژئاوایی بەرهەمی مۆسیقا و گۆرانی بۆ ماوەی ٤ ڕۆژ پیشکەش بکەن، لە هۆڵی ڕۆشنبیریی هەڵەبجە.



## وتەیەکی پێویست

دەرکردنی سێ ژمارەی بڵاوکراوەی هەڵەبجە نیوز و لە سێ بۆنەی جیاوازدا ئەگەر هاوکاری دڵسۆزانەی ئێوەی خۆشەویست نەبوایە هەرگیز نەدەهاتە بەرهەم،هەرگیز ناتوانین هاوکاری ئێوە لەبیربکەین بۆیە جگە لە دەستخۆشی و سوپاسی گەرم و دەستگوشینمان بۆ ئێوە شتێکی ترمان لانیە،ئێوە کە لەناوەوە و دەرەوەی وڵات لە هەڵەبجە و دەرەوەی هەڵەبجە هاوکاری تەواوتان کردین و ئامادەیی هاوکاریتان دەربری،شایانی ڕێزو خۆشەویستی گەورەن وپێتان ئەڵێین:دەستانخۆش وماڵتان ئاوا.
هەڵەبجە نیوز.

# باڵادەستی کارەکتەرە ئاینیەکان لە ڕاپەڕینی ١٩٨٧دا

## "مۆدێلێکی دی لە بەشداری فەزای گشتی"

ئارام عەلی سەعید



ئاکرێت راپەرینی سیازدەی ئایاری ١٩٨٧و دەرهاویشتەکانی لە رۆژانی دواتری هەڵەبجەو هەورامان و شارەزوور لە دەرەوەی کۆی ئەو شۆرش و بەرخودان و بزووتنەوە بەرگرییانە ببینین کە لە باشور دژی رژێمی بەعس روویان دەدا هاوشێوەی شوێنەکانی، ئەشێت ئەمەش وەك حەلقەیەك لەو زنجیرە پێکەوە گرێدراوانە دابنرێت کە خەلکی کوردستان دەرەتانی قبولکردنی مۆدێلی ئیستبدادی و چەوساندنەوەی نەتەوەییان لەژێر ناونیشانی جیاوازدا رەت دەکردەوە.

بەلام دەکرێت قسە لەسەر دیوێکی تری حزورو واقعیەتی بالادستی کاریگەرییە بابەتی و خودیپەکانی دی لەم راپەرینەدا بکرێت، چونکە لەناو رووداوو تەواوی هەموو راپەرین و شۆرشانە خەسلەت و تایبەتمەندی دی لە زەمین و زەمانی مێژووی سیاسی کورددا بەرجەستە بووە، یاخود بالادەستییەکی جودا هێلی جیاکەرەوەیان بووە لە یەکدی، هەلبەت یەك گوتارو جەوهەرو نێوەرۆك ماناو ئیلهام بەخشیان بووە، ئەویش بریتی بووە لە وەلامدانەوەی سەرکوتکاری و زمانی توندوتیژی و پرۆتستۆکردنی خۆسەپێنی بە رێگای جیاواز، هاوکات بکەرەکانیشیان پالنەرێکی جودای فیکریی و دنیابینیەك ئاراستەی کردوون بۆ رۆل بینین لەناو رووداوەکاندا، ئیدی فیکری نەتەوەیی یان ئاینی یان چەپ و سۆسیالیزمی یاخود عەقلانیەت و رۆشنگەری بووبێت، بۆیە راپەرینی ئایاری ١٩٨٧ی شارەزوور هەلگری هەمان ماناو ناواخنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بوو ،بەلام بە سیماو تایبەتمەندییەکی نوێ لە پەنجا سالی دوایيدا لەدەرەوەی تام و بۆنی "ناسیۆنالیزمی کوردی بەتەنها "کە هێلی هاوبەش و دروشمی یەکبوونی نێوان حزب و رێکخراوەکانی کوردستان بوو، لەم ساتەوەختە "مەلا" یان کارەکتەرە ئاینییەکان رۆلیان بینی لە خرۆشان و ختوکەدان و جۆشدانی جەماوەر، هاوکات وەزیفەی دین و بالادەستی رۆحی ئیسلامی لەم سنورە خەریتەیەکی نوێی کێشا لە فراوانبوونی بازنەی شۆرش و گیانی رووبەرووبوونەوە بەرامبەر لەشکری چەندسالەی بەعس، بۆیە گەر بگەرێینەوە بۆناو رووداوو پالنەرە فیکری و هەژموونە رۆحیەکانی هەلایسانی راپەرین و نارەزایەتیە دەستەجەمعیەکان ئەوا لەم دواییانەدا دابرانێك بەدی دەکرێت لە فاکتەرو کەرەستەکانی کەینونەی راپەرین و شۆرشەکان، بە ئاورێك لە مێژووی رابردوو لە پاش رووخانی دواپین میرنشینی کوردی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەو کۆتایی هاتن بە سیستمی میرایەتی و ئیمارەتنشینی کە هێواش هێواش شۆرش و راپەرین و مەیلی کۆکردنەوەی هێز لای سەرۆك خێل و عەشیرەت و پیاوانی ئاینی چەکەرەی کرد، خانەقاو تەکیەو نێوەندە ئاینییەکان بوونە فەزای گشتی و مەکۆی کۆبوونەوەی قۆناغێکی نوێ لە بەرگری و شکلگرتنی بزووتنەوەی چەکداری دژی دەسەلاتە پاوانخوازەکانی ناوچەکە بەتایبەتی قاجاری و عوسمانی، بۆیەسومبول و سورگەو پالنەرەکانیش لە زۆربەی هەریەك لەو شۆرشانە بالادەستی هەژموون و دەسەلاتی رۆحی خانەدان و فیودال و کاپیتالەکان حزوری هەبوو، لە شۆرشی شێخ عوبەیدوللای نەهرییەوە١٨٨١ز تاشێخ سەعیدی پیران ١٩٢٥ز و سەید رەزای دەرسیمی ١٩٣٧ز و مەلیك مەحمود١٩١٩ز و شۆرشەکانی بارزان ١٩٣١ز و تا بە کۆماری کوردستان دەگات لە ١٩٤٦ز دەف و دایەرەی شێخ و مورێدو مەنسوبەکان جێکەوتیان بە رووداوەکانەوە دیاربووە، لێرەوە چەمکی"شۆرش" و"راپەرین" لە ترادسیۆنی رابردووی کورددا دابراونەبووە لە نەزعەو کارکردی هەژموونگەرایی و ئامادەگی دەسەلاتی رۆحی و پالنەرە ئاینیەکان، بەداخەوە لەژێر باری ئەو پەرچەکردارەی ئەم دواییەی ناسیۆنالیزمی کوردی بۆی دروست بووبوو بەرامبەر دەسەلاتە پاوانخوازەکانی ناوچەکە هەمیشە لە هەولی پەراوێزخستن و نادیدەگرتنی ئەم واقیعانەی ناو مێژووی کورددا بوون کە بمانەوێ و نەمانەوێ بەشێك بوون لە رابردوومان و پێکهێنەرو سترەکتوری مێژووییمان بوون، لەسەرودەمی شۆرش و راپەرینەکانی کورد کۆنسولخانەکانی ولاتانی خۆرئاواو راپۆرتی مسیۆنێرو تۆمارنامەی کوردناس و یاداشتی گەریدەکان حەقیقەتی ئەمانەیان سەلمادووە بە تەواوی وردەکاری و زانیارییەکانەوە، کەواتە ئەمە بۆ قۆناغەکانی دواتروئێستاش هەر راستە.

لێرەوە لە راپەرینی ١٩٨٧ی شارەزوور" لە زۆربەی شارەکانی سەیدصادق و هەلەبجەو سیروان و خورمال بەشێك لە مزگەوتەکان بوونە سەنتەرو مەکۆی هاندان و موخاتەبەی خەلکی ناوچەکە بۆ راپەرین، راستە هەندێك کەرەستەو پاساوی دەزگا سەرکوتکارەکان رقی هاولاتیانی گەیاندە لوتکە، بەلام بلندگۆی مزگەوت و رابەرایەتیکردنی مەلاکان لە سنورەکە جیاواز لە رابردوو شوناسێکی دی بوو لە هەیەجانی جەماوەری و هاتنە ناو فەزای گشتی و تەرجەمەکردنی بەشێك لە وەزیفەی دین بۆناو واقعیەت و زەمینەی گۆرانکارییەکان و ئەزموونکردنیان بەشێوازێکی کردەیی، رۆل بینینی بنەمالە دیارە ئاینیەکانی هەلەبجە و شارەزوور کە مێژوویەکیان هەبوو لە پەروەردەی ناو حوجرەکان و نوێکردنەوەی شێوازی دینداریکردن لە فۆرمێکی جیاوازتردا لە دەرەوەی مۆدێلە میللیەکە بەشێکی کاریگەربوو لە زەمینەی پێشوەختەی هۆکارەکانی راپەرین و کۆچی فراوانی هەندێ لەزاناو مەلائاینیەکان وگەنجەکانی ناوچەکە لەوسالانەدا و بەجێهێشتنی سنورەکە بەرەو ولاتانی دراوسێ، فەتواکانی زانایانی ئاینی بۆ قبولنەکردنی ژێردەستەیی و راگرتنی عەقلیەتی سەرکوتکاری داینەمۆی رووبەرێکی فراوان بوو لە رق و تورەیی خەلکی ناوچەکە لە هەلەبجەو دەوروبەری، هاوکات بەشداریکردنی مەیدانیانەیان لەرێگای بلندگۆی سەنتەری مزکەوتەکانی شارەکان و تێکەلبوونیان بە گەنجەکان لەو کەرەستە بەهێزانەبوون کە نەخشیان هەبوو لە بریاری گشتی و حزورێکی نوێ لەناو نووسینەوەو بە کردەییکردنی وەزیفەو رۆلی دین و هەژموون و بالادەستی رۆحی لە بەگژاچوونەوەی ستەمدا شانبەشانی هێزە نیشتمانی و نەتەوەییەکانی تر.

خوێنکاری ماستەر لەمێژوو

# هەڵەبجە نیوز
Halabja News

بایەخ بەکاروباری پارێزگای هەڵەبجەدەدات
ژمارە(٤)
تەمموزی٢٠١٦
خاوەن ئیمتیازوسەرنوسەر
سەلاح سەعید ئەمین


# لەچاوەڕوانی پێکهێنانی یەکەم حکومەتی خۆجێی هەڵەبجەدا

## نابێت هەڵەبجە بکرێتە قوربانی کێشە سیاسیەکان

هەڵەبجە نیوز:تایبەت

یەحیا نەوزەر جاف کاندیدی یەکگرتوی ئیسلامی بۆ ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە ،لەلێدوانێکدا بەهەڵەبجە نیوزی راگەیاند: کێشە سیاسیەکان کاریگەری سەرەکیان هەیە لەسەرپێکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجەو نابێت هەڵەبجە بکرێتە قوربانی کێشەسیاسیەکان، ئەم کاندیدە لەچەند خالێکدا ئاماژە بەمەسەلەی پێکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە دەکات و دەڵێت: پێویست بوو ئەنجومەنی پارێزگا پێش هەموو شتێك دابمەزرایە،پێش پارێزگاریش بەڵام بەداخەوە هەڵەبجە کرایە پاشکۆی رێککەوتنی پارێزگاری سلێمانی نێوان یەکێتی و گۆران ،رادەستکردنی ناوەکان بووە هۆی دواکەوتنی نزیکەی ساڵێك بەتایبەت هەرسێ لایەنی پارتی و کومەڵ و گۆران....

...زیاتر ل٣


کاتی واژۆکردنی بریاری بەپارێزگابونی هەڵەبجە

## گۆران و یەکێتی لە هەڵەبجە دەبنە زۆرینە

رۆژ نیوز:هاوکارمستەفا

لەگەڵ ئەوەی لایەنە سیاسیەکانی هەڵەبجە لەبارەی دابەشکردنی پۆستە ئیداریەکان و کورسیەکانی ئەنجومەنی پارێزگا رێککەوتوون، بەلام بەرپرسێکی بزوتنەوەی گۆران ئاماژە بەوەدەکات پێکهێنانی فراکسیۆنی هیوا نابێتە هۆی هەلوەشانەوەی ئەو رێککەوتنە.بەگوێرەی رێککەوتنی لایەنەسیاسیەکانی هەلەبجە بەدەر لە پارتی دیموکراتی کوردستان، کە رێککەوتنەکەی واژۆ نەکردووە بۆ دابەشکردنی کورسیەکانی ئەنجومەنی پارێزگا لەکۆی ٢٥ کورسی یەکێتی شەش کورسی گۆران پێنج کورسی خزمەت حەوت کورسی پارتی سێ کورسی بزوتنەوە دوو کورسی حزبی شیوعی یەك کورسی کاکەییەکانیش یەك کورسیان بەردەکەوێت ....زیاترل٣

## بەرپرسانی ئێران بەڵێنی تاوتوێکردنیانداوە

# دۆسیەی منداڵە ونبوەکانی هەڵەبجە دەبرێتە پەرلەمانی ئێران

رۆژنیوز

لە ماوەی رابردوودا شاندێکی پارێزگای هەڵەبجە سەردانی ئێرانیان کرد بەمەبەستی گەران بەدوای دۆزینەوەی منداڵە ونبوەکاندا، سەرۆکی کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە لەمەر سەردانەکەیان ئاشکرایکرد کە دوای سەردانەکە بەرپرسانی ئێرانی بەلینیان پێداوین لە پەرلەمانی ولاتەکەیان ئەو پرسە تاوتوێ بکەن

لوقمان عەبدولقادر، سەرۆکی کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە بە رۆژنیوزی راگەیاند:" دوای ئەوەی لە چەند رۆژی رابردوودا شاندێك لەپارێزگای هەڵەبجەوە سەردانی ئێران - مانکرد بەمەبەستی گفتوگۆکردن لەگەڵ بەرپرسانی باڵای ئێرانی و لایەنە پەیوەندیدارەکانی ولاتەکە لەسەر پرسی منداڵە ونبوەکان، لەگەڵ سەرۆکی ئەنجومەنی پەرلەمانی ئێران کۆبوینەوە و داوامان لێکردن هاوشێوەی کۆنفرانسێك دانیشتێکی تایبەت لەو بارەیەوە ئەنجام بدرێت «.لوقمان عەبدولقادر، وتیشی: لایەنی ئێرانی بە داواکانی ئێمە رازیبون بەڵێنیان پێداین کە دانیشتن بکەن و داوایان لێکردین هەفتەیەك پێش ئەوە ئاگاداریان بکەینەوە بۆئەوەی ئامادەکاری بکەن بۆ ئەو دانیشتنە و لایەنە پەیوەندیدارەکانی تایبەت بەو پرسە بانگهێشتی ئەو کۆبونەوەیە بکەن لە پەرلەمانی ئێران و لەگەڵیان کۆببینەوە.سەرۆکی کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە، وتیشی :" هەر لەو سەردانەماندا ژمارەیەکی دیکەی منداڵی ونبوی هەڵەبجەیی پەیوەندییان پێوەکردوین و چاویشمان بەژمارەیەکی دیکەش کەوتووە «لە ئێستادا ١٢ منداڵی ونبوی هەڵەبجە دۆزراونەتەوە، بەڵام تا ئێستا چارەنوسی ئەو منداڵانە یەکلایی نەبۆتەوە بریاریشە لەسەنتەرێکی بەریتانی پشکنینی (DNA) یان بۆ ئەنجامبدرێت.

## کێشەی زەویی

## جووتیارانی شارەزوور و هەڵەبجە چارەسەردەکرێت

وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاوی حکومەتی هەرێمی کوردستان رایدەگەیەنێت:"کێشەی جوتیارانی سنووری هەڵەبجەو شارەزووریان چارەسەرکردووە، بۆ ئەو مەبەستەش لیژنەی بەدواداچوون و چارەسەری کێشەکانی جوتیاران بەسەرۆکایەتی عەبدولستار مەجید وەزیری کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو لەگەڵ ژمارەیەك جوتیار و وەبرهێنی کشتوکاڵیی کۆبوەوەبێتەوە" .

لەکۆبوونەوەکەدا وەزیری کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو گوێی لە ژمارەیەك لە خاوەن کێشەکان گرت، کە هەندێکیان پەیوەست بوون بە کێشەی زەوییەکانی جووتیاران کە بەر ماستەرپلانی شارەوانی کەوتوون، لەوانە ئەو زەویانەی کە کاتی خۆی لە هەڵەبجەو سیروان و سەید سادق لەلایەن شارەوانییە ئەو شوێنانە دەستیان بەسەرداگیرابوو، بەڵام لە سەردانی ئەم دواییەی وەزیر جەختی کردبۆوە کە دەبێت وەك مولکی کشتوکاڵی بۆ جووتیارانی ئەو ناوچانە بگەڕێندرێنەوە.

هەروەها: لە کۆبوونەوەکەدا وەزیری کشتوکاڵ رایگەیاند:"دوای گفتوگۆکردن و تەئکیدکردن و بەدواداچوونی کێشەکە بەرەو چارەسەر دەچێت و مولکەکان بۆ جووتیاران دەگەڕێنەوە".

هەر لەو کۆبوونەوەیەدا گوێی لە کێشەی چەند کەسێك گرت کە لە هەندێ ناوچە داوای قەرەبوو دەکەنەوە لەبەر ئەوەی بە هەمان شێوە زەوییەکانیان بەر سنووری شارەوانی کەوتووە.

عەبدولستار مەجید:" وەزیری کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو جارێکی دیکە جەختی کردەوە کە وەزارەت بەردەوامە لە بەدواداچوونی ورد بۆ داخوازی و کێشەکان و چەندین کێشەی دیکە چارەسەری گونجاویان بۆ دەست نیشان کرا".

سەرچاوە: Bmctv.net

## وەفدێکی ئەنجومەنی وەزیران

## سەردانی پارێزگای هەڵەبجەی کرد

وەفدێکی ئەنجومەنی وەزیران کە بریتی بوو لە نوێنەری سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و وەزارەتی دارایی لەسەر فەرمانی قوباد تالەبانی جێگری سەرۆکی حکومەت، سەردانی پارێزگای هەڵەبجەی کردو لەگەڵ پارێزگار و جێگری پارێزگار و ئیدارەی هەڵەبجە کۆبوونەوە.

دکۆبوونەوەیەکدا بەوردی تیشك خرایە سەر کێشەو گرفتەکانی هەڵەبجە لەدوای بەپارێزگابوون.

وەفدەکە پێکهاتبوون لەهەریەك لەبەڕێزان د.ئامانج رەحیم سکرتێری ئەنجومەنی وەزیران و خالید شێخ سدیق راوێژکاری یاسایی ئەنجومەنی وەزیران، نەوروز قازی سەرۆکی فەرمانگەی یاسایی لە ئەنجومەنی وەزیران، مامۆستا ئەژی راوێژکاری جێگری سەرۆکی حکومەت، حاجی ئەمین جێگری سەرۆکی فەرمانگەی یاسایی و مامۆستا جەلال کەریم نوێنەری وەزارەتی دارایی.

سایتی پارێزگای هەڵەبجە

## ئاگاداریيەک لەهەڵەبجەنیوزەوە

بۆ ئەو بەرێزانەی بابەت دەنێرن:

یەک: بابەتەکانتان تایبەت بن بە بەپارێزگای هەڵەبجە

دوو: لە ٧٠٠ وشە زیاتر نەبن

سێ: هەربابەتێک بلاونەکرێتەوە ناگەرێنرێتەوە بۆخاوەنەکەی

چوار: بابەتەکانتان تایپکراوبن .

پێنج: وێنەو ناونیشان و ناوی تەواوی لەگەڵ بێت لەگەڵ رێزدا



## بێ کۆمێنت

لەفەیسبوکەوە

شەقامی گشتی هەڵەبجە نزیک سەرۆکایەتی شارەوانی



یەحیا نەوزەر جاف،کاندیدی یەکگرتو بۆ ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە:

# نابێت هەڵەبجە بکرێتە قوربانی کێشە سیاسیەکان

هەڵەبجە نیوز:تایبەت

یەحیا نەوزەر جاف کاندیدی یەکگرتوی ئیسلامی بۆ ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە ،لەلێدوانێکدا بەهەڵەبجە نیوزی گوت:کێشە سیاسیەکان کاریگەری سەرەکیان هەیە لەسە رپێکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجەو نابێت هەڵەبجە بکرێتە قوربانی کێشەسیاسیەکان، ئەم کاندیدە لەچەند خاڵێکدا ئاماژە بەمەسەلەی پێچکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە دەکات و دەڵێت:

یەکەم ــ پێویست بوو ئەنجومەنی پارێزگا پێش هەموو شتێک دابمەزرایە

پێش پارێزگاریش بەڵام بەداخەوە هەڵەبجە کرایە پاشکۆی رێککەوتنی پارێزگاری سلێمانی نێوان یەکیەتی و گۆران

دووەم ــ دواتر هێزەکان رێککەوتن لەسەر دابەشکردنی ئەنجومەنی پارێزگا لەسەر بنەمای دەرئەنجامی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگا

بەڵام دواتر رادەستکردنی ناوەکان دواکەوت دوای چەند دانیشتنێک رادەستکردنی ناوەکان بووە هۆی دواکەوتنی نزیکەی ساڵێک بەتایبەت هەرسێ هێزی پارتی و کۆمەڵ و گۆران

سێیەم ــ دواجار کاندیدانی یەکگرتوو بۆ ئەنجومەنی پارێزگا ناچاربوین کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی ببەستین و دواکەوتنی ئەنجومەنەکە لەئەستۆی خۆمان وەدوور خەین ئەمەش فشارێکی سیاسی و جەماوەری دروست کرد بەجۆرێک هێزەکانی تر جگە لەپارتی ناچاربوون ناوەکان رادەست بکەن

دەبو هەڵەبجە لەدەرەوەی

هەمو کێشەکان هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرایە

دەبو ئەنجومەنی پارێزگا پێش پارێزگاریش دابمەزرایە

چوارەم ــ ئێستا پارێزگاری هەڵەبجە ناوەکانی ناردووە بۆ وەزارەتی ناوخۆ بۆ ئەوەی بەفەرمانێک دەست بەکاربونی ئەنجومەنەکە راگەیەنن و لەوێ راگیراوە پێنجەم ــ بەداخەوە بەپارێزگا بونی هەڵەبجە کەوتە دۆخێکی سیاسی و ئابوریەوە کەهێشتا هەنگاوەکانی بەپارێزگابونی تەواو نەبون و لەهەموی ناشیرینتر بێباکی هێزەکانە بەرامبەر و کردنی بەبەشێک لەململانێ ناشیرینەکانی نێوخۆ،یەحیا نەوزەر،ئەوەشیگوت:

ئەنجومەنی پارێزگا هەنگاوێکی بەپارێزگابونە و نەک عەسای سیحری بەدەست بەاربونی کێشەکانی هەڵەبجە کۆتایی نایەت بەڵام یەکێ لەهەنگاوسەرەکیەکانی بەپارێزگابونی جێبەجێدەکرێت کە ئەوەندەدواکەوتووە ئەترسم کاتێک بێتە پایان بون و نەبونی یەکسان بێت

ئەم کاندیدە،ئەوەشیگوت: شەرمەزاریە بۆ هەموولایەک بەتایبەت ئەوانەی بونە هۆی دواکەوتنی و راگرتنی تا ئێستا منیش بەش بەحالی خۆم شەرمەزارم وەک یەکێک لەکاندیدانی ئەو ئەنجومەنە کە ئەوەی نیەتمان بوو بتوانین خزمەتێک بکەین بە بناغەی بەپارێزگابونی هەڵەبجە لەرێگەی شەرەفی ئەندام بون لەیەکەمین ئەنجومەنی پارێزگایدا نەیانهێشتووە تا ئێستە دست بەکاربین،تاچەند گەشبینەبەوەی بەم زوانە ئەنجومەنەکە پێبیکبێت:کاندیدەکەی یەکگرتو دەڵێت:

بەدڵنیاییەوە کێشە سیاسی و حزبیە تەسکەکان کاریگەری سەرەکی هەیە کە دەبوو هەڵەبجە لەدەرەوەی هەموو کێشەکان هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرایە

بەم عەقڵیەتە حزبیە تەسکەوە چاوەرێ ناکرێت بەمزوانە واژووی بکرێت کە هیوادارم هەڵەبم

# گۆڕان و یەکێتی لە هەڵەبجە دەبنە زۆرینە

رۆژنیوز -هاوکار مستەفا

لەگەڵ ئەوەی لایەنە سیاسیەکانی هەڵەبجە لەبارەی دابەشکردنی پۆستە ئیداریەکان و کورسیەکانی ئەنجومەنی پارێزگا رێککەوتوون، بەڵام بەرپرسێکی بزوتنەوەی گۆران ئاماژە بەوەدەکات پێکهێنانی فراکسیۆنی هیوا نابێتە هۆی هەڵوەشانەوەی ئەو رێککەوتنە.

بەگوێرەی رێککەوتنی لایەنە سیاسیەکانی هەڵەبجە بەدەر لە پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، کە رێککەوتنەکەی واژۆ نەکردووە بۆ دابەشکردنی کورسیەکانی ئەنجومەنی پارێزگا لەکۆی ٢٥ کورسی یەکێتی نشمانی کوردستان شەش کورسی بزوتنەوەی گۆران پێنج کورسی لستی خزمەت حەوت کورسی پارتی سێ کورسی بزوتنەوە دوو کورسی حزبی شیوعی یەک کورسی کاکەییەکانیش یەک کورسیان بەردەکەوێت .هەڵەبجەڤاتی گشتی بزوتنەوەی گۆران بۆ رۆژنیوز وتی:" پێکهێنانی فراکسیۆنی هیوا ژمارەی کورسیەکانمان لە ئەنجومەنی پارێزگا دەبێتە ١١ کورسی لە کۆی ٢٥ کورسی بەوەش دەبینە گەورەترین فراکسیۆن بەڵام ئەوەش ناکەینە پێوەر بۆ پێکهێنانی حکومەتی خۆجێی بەڵکو رێز لەورێککەوتنە دەگرین کە لە نێوان ئێمە و لایەنە سیاسیەکانی دیکە واژۆی لەسەر کراوە لەبارەی دابەشکردنی پۆستە ئیداریەکانی پارێزگای هەڵەبجە.

رێز لەو رێکەوتنە دەگرین کەلەنێوان ئێمەو لایەنە سیاسەکاندا واژۆکراوە

وەزیری ناوخۆ نوسراوەکەی پارێزگای هەڵەبجەی رەوانەیئەنجومەنی وەزیران نەکردوە

رونیشکردەوە کە یەکێک لە خاڵەکانی رێککەوتنەکەی ئێمە و یەکێتی پێکهێنانی فراکسیۆنێکی هاوبەشە لە پەرلەمانی عێراق و کوردستان و ئەنجومەنی پارێزگاکان بۆیە لە ئێستادا ئەو خاڵە لە زۆربەی پارێزگاکاندا کەوتوتە بواری جێبەجێکردنەوە و لەپارێزگای هەڵەبجەش دوای دەستبەکاربونی ئەنجومەنی پارێزگا لەگەڵ یەکێتی فراکسیۆنی (هیوا) پێکدەهێنینلە ٢٠١٤/٣/١٣ بریاری بەپارێزگا بوونی هەڵەبجە واژۆی لەسەر کراوە بەڵام تا ئێستا تەنها پارێزگار و دوو جێگرەکەی دەستبەکار بوون، هاوکات لە ئێستاشدا پارێزگاری هەڵەبجە ناوی سەرجەم کاندیدەکانی لایەنە سیاسیەکانی جگە لەپارتی رادەستی وەزارەتی ناوخۆ کردووە بەڵام وەزیری ناوخۆ نوسراوەکەی رەوانەی ئەنجومەنی وەزیران نەکردووە.

# ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە لەژێر سایەی ویژدانی حیزبدا

**درەو مەهدی**

لەدوای کیمیابارانکردنی شارەکەوە، پاش گوزەراندنی بیست و شەش ساڵ تەمەن بە جەستەیەکی بیمارەوە، بە هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆری دڵسۆزانی شار سەرئەنجام

شارەکە لە ١٣ی ئازاری ٢٠١٤ کرا بە پارێزگا.

ئەمە وایکرد خۆشیەکی زۆر برژێتە دڵی زۆرێك لە هاوڵاتیانی شارەوە و چەندین ئاهەنگی شادی بۆ بەرپا بکەن.

دوو هۆکار وایکرد کە ئەم خۆشیە بە دانیشتوانی شار ڕەوا نەبینرێت.

یەکەمیان: ئەوە بوو کە هەرێمی کوردستان پیی نایە دۆخیکی پڕ لە قەیران لە کۆتاییەکانی ٢٠١٤ وە تا ئێستا کە ئەمەش باشترین بەهانە بوو بەدەست حکومەتەوە بۆ ئەوەی هێندیتر ئەم پارێزگا نوێیە پەراوێز بخات.

دووەمیان: پێشێلکردن و هەلاهەلاکردنی یاسا و پرەنسیپەکانی سیاسەتکردن و دەستی دەستی و یاریکردن بە شعوری خەڵك لە لایەن لایەنە سیاسیەکانەوە.

ئەم هۆکارانە وای لە وانەمانکرد کە هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەین لە ئاست شارەکەدا، بێهیواییەکی لوتکەیی روومان تێبکات و بەو هۆیەوە ئیجازە لە شاعیری نوێخوازی سنەیی

«جەلال مەلەکشا» بخوازین و بڵێین:

«ئەڵێم ئەم شارە جێ بێڵم سەفەرکەم

برۆم و خۆم لە ئەحزاب دەربەدەرکەم

بەهاواری دڵ و بارانی دیدەم

لەدەردی حیزب و یاریکرد

بەشار هەموو عالەم خەبەرکەم

حیزبەکان گەلێ پەیمان شکێنن

بلا راکەم لە دەنگ پیدانتان

حەزەرکەمدوای ساڵێك لە بە پارێزگا بوونی شارەکە و کورد واتەنی دوای شەممە لە مانگ برانی حیزب، بەهۆی بێ باکی و گوێ پێنەدانی حکومەتە حیزبییەکەی هەرێمەوە، پارێزگارێك و دوو جێگری لە بینای خێر خوازێکدا دەست بەکار بوون.

خودا هەڵناگرێت ئەوانیش بە مەکر و نازی هەبوونی قەیران و نەبوونی بودجە و موچە " ١ ساڵ «یان بەرێکرد.

**پاش تێپەڕ بوونی ساڵێك بەسەر دەستبەکار بوونی ستافی پارێزگای هەڵەبجەدا هێشتا لە ژێر سایەی ویژدانی حیزبدا ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە دروست نەکراوە!.**

ماوەتەوە سەر دروستکردنی دوو بەشی تری هەیکەلی پارێزگا فەرامۆشکراوەکە، ئەوانیش "ئەنجومەنی پارێزگا" و" بەڕێوەبەرایەتیە گشتیەکان"ن.

گوتاری ئەم دەقە دەربرینی بێزاریەکی لوتکەیی نوسەری دەقەکەیە سەبارەت بە یاریکردنی حیزب بەدەنگی هەزارەها دەنگدەر و هەوادارانی و هاوڵاتی سڤیلی ئەمشارە کە هەندێکیان

بۆ بە پاریزگا بوونی شارەکە قوربانی زۆر گەورەیان داوە.

لەدوای "٢٥» کۆبونەوە لەمانگی ٩ی ٢٠١٥ لایەنە سیاسیەکانی هەڵەبجە پرۆتۆکۆڵێکیان واژۆ کرد کە تا بەرواری «٢٠١٥/١٠/١٠» ناوی کاندیدەکانیان پێشکەش بە لیژنەی پارێزگای هەڵەبجە بکەن.

پاشان لە بەرواری ٢٠١٦/٢/٢٨ پارێزگاری هەڵەبجە وادەی ١٠ رۆژ تا بەرواری»٢٠١٦/٣/٩» ی دیاری کرد کە لایەنە سیاسیەکان ناوی کاندیدەکانیان پێشکەش بکەن و دواتریش ئەوان رەوانەی وەزارەتی ناو خۆی بکەن و دواتر ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە دروست بێت.

دوای ئەم وادەیە لایەنە سیاسیەکان بەردەوام بوون لە یاریکردن بە کات و شعوری دەنگدەرانیان و خەڵکی هەڵەبجە.حیزبی سۆشیالیست لەبەر ئەوەی کە تاکە کورسیەکەیان بە پێی بەرکەوتەی هەڵبژاردنەکانی ٢٠١٤/٤/٣٠ کە کرا بوو بە پێوەر، درا بە حیزبی شیوعی، بریاریدا بە یەکجاری لە پرۆسەکە بێتە دەرەوە.

پارتیش بەبیانوی ئەوەی کە نابێت بەرکەوتەی هەڵبژاردنی ٢٠١٤/٤/٣٠ بکرێتە پێوەرە بۆ دابەشکردنی پۆستەکانی پارێزگاکە بریاریدا کە بەشداری حکومەتی خۆجێی پارێزگای هەڵەبجە نەکات و رایگەیاند «ئەگەر بە پێی رێککەوتنی سیاسی ٤ کورسی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجەمان بەر نەکەوێت ئەوا بەشداری ئەو ئەنجومەنەش ناکەین».

ئەمە لەکاتێکدا کە "یەکێتی و گۆڕان" کە هێزی یەکەم و دووەمی پارێزگاکەن، تا ساتی نوسینی ئەم وتارەش بەڵێنی ئەوەیان پێ نەداوە.

لەگەڵ ئەمانەدا هەموو لایەنە سیاسیەکانی ناو پرۆسەی بە پارێزگا بوونی هەڵەبجە بە ئەنجامدانی ٣٦ کۆبوونەوەی بێ ئەنجام و کوشتنی کاتێکی زۆر تا توانیان دەستی دەستیان بە خەڵکی شار و دەنگدەرانیان و هەموو ئەو چالاکوانی مەدەنی و گروپی فشار و رێکخراوانە کرد کە زۆر لە لایەنەسیاسیەکان ئینێرژیان بۆ بە پارێزگا بوونی شارەکە بەهەدەر داوە.

بەڵام لە ئێستادا بە پلەی یەکەم"گۆران" و بە پلەی دووەم"کۆمەڵ" بوونەتە شۆرە سواری مەیدانەکە بۆ یاریکردن بە کات و خەڵکی هەڵەبجە و ریگرن لە بەردەم لە دایك بوونی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجەدا.نزیکەی ٣ مانگ تێپەریوە بەسەر بەسەر پابەندنەبوونی ئەو دوو لایەنە بە وادەکەی پارێزگاری هەڵەبجەوە بۆ پێشکەشکردنی ناوی کاندیدەکانیان.

ئەوەتا پارێزگاری هەڵەبجە بێ ئومێدانە لە رەفتاری ئەو لایەنانە دەروانێت و لە لێدوانێکیدا لە بەرواری"٢٠١٦/٥/٢» لەسەر ئەو پرسە بۆ ئێن ئار تی دەڵێت:»ئەو لایەنانەی کە ناوی کاندیدەکانیان رادەستی ئێمە ناکەن، بەرپرسیارێتی مێژوویی دەکەوێت سەر شانیان».

لەکاتێکدا لیژنەی پاریزگای هەڵەبجە توشی بێ ئومێدیەکی زۆر بووە لە پابەند نەبووی ئەو دوو لاپەنە بە وادە یاساییەکانی پارێزگاری هەڵەبجە بۆ پێشکەش کردنی ناوی کاندیدەکان، ئیتر بۆ ئێمەی هاوڵاتی جێگەی پرسیارە کە ئەم هەموو خاتر گرتنەی لیژنەی پارێزگا بۆ ئەو دوو لایەنە سیاسیە لە پای چی؟!.

بۆچی لیژنەکەی پارێزگای هەڵەبجە لیستی ناوی کاندیدە پێشکەشکراوەکان رەوانەی وەزارەتی ناو خۆ ناکات بە بێ ئەو دوو لایەنە؟!

پاش تێپەر بوونی ساڵێك بەسەر دەستبەکار بوونی ستافی پارێزگای هەڵەبجەدا هێشتا لە ژێر سایەی ویژدانی حیزبدا ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە دروست نەکراوە!.

ئەی نەبێت وادەی چەند ساڵی تر پۆستی بەرێوەبەرایەتیە گشتیەکانی پارێزگاکە بەپێی ویژدان و میزاجی حیزب یەکلای بکرێتەوە

سایتی:ئێن ئار تیی

# دۆشاوی تەماتەی شارەزوور دەگاتە قامیشلۆ

**ڕۆژنیوز - جیهاد هەورامی**

bmctv

خاوەنی كارگەی دۆشاوی تەماتەی شارەزوور رایدەگەینێت، كە لە ئێستادا بەرهەمەكانیان هەناردەی بازارەكانی هەرێم و خوارووی عێراق و سوریا و رۆژئاوای كوردستان بەتایبەت شاری قامیشلو دەكەین، دەشلێت: لە پلانماندایە ئاستی بەرهەمهێنانمان زیادبكەین و بۆ چەند ولاتێكی تریشی هەناردە بكەین. یەكەمین كارگەی دۆشاوی تەماتە لە هەرێمی كوردستان و عێراق، ماوەی سێ رۆژە لە شاری هەلەبجە بە ئەزموونی كراوەتەوە و رۆژانە ٢٠٠ تۆن بەرهەمی تەماتەی هەلەبجە و شارەزوور و پێنجوێن ساغدەكاتەوە و دواتر لەشێوەی دۆشاوی تەماتە كە رۆژانە بری ٥٠ هەزار قوتوو بەرهەمدێنێت، دەیخاتە بازارەكانی هەرێم. كامەران محەمەد قادر، خاوەنی كارگەی دۆشاوی تەماتەی شارەزور بە رۆژنیوزی راگەیاند:"هەرچەندە لەئێستادا بەشێوەی ئەزمونی كارەگەكەمان خستوەتەكار بەمەبەستی بەهەمهێنانی دۆشاوی تەماتە، بەلام لە پلانماندایە لە داهاتویەكی نزیكدا بەفەرمی دەستبەكار بین و ئاستی بەرهەمهێنانمان زیادتر بكەین و هەناردەی بازاری بكەین».

وتیشی:" لەئێستادا گرێبەستمان واژۆكردووە بۆئەوەی بەرهەمی دۆشاوی تەماتە هەناردەی سلێمانی، هەولێر، بەغدا، شارەكانی خوارووی عێراق و رۆژئاوای كوردستان بەتایبەت قامیشلۆ بكەین».كامەران، ئەوەشی روونكردەوە:"جگە لەوەی كە ئێمە هەلی كارمان بۆ زیاتر لە ١٠٠ كەس رەخساندووە كەلێرە كار دەكەن، بەرهەمی تەماتەی جوتیارەكانی سنوری هەلەبجە و شارەزوور و پێنجوێن لێرە ساغدەكەینەوە، وە بەكردنەوەی نوێنەرایەتیمان لە سەرجەم شار و شارۆچكەكانی هەرێم بەمەبەستی وەرگرتنی بەرهەمی جوتیاران، ئەوا رێژەی هەلی كارمان بەرزتر دەبێتەوە». خاوەنی كارگەكە، راشیگەیاند:"بەپێی پلانەكەمان لەسەرەتای وەرزی كشتوكالی سالی داهاتوو، ١٠٠٠دۆنم زەوی بە كرێ دەگرین و ئەو تۆوەی تایبەتە بەو تەماتەی كە دەمانەوێ بیكەین بەدۆشاو، دەچێنین و سودی لێوەردەگرین، دواتر هەر جوتیارێكیش وویستی دەتوانێ ئەو تۆوەمان لێوەربگرێ بەمەبەستی چاندن و بەرهەمهێنانی و ئێمەش راستەوخۆ لای خۆمانەوە ساغی دەكەینەوە»

.سەبارەت بەدەستی كای ژنانیش ناوبراو، وتی:" لەقۆناغی ئێستادا ئەو بەشانەی كە پەیوەستن بەژنان نەكراونەتەوە وەكو نوێنەرایەتییەكانمان

لە شار و شارۆچكەكان، هەروەها بەشەكانی تەكنیكی و بەدواداچون و چەندین بەشی تر دەكەینەوە، كە لەوكاتەدا پێویستمان بەپسپۆری و تواناى ژنان دەبێت و بەدلنیاییەوە دەستی كاری ژنان فەرامۆش ناكەین». لەلایەكی دیكەشەوە حسێن رەزایی، ئەندازیار و سەرپەرشتیاری كارگەكە ئەوەی بە رۆژنیوز راگەیاند:"ئەو ئەجیهازانەی كە بۆ وەگەرخستنی كارگەكە بەكاری دێنین لە ولاتی ئیتالیا و هەندێكیشی لەئێران هێناومانە، بەلام خۆشبەختانە كرێكارەكان هەر زوو شارەزای كاركردنیان بوون و پێویستمان بە ئەندازیاری دەرەكی نییە».

حسێن رەزایی، وتیشی:" لەرووی ئەو كوالێتیەوە هەر لەسەرەتاوە ركابەری بەهەمی دۆشاوی تەماتەی ئێران و توركیا دەكەین، بەلام ئەوەی جێگەی داخە حكومەتی هەرێم رێگە بە هێنانە ناوەوەی چەندین بەرهەمی دۆشاوی تەماتەی ئێران و توركیا دەدات كە كوالیتیان زۆر نزمە، بۆیە داوا لە حكومەت دەكەین كە پالپشتێكی بەهێزی ئەم كارگەیە بێت بەجۆرێك هێنانەناوەوەی ئەو بەرهەمانە كەم بكاتەوە و گومرگی زیاتری لەسەر دابنێ».سەرپەرشتیاری كارگەكە، جەختیكردەوە:" بەشێوەی ستانداردی نێودەولەتی و بەكوالێتی بەرز دۆشاوی تەماتە بەرهەم دەهێنین و لەرووی نرخیشەوە زۆر گونجاوە و رەچاوی باری دارایی هاوولاتیانمان كردووە». كرێكارێكی كارگەكەش بەناوی گۆران حەسەن عەلی، ئەوەی بە رۆژنیوز وت:"كردنەوەی ئەم كارگەیە سودێكی زۆری بۆ هەلەبجە و شارەزور و هەورامان و بگرە هەموو هەرێمی كوردستان هەیە، كەتیایدا بەرهەمی ناوخۆیی ساغ دەبێتەوە و هەلی كار بۆ هاولاتیان و جوتیارانی ناوچەكە دابین دەكات».ئەو كرێكارە روونیشیكردەوە:"كوالێتی جیهازەكان كە لە ئیتالیاوە هێنراون لەروی تۆكمەیی و پێشكەوتویی لە ئاستی ستانداردی جیهانین، وە كارپێكردنیشیان بۆ ئێمە ئاسانە و پێویستمان بە شارەزا و پسپۆری تایبەت و دەرەكی نییە، وە بە فراوان بونی كارگەكەش زیاتر هەلی كاری بۆ پەیدا دەبێت و ئاستی بەرهەمهێنانیشی زیاتر دەبێت».

كارگەی دۆشاوی تەماتەی شارەزوور دەستی بەكاركرد و رۆژانە ٥٠ هەزار قوتو دۆشاو دەخاتە بازارەوە

بەرواری دانان: ٢٧ تەمموز ٢٠١٦
لەدەسەی: بازرگانی, سلایدر, سەرەكی

كارگەی دۆشاوی تەماتەی شارەزوور لە هەلەبجە رۆژانە تواناى وەرگرتنی ٢٠٠ تەن تەماتەی هەیە بەپێی هەموو پێوەرە زانستیو تەندروستیەكان دەستی كردوە بەقۆناغی ئەزمونیو جۆرەكەشی لە ئاستێكی بەرزدایە، ئەندامێكی لیژنەی كشتوكالی پەرلەمانی كوردستانیش رایدەگەیەنێت دەبێت حكومەت هاوكاری ئەم كارگانە بكات.

خەلەف ئەحمەد ئەندامی لیژنەی كشتوكال لەپەرلەمانی كوردستان رایگەیاند: "گرنگی ئەم كارگەیە بۆ هەلەبجە و هەورامانو شارەزوور لەوەدایە ئەم كۆمپانیایە دەیەوێت لە سالی داهاتوودا زەویە كشتوكالیەكان لەجوتیاران وەربگرێتو خۆی بەباشترین تۆ و زەویەكان بچێنێت بۆ ئەوەی باشترین بەرهەمیان هەبێت، بۆیە زۆر گرنگە حكومەتی هەرێم پشتیوانی لەم كارگەیە بكات بۆ ئەوەی ئەم كارگەیە نەروخێت و دانەخرێت، چونكە لەم قۆناغەدا كەقەیرانی داراییە ئەم گارگەیە نەك قازانج ناكات بەلكو زەرەر دەكات بەلام مەبەستیەتی منافەسەیەك دروست بكات لە بازاردا كەزۆر گرنگە بۆ ئێمە منافەسەی بەرهەمی دەرەكی بكەین كەسالانە ملیۆنەها دۆلارمان دەروات بۆ ولاتانی دەرەوە لەتوركیا و ئێرانو ولاتانی دیكە.

ئاماژەی بەوەشدا:" ئەم كارگەیە منافەسە دروست دەكات لەنێوان بەرەهەمی دۆشاوی خۆمالی و بەرهەمی دەرەوەی كوردستان بۆیە دەبێت حكومەتی هەرێم باج لەسەر كارگەكە كەم بكاتەوە و سالەنەی لێوەرنەگرێتو كارەبای ٢٤ سەعاتی بۆ دابین بكات.

خاوەنی كارگەی دۆشاوی تەماتەی شارەزوور رایدەگەیەنێت: رۆژانە ٢٠٠ تەن تەماتە وەردەگرنو ٥٠ هەزار قوتو بەرهەمدەهێنن، لەئێستادا كارگەكە لەقۆناغی ئەزمونیدایە.

خاوەنی كارگەكە دەلێت: "ئێمە لەقۆناغی یەكەمدا رۆژانە ٢٠٠ تەن تەماتە وەردەگرینو ٥٠ هەزار قوتوش دەخەینە بازارەوە ئەمە لە قۆناغی یەكەمدا بەلام بەرنامەمان هەیە بۆ سالی داهاتوو خۆمان زەویەكان لە جوتیاران وەربگرین وەك كرێی بێت یان كرین،١٠٠٠ بۆ ٢٠٠٠ دۆنم وەربگرینو خۆمان نمونەی (سامپل) ی زەویەكان بەرینە تاقیگەكانی دەرەوەی كوردستانو فەحسی بكەین بۆ زانینی كوالێتی زەویەكان، باشترین تۆ و لەدەورەوەی كوردستان بهینین وە سەمادی بۆ بەكاربهینین بۆ ئەوەی زەویەكان زۆرترین بەرهەمیان هەبێت وەباشترین بەرهەم لە تامو جێژ و جۆردا بخەینە بازارەوە بتوانین منافەسەی بەرهەمی دەرەوەی پێبكەین، وتیشی: پلانمان هەیە بۆ سالی داهاتوو تەماتە لە جوتیارانیش وەربگرین بەرهەمەكەمان زیاد بكەین بۆ ٧٠٠ تەن.

كارگەی دۆشاوی تەماتەی شارەزوور بریارە لەسالی داهاتوودا رۆژانە ٣٠٠ تەن تەماتەی جوتیاران وەربگرێت.ه

# گەڕەکێکی هەڵەبجە

# سود لە پرۆژەی دابینکردنی ئاوی خواردنەوە وەرناگرێت

هەرچەندە گەورەترین پرۆژەی ئاوی خواردنەوەی هەڵەبجە کرایەوە، بەڵام هێشتا گەڕەکێکی گەورەی ئەو شارە بێ ئاوە و بە تانکەر ئاوی خواردنەوەیان بۆ دابیندەکرێت

لە ٢٠/تەموزی ٢٠١٦ پرۆژەی دابینکردنی ئاوی خواردنەوە بۆ هەڵەبجە و سیروان سەیدسادق کرایەوە و ڕاگەیەندرا کە تا ٢٥ساڵی دا هاتوو کێشەی بێ ئاوی لەو سنورەدا نامێنێت و ئاوی ماڵان بە ٢٤ کاتژمێر دەبێت، بەڵام هەتا ئێستا گەڕەکی ئەندازیارانی شاری هەڵەبجە بە تانکەر ئاوی خواردنەوەیان بۆ دابیندەکرێت

شاخەوان محەمەد، دانیشتوی گەڕەکی ئەندازیاران بۆ ڕۆژنیوز باسی لە کێشەی بێ ئاوی گەڕەکەکەیان کرد و وتی:»ماوەی ١٠ساڵە ئەم گەڕەکە دروستکراوە و هەتا ئێستا لە ڕێگای بۆرییەوە ئاوی خواردنەوەی بۆ دابیننەکراوە.

## هاوڵاتیەك:

## دە ساڵە گەڕەکەکەمان دروستکراوە بەڵام هەتا ئێستا لەڕێگەی بۆرییەوە ئاوی بۆ دابین نەکراوە

ئەو هاوڵاتیە، وتیشی:"دڵمان بە کردنەوەی پرۆژەی ئاوی خواردنەوەی هەڵەبجە خۆشبوو، بەڵام بەداخەوە بەهۆی کەمتەرخەمیەکامی بەڕێوەبەرانی ئیداری ئەم شارە ئێمە لەو پرۆژەیە سودمەند نەبووین و هەتا ئێساش بە تانکەر ئاوی خورادنەوەمان بۆ دابیندەکەن، کە ئەویش تەنها دوو ڕۆژ لە هەفتەیەکدا دێت».

شاخەوان، ئاماژەی بۆ ئەوەشکرد:"چەند جارێك داواکاریمان بەرزکردۆتەوە، بەڵام هیچ وەڵامێکی ئەرێنیمان لە بەرپرسانی ئەم شارە وەرنەگرتووە و ئێمەش ئیتر نائومێد بووین لەو هەموو هەوڵدان و داواکاریانە

هاوڵاتیەکی دیکەی ئەو گەڕەکە بەناوی مەزهەر عومەر، بە ڕۆژنیوزی وت:"ئێمە وەکو دانیشتوانی گەڕەکی ئەندازیاران ڕەخنەی توند ئاراستەی حکومەت و بەرپرسە کەمتەرخەمەکانی ئەم شارە دەکەین، کە تاوەکو ئێستا نەیانتوانیوە ئاوی خواردنەوەمان بۆ دابینبکەن، وە زۆر بێ باکن لەچارەسەر کردنی ئەم کێشە مەزهەر، وتیشی:"لەگەڵ ئەوەی ئەم شارە بووە بە پارێزگا و گەورەترین پرۆژەی ئاوی بۆ دابینکراوە، بەڵام ئێمە هێشتا بە تانکەر ئاوی خواردنەوەمان بۆ دابیندەکەن»

مەزهەر جەختیشی لەوە کردەوە:"ئەم گەڕەکەی ئێمە بۆری ئاوی بۆ ڕاکێشراوە، بەڵام بەهۆی کەموکورتیەکان و سەقەتی پرۆژەکە تائێستا ئێمە بێ بەش بووین لە ئاوی خواردنەوە، بۆیە داوادەکەین بە زووترین کات ئەو کێشەمان بۆ چارەسەر بکەن، چونکە بەراستی هاوڵاتیانی ئەم گەڕەکە بەهۆی بێ ئاوی-یەوە توشی گرفتی زۆر بوونەتەوە».

سەرچاوە:ڕۆژنیوز



هەڵەبجە لەناوەراستی پەنجاکانی سەدەی ڕابردودا،ئەوکاتەی مەلیك فەیسەڵ و وەصی عەبدوڵئیلاه سەردانی شارەکەیان کردوە

## هەڵەبجەلەسەرئاستی هەرێم

# پلەی یەکەمی زانستی و پیشەسازی بەدەستدەهێنێت

چەند خوێندکارێکی هەڵەبجەیی لەسەرئاستی هەرێمی کوردستان پلەکانی یەکەم و دووەم و سێیەمی بەشە جیاوازەکانی پۆلەکانی دوانزەیەمی وێژەیی و زانستی و پیشەیی بەدەست دەهێنن، بەڕێوەبەری پەروەردەی گشتی هەڵەبجەش دەڵێت: ئەمسال ئاستی خوێندکارانی هەڵەبجە بەرزتر بوەتەوە. دوای ڕاگەیاندنی ئەنجامەکانی تاقی کردنەوەکانی پۆلەکانی نۆ و دوانزیەمی زانستی و وێژەیی و پیشەسازی لەلایەن وەزیری پەروەردەوە، لەبەشی زانستی خوێندکارێکی هەڵەبجەیی پلەی یەکەمی هێنا و لەبەشی وێژەییش خوێندکارێکی دیکە پلەی سێیەم و لە بەشی پیشەسازیش پلەکانی یەکەم و و دووەم و سێیەمیش هەڵەبجەیی بوون. سۆران عومەر بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی هەڵەبجە لەمبارەیەوە بە ڕۆژنیوزی ڕاگەیاند:“دوای تەواوبونی تاقی کردنەوە گشتیەکانی پۆلەکانی نۆیەمی بنەڕەتی و دوانزەیەم، پارێزگای هەڵەبجە یەکێك بوو لەو شوێنانەی کە پرۆسەی تاقی کردنەوەکان بەشێوەی ڕێکوپێك و بێ هیچ پێشێلکاریەك بەڕێوەچوو، دەرئەنجامەکەشی بەدەستهێنانی چەندین دەستکەوتی مەزن بوو کە خوێندکارەکانمان پلەکانی یەکەم و دووەم و سێیەمی بەشە جیاوازەکانی خوێندنیان لەسەر ئاستی هەرێم بەدەستهێنا“

### هەڵەبجەلەخوێندنی پیشەیشدا

### پلەی یەکەم و سێهەمی هەرێم بەدەستدەهێنێت

چنور و چیا حەمەخان مەجید،لەئامادەیی پیشەسازی هەڵەبجە،بەشی کۆمپیوتەر پلەی یەکەم وسێهەمیان لەسەرئاستی هەرێم بەدەستهێناوە،تەمەن درێژبن

ئەمساڵیش هەڵەبجە پلەی یەکەمی بەشی زانستی بەدەست هێنا

ناوەندی هەڵەبجەی ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان لە مەراسیمێکدا خەڵاتی ڕێزلێنان دەبەخشێتە خوێندکارە یەکەمەکانی سنوری پەروەردەی هەڵەبجە، کە توانیویانە بۆ وەرزی ئەمسالی خوێندن پلەکانی یەکەم تا سێیەم بهێنن

ئێوارەی ئەمڕۆ لەهۆڵی مۆنۆمێنتی یادگاری هەڵەبجە و بەئامادەبونی قائیمقام و سەرۆکی شارەوانی و بەرپرسە حکومی و حزبیو ڕێکخراوەکانی هەڵەبجە، خوێندکارە یەکەمەکانی سنوری پەروەردەی هەڵەبجە کە توانی بویان پلەکانی یەکەم تا سێیەم بەدەست بهێنن، خەلاتی ڕێزلێنانیان پێبەخشرا، سکرتێری ڕێکخراوێکی خوێندکاریش دەڵێت: یەکەمەکانی ئاستی هەرێم لە شارێك بوون کە بایکۆتی هۆڵەکانی خوێندنی تێدا ئەنجام درا.

بێستون محەمەد ساڵح سکرتێری ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان کە ئامادەبووی مەراسیمەکەبوو ئەوەی بە ڕۆژنیوز ڕاگەیاند:“وەکو ڕێکخراوێکی داکۆکی لەمافەکانی خوێندکاران و وەك وەفایەك بۆ هەول و ماندوبونیان هەستاین بە بەخشینی خەلاتی ڕێزلێنان بە خوێندکارە یەکەمەکانی سنوری پەروەردەی هەڵەبجە کە لەسەر ئاستی هەرێم و ئەم پەروەردەیە پلەکانی یەکەم تا سێیەمیان بەدەستهێنابوو».

بێستون محەمەد وتی:“هەرچەندە ئەمسال پەروەردەی هەرێمی کوردستان ڕووبەڕوی چەند ئاستەنگێك بویەوە بەتایبەتێ بایکۆتی هۆڵەکانی خوێندن، بەلام پەروەردەی هەڵەبجە توانی ئاستێکی بەرز پێشکەش بکاتو وەك سالانی پێشو یەکەمی سەرئاستی هەرێم لەم شارەبوو، بۆیە داوادەکەین لەدەسەلاتدارانی پەروەردەی هەرێم کەهەولی چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانە بدەن، بەتایبەت پرۆگرامی خوێندن و هەولدان بۆ دابینکردنی موچەی مامۆستایان لەکاتی خویدا».

ڕێڤان محێدین خوێندکارە یەکەمەکەی هەرێمیش لەڕێگەی ڕۆژنیوزەوە پەیامێك ئاراستەی حکومەت و پەروەردەی هەرێم دەکات و دەڵێت:“قەیرانەکانی هەرێم کاریگەری لەسەر دوو چینی گرنگی وەك مامۆستایان و پێشمەرگە هەیە، بۆیە داوا لەحکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەم کە بەجدی ئاوریان لێ بداتەوە، بەتایبەت لەدابینکردنی موچەکانیان، بۆ ئەوەی ئەوانیش بتوانن ڕۆلی خۆیان بەسەرەکی و بەباشی پێشکەش بە میللەتەکەمان بکەن».

ڕێڤان مەحیەدین ئەوەشی وت:“هەوڵ و تێکۆشانی ئێمەی خوێندکاریش لەوە بەرزتر بوو کە گوێ بەو قەیرانانە بدەین و لەپال ئەو هەموو گیروگرفتانەی کەرتی پەروەردە بە تایبەت لە هەڵەبجە توانیمان پلەی یەکەمی هەرێم و پلەکانی تری وەك دووەم و سێیەم بەدەست بهێنین، بۆیە داوا لە حکومەتیش دەکەین داهاتوی ئێمە گرنگترەو پێویستە نەخشەڕێگای باشتر بۆ دوای پرۆسەی خوێندنی ئێمە دابڕێژێت».

هەروەها کچە خوێندکارێکی دیکە بەناوی چیا حەمەخان مەجید کە پلەی یەکەمی سەر ئاستی هەرێم لە بەشی پیشەسازی بەدەستهێنابوو ئەوەی بە ڕۆژنیوز ڕاگەیاند:“بەخۆشحالیەوە ئەوەی کە هەولم بۆدا بەدەستم هێنا کەتوانیم یەکەمی سەر ئاستی هەرێم لە بەشەکەم بم، ئەوەش بە هەول و ماندوبونێکی زۆری خۆم بەبێ دابڕان و بەگەشبینیەوە ڕوانین لەداهاتوی خۆم بوو، بۆیە لێرەشەوە سوپاسی ئەوانە دەکەم کە خەلاتی ڕێزلێنانیان پێ بەخشیم».

چیا حەمەخان کە دانیشتوی شارۆچکەی سەیدسادقە، وتیشی:“هەر چەندە مامۆستایان ڕووبەڕووی چەندین گیروگرفت بونەوە لە وەرزی خوێندنی سالی ڕابردوو، بەتایبەت لەکاتی بایکۆت کردنی هۆلەکانی خوێندن، بەلام ئێمە هەرگیز نائومێد نەبوین و بەهەولی ئەو مامۆستایانەمان کە هۆلی پۆلەکانی ١٢ی وێژەیی و زانستی و پیشەسازیان چۆل نەکرد، ئەو پلەیەمان بەدەستهێنا».

سەرچاو:

ە:هەڵەبجەنیوز،ڕۆژنیوز،سەرچاوەکان

---

## بەڕێوەبەری پەروەردەی هەڵەبجە:

## ئاستی زانستی خوێندکارانی هەڵەبجە بەرزبوەتەوە

---

## ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان

## یەکەمەکان خەلات دەکات

---

## دوو کچە قوتابی کەدانیشتوی سەیدصادق بون و لەهەڵەبجە دەیانخوێند

## پلەی یەکەم و سێهەمی بەشی کۆمپیوتەریان بەدەستهێناوە لەسەر ئاستی هەرێم

هەڵەبجە نیوز
لەهەڵەبجەدەردەچێت
ساڵی یەکەم ژمارە(٤)تەمموزی٢٠١٦
موبایل:٠٧٥٠٨٣٥٤٦٠٦
فەیسبوک:حلبجە نیوز





## پارێزگاری هەڵەبجە

### پرسەنامەیەك ئاراستەی خەڵکی قامیشلۆ دەکات

بۆ خوشك و برا خۆڕاگرەکانمان لە ڕۆژئاوای کوردستان:

لەناخی دڵەوە خەمبارین بە ڕووداوی خوێناوی کردنی قامیشلۆی سەربەرز، ئەو ڕۆوداوە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت، خەبات و تێکۆشانی بەردەوامتان و شکست هێنان بە تیرۆرستان وایکردووە پەنا بۆ کاری ترسنۆکانە ببەن.

لەهەڵەبجەی سیمبولی قوربانیدان و شاری ٥٠٠٠ شەهیدەوە، پرسەو سەرەخۆشی خۆمان ئاراستەی خانەوادەی شەهیدانی تەقینەوەکەی قامیشلۆ دەکەین، ئەمری بۆ شەهیدان، هیوای زووچاکبوونەوە بۆ بریندارەکان دەخوازین.

**عەبدوڵڵا محەمەد عەبدولمحەمەد**

**پارێزگاری هەڵەبجە**

بابەخ بە کاروباری پارێزگای هەڵەبجە دەدات
ژمارە(٥)
ئاب-ی ٢٠١٦
خاوەن ئیمتیازو سەرنوسەر
سەلاح سەعید ئەمین

# هەڵەبجە نیوز
# Halabja News

### پاش ٢٨ ساڵ لەبۆردومانەکە،بەرکەوتویەکی چەکی کیمیاوی:

# چاوم لەدەرگایە،کەی ئیزرائیل بێت و گیانم بکێشێت

## بەرکەوتویەکی چەکی کیمیاوی لەلێواری مەرگدایە

ناوێنە،عەزیز رەسوڵ: بەرکەوتویەکی چەکی کیمیاوی لەلێواری مەرگدایە داوای یەهاناوە چونی بەیهانەی لایەنی پەیوەندیدار دەبێت ئەو پشکنینانەی بۆی کراوە لە ١٠٪ سیەکانی کاردەکەن کامیل عەبدولقادر بەرکەوتوی چەکی کیمیاوی بەناوێنەی راگەیاند "داواکارم لەحکومەت و وەزارەتی تەندروستی، چونکە ئەوەندە خەمسارددەن بەرامبەر بەرکەوتوانی چەکی کیمیاوی، رۆژانە بەدەست ئێش و ئازارەوە دەناڵێنن، هێندێ هێندێ بەرکەوتوانی چەکی کیمیاوی گیان لەدەست دەدەن بەبەرچاوی ئەم حکومەتەوە".وتیشی "لەلایەن پزیشکەکان پێم وتراوە لە ١٠٪سیەکانم کاردەکەن، ئەویش بەهۆی ئامێرێکەوە دەتوانم هەناسە بدەم هەر خولەکێکی مردنێکە بۆم، بەلام بەداخەوە لایەنی بەرپرس وەزارەتی تەندروستییە زۆر کەمتەرخەمە بەرامبەرمان"ئەو بەرکەوتەیەی چەکی کیمیاویی دەڵێت "چاوم لەدەرگایە کەی ئیزرائیل بێت و گیانم بکێشێت".

کامیل عەبدولقادر بەرکەوتەی چەکی کیمیاوی

سەبارەت بەقسەکانی دۆناڵد ترامپە

## کونسوڵی گشتی ئەمەریکا وەلامی پارێزگاری هەڵەبجە دەداتەوە

سایتی پارێزگای هەڵەبجە:

کونسوڵی گشتی ئەمریکا لەهەولێر لەوەلامی نامەی نارەزایەتی پارێزگاری هەڵەبجە لەبەرامبەر لێدوانێکی دۆناڵد ترامپ کاندیدی کۆمارییەکان بۆ پۆستی سەرۆکی ئەمریکا نامەیەک ئاراستەی پارێزگاری هەڵەبجە دەکات

جەنابی پارێزگاری هەڵەبجە

زۆرسوپاس بۆ نامەکەتان کەلەبەرواری ٨ ی ئۆگەستی ٢٠١٦ ، بەهۆی پرسەو سەرەخۆشی و هاوخەمی خۆم بۆئەوانەی زیانلێکەوتووانی کارەساتی هەڵەبجە دەردەبڕم

زیاتر..ل٢

## بەڕێوەبەری ناحیەی بەمۆ:

# پردی تەنگی سەید موحەمەد بکرێتەوە

هەڵەبجە نیوز تایبەت
عادل مەلا ساڵح بەڕێوەبەری ناحیەی بەمۆ لەلێدوانێکی تایبەتدا بەهەڵەبجە نیوزی راگەیاند،دروستکردنی پردی تەنگی سەید موحەمەد هەنوکەییترین پرۆژەیە بۆ ناحیەی بەمۆ. بەڕێوەبەری ناحیەی بەمۆ ئەوەشیگوت:هەڵەبجە و هەڵەبجەییەکان وپەکانیداریەکان هەماهەنگیان لەگەڵ ئێمەدا لەئاستی باڵادایە. پێویست ترین پرۆژە بەستنەوەی ناحیەی بەمۆیە بە هەڵەبجەوە...بەواتایەکی تر بەستنەوەی هەڵەبجەوناحیەی بەمۆیە لەرووی رێگاوبانەوە..بە دروست کردنی پردی تەنگی سەید موحەمەد ..چونکە بەم پرۆژەیە دەتوانرێ هەڵەبجە ببەسترێتەوە بە گەرمیان و دیالەو ناوەراستی عێراقەوە سەبارەت بە هەماهەنگی پارێزگای هەڵەبجەو یەکانیدارییەکانی شارەکە،عادل مەلا ساڵح وتی:هەماهەنگی هەڵەبجەو هەڵەبجەییەکان و قایمقامیەت و پارێزگاو بەڕێوەبەرایەتیەکانی هەڵەبجە لەئاستێکی باڵادایە و جێگای سوپاسن.

### ساڵی رابردو شارەوانی ١٠٠تۆن خاشاکی لەماڵەکەیدا فرێدابو

## ماڵەکەی مەلیح دەسوتێت

کوردنیو - حەیدەر حامە ساڵح
ماڵی مەلیحە لەو ناڕەحەتەی چەندین ساڵە زبڵ و خاشاک کۆدەکاتەوە، ماڵەکەی سوتاو هۆکاری سوتانی ماڵەکەشی نادیارە.
ماڵی مەلیحە دەکەوێتە گەرەکی شارەوانی و ئەو ناڕەحەتە چەندین کاڵ و پەڵ و زبڵ و خاشاکی لەماڵەکەی کۆکردۆتەوە ، ئەمەش بوەتە هۆی هەراسانبون و بێزاری دانیشتوانی ناوچەکەو دەوروبەری.
ساڵی رابردووش لەلایەن شارەوانیەوە ماڵەکەی پاک کرایەوە کە ١٧ ئۆتۆمبیلی بارهەڵگر زبڵ و خاشاک لە ماڵەکەی فرێ دراو نزیکەی ١٠٠ تەنی لە خۆگرتبوو.

گەنجێکی شاری هەڵەبجە داهێنانێک لە IT دا دەکات
..ل٣

پارێزگاری هەڵەبجە: ئەگەر دۆخەکە وەک خۆی مایەوە دەبێت بریاری دیکەمان هەبێت
..ل٤ و ٥

شیعرێکی ئیبراهیم هەورامانی
..ل٧

# نامەی ناڕەزایی پارێزگاری هەڵەبجە بۆ دۆناڵد ترامپ کاندیدی کۆمارییەکان

سایتی پارێزگای هەڵەبجە
نامەی ناڕەزایی پارێزگاری هەڵەبجە بۆ دۆناڵد ترامپ کاندیدی کۆمارییەکان

بۆبەڕێز دۆناڵد ترامپ کاندیدی سەرۆکایەتی کۆمارییەکانی ئەمریکا
بەناوی خەڵکی هەڵەبجە و کەس و کاری قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە، ناڕەزایی خۆمان دەردەبڕین دەربارەی هەندێک لەوتەکانی (دۆناڵد ترامپ) کاندیدی سەرۆکایەتی کۆمارییەکان کە وصف و پەسنی دیکتاتۆری پێشووی عێراق (سەددام حسێن)ی کردبوو بۆبەکارهێنانی گازی کیمیایی دژی خەڵکی وڵاتەکەی.
مانگی ١٢ ی ڕابردووتەویلایەتی باشووری کارۆلینا دۆناڵدترامپ وتی:"سەددام حسێن بڕێکی کەم گازی ڕژاند هەموو دنیای تورەکردو وترا کەئەو گازی کیمیایی بەکارنەهێنێت،
ئێمە لێرە دەمانەوێت بیری بەڕێز ترامپ بهێنینەوە کە تەنها لەشاری هەڵەبجە دوای بەکارهێنانی گازی کیمیایی بەسەر شارەکەدا زیاتر لە ٥٠٠٠ هاووڵاتی مەدەنی بوونە قوربانی لە ١٦ ی ئازاری ١٩٨٨ و زیاتر لە ١٠،٠٠٠ کەسی بریندار کرد کە پێکهاتبوون لە منداڵ و ژن و پیاو، وە لەماوەی سێ دەیەی حوکمڕانیدا سەدان هەزار کەسی مەدەنی و بێتاوانی کردووەتە قوربانی بۆنموونە تەنها لەپرۆسەی بەناو ئەنفالدا لەهەزی کوردەکان زیاتر ١٨٢،٠٠٠ هاووڵاتی کوردی بێ سەرو شوێن کرد.
ئەوە جێگەی تێڕامانە کە سەرکردەیەکی جیهانی ئازاد جۆرە وتەیەکی ئاوا سەبارەت لەکاتێکدا زۆرێک لەقوربانیان و بریندارانی کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە لە ئازاردان وەهەزاران کەسی تریش چاوەڕوانی چارەنووسی خۆشەویستەکانیان.
ئێمە لێرەوە داوا لەکاندیدی سەرۆکایەتی کۆمارییەکان دەکەین داوای لێبوردن لەکەس و کاری قوربانیانی جەنگی کیمیایی هەڵەبجە بکات و خۆشی بەدووربگرێت لەدووبارەکردنەوەی وتەی لەوشێوە لەئاییندەدا.

عەبدوڵڵا محمد عەبدولمحەمەد

پارێزگاری هەڵەبجە

٨_٨_٢٠١٦

# نامەیەک لە کونسوڵی گشتی ئەمریکاوە لەهەولێر بۆ پارێزگاری هەڵەبجە

ئەکونسوڵی گشتی ئەمریکا لەهەولێر لەوەڵامی نامەی ناڕەزایەتی پارێزگاری هەڵەبجە لەبەرامبەر لێدوانێکی دۆناڵد ترامپ کاندیدی کۆمارییەکان بۆ پۆستی سەرۆکی ئەمریکا نامەیەک ئاراستەی پارێزگاری هەڵەبجە دەکات
دەقی نامەکە.
جەنابی پارێزگاری هەڵەبجە
زۆرسوپاس بۆ نامەکەتان کەلەبەرواری ٨ ی ئۆگەستی ٢٠١٦

بەندە پرسەو سەرەخۆشی و هاوخەمی خۆم بۆتەواوی زیانلێکەوتووانی کارەساتی هەڵەبجە دەردەبڕم کەبەدەستی ڕژێمی سەدام حسێن ئەنجامدرا، حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر بەڕوونی و بەئاشکرا ئەو کارەساتانەی ئیدانەکردووە کەبەدەستی سەددام حسێن دژی میللەت و هاووڵاتیانی خۆی ئەنجامیداوە.

وەهەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەشێک بووە لەو لایەنەی کەناوخۆی عێراق و سەرانسەری جیهان لەیادکردنەوەی قوربانیانی پرۆسە دڕندە توندو تیژەکانی سەدام حسێن. لەم قۆناغە گرنگەی مێژوودا . ئێمە دڵنیاتان دەکەینەوە پابەندین بەمانەوەمان هاوشانی تەواوی عێراق و هەرێمی کوردستان کە کار بۆ شکستی داعش و دڵنیاکردنەوەی باری ئاسایش و دیموکراسی و ئابوورییەکی سەرکەوتوو لەئاییندەدا بۆ کۆمەڵگە و خێزانەکانیان، خۆشحاڵ دەبم لەئاییندەیەکی نزیکدا بەدیدارتان شادبم لەنزیکەوە بیرو ڕا بگۆڕینەوە دەربارە مەسەلە گرنگەکانی ئەمڕۆ لەشاری هەولێر یان هەڵەبجە.

کێن گرۆس

کونسوڵی گشتی ئەمریکا لەهەولێر

# جوتیارانی ناحیەی بەمۆ قەرەبوو دەکرێنەوە

بزاڤ پرێس:ژیار کامیل

ئەو جوتیارانەی کە بەهۆی پرۆسەی گەرانی کۆمپانیای گازپرۆمی ڕووسی بۆ نەوت لەناحیەی بەمۆ زیانیان بەر زەوییەکانیان کەوتووە، قەرەبووی مادی دەکرێنەوە
عادل مەلا سالح بەڕێوەبەری ناحیەی بەمۆ لە لێدوانێکدا بەبزاڤ پرێسی ڕاگەیاند:"ئەمڕۆ ٢٠١٦-٨-١٨ جوتیارانی زیان لێکەوتوو بەهۆی پرۆسەی سایزمیک و گەرانی کۆمپانیای گازپرۆمی ڕووسی بۆ دۆزینەوەی نەوت لەسنووری ناحیەی بەمۆ، قەرەبووی مادی کرانەوە".
ڕاشیگەیاند:"بڕی قەرەبوو کردنەوەکە بەپێی زیانی زەوییەکان بووە و لە ١٠٠ دۆلارەوە تا ١٠٠٠ دۆلار قەرەبوو دەکرێنەوە، و لە ڕابردووشدا زیاتر لە ١٠٠ جوتیاری دیکە قەرەبوو کراونەتەوە"
بەپێی ئامارییەکان، نزیکەی ٦٢ جوتیاری زیانلێکەوتوو لەسنووری ناحیەی بەمۆدا هەیە کە زیانیان بەر زەوییەکانییان کەوتووە بەهۆی پرۆسەکانی کۆمپانیای گازپرۆمی ڕووسی بۆ دۆزینەوەی نەوت.

# ئایا گۆڕانکاری پۆستی پارێزگاکان لە بەرژەوەندی هەڵەبجەیە ؟

**عومەر عەبدول**



بەدەر لە ئایدۆلۆژیا بازی و پان کردنەوە بۆ هیچ لایەک ، لە دیدی بەندەدا گۆڕانکاری لە پۆستی پارێزگاری هەڵەبجە ، بە سودی هەڵەبجە کۆتایی نایەت .
سالێک و قسورە پارێزگارو هەردو جێگرەکەی دەرگا ئەمبا ئەبکوتن و بە دەیان سەردان و کۆبونەوەی فەرمی نا فەرمی و تا رادەی جۆرێک لە پارتەوەش بەلام هەڵەبجە وەک پێویست بونە پارێزگاکەی بە گیان نەکەوت و بە دەستی دەستی و بیانوی جیاواز ، هەرچی هەڵپەرکێی خۆشی و هەڵبەهەی بە پارێزگا بون بو ئێمادا بە کونە لوتماندا هێنایانەوە .
بە رای هەمومان دەبوایە ئەم شارە بەدەر لە زێنمایی و قەیران و کێبەرکێ ، وەک چەپکە گوڵی دەستی حکومەت و حیزبەکان برە بودجەیەکی بۆ تەرخان بکرایە کە (هەیە) تا لانی کەم سیماوروخساری پارێزگای پێوە دیار بێت .

---

**گۆڕانکاری لە پۆستی پارێزگاری هەڵەبجە ، بە سودی هەڵەبجە کۆتایی نایەت**

---

**دەبوایە ئەم شارە بەدەر لە زێنمایی و قەیران و کێبەرکێ ، وەک چەپکە گوڵی دەستی حکومەت و حیزبەکان برە بودجەیەکی بۆ تەرخان بکرایە کە (هەیە) تا لانی کەم سیماوروخساری پارێزگای پێوە دیار بێت**

---

بەلام بەداخەوە چەپکە گوڵەکە بویە سزاو هەمومانی تا رادەیەک ئازار دا و ئازار دەدات .
بەهەر حاڵ هەندێ هەوڵی جدی لە ئارادایە بۆ کەوتنە سەر پێی کارو باری پارێزگاکە و خەریکە بەرهەمەکەی ببینرێت ، ترسم زۆرە ئەو هەوڵانە ببنە قوربانی گۆڕانکاریەکان و تا دوبارە ستافی نوێ کەوالەی خۆیان دەخوێننەوە ، دو ساڵەکەی تریش دەچرکێ و مایە پوچ لەم گەمەیە دەرئەچین .
کورتەی قسە ..
هەڵەبجە ئەمرۆ بەگۆڕینی دەمو چاوەکان گەشە ناکات و ئاوەدان نابێتەوە ، بەڵکو بە هەوڵ و کارو ئیبران .
ئەمە تەنها ترسێکەو هیچی تر

- ئەکاونتی نوسەر لەفەیسبوک

---

# بەفەرمی لەلایەن گەنجێکی شاری هەڵەبجە

## زمانی کوردی بۆ نەرمەکاڵایەکی دژەلۆگەری بەناوبانگ زیادکرا

### تۆری تەکنۆلۆژیای زانیاری کورد

لەلایەن گەنجێکی شاری هەڵەبجە زمانی کوردی بۆ نەرمەکاڵایەکی دژەلۆگەری بەناوبانگ زیادکرا، بلال علی محمد، گەنجێکی شاری هەڵەبجەیە و توانیویەتی زمانی کوردی بۆ نەرمەکاڵای (زیمانا ئەنتی لۆگەر) زیاد بکات، دوای ئەم هەنگاوە لەلایەن کۆمپانیای زیمانا کۆدی چالاککردنی نەرمەکاڵاکە کرایە دیاری بۆ بەرێزیان، بلال لە وتەیەکیدا بۆ تۆری تەکنەلۆژیای زانیاری کوردی ڕایگەیاند: "سەرەتا پەیوەندیم کرد بە کۆمپانیاکەوە و پێیم ڕاگەیاندن کە من زمانی کوردیم زیادکردووە بۆ نەرمەکاڵایەکەتان، بەهۆکمی ئەوەی کە خەڵکێکی زۆر کورد هەن کاردەکەن بەو نەرمەکاڵایە بۆیە پێم باشبوو زمانی کوردی دابنێم ئەگەر بتوانن هاوکارم بن ئەوا زمانی کوردییەکەتان بۆ دەنێرم و پێم خۆشە لە وشانی نوێی نەرمەکاڵاکەتان جێگیری بکەن، ئەمەش هەر لەیەکەم پەیوەندیم لەگەڵ بەڕێوەبەری گەشەپێدەری کۆمپانیای زیمانا بوو کە رەزامەندی دەربڕی ئەگەر تۆ بتوانیت بۆمان بیکەیتە کوردی ئەوا ئێمە کۆدی چالاککردنی نەرمەکاڵاکەت پێ ئەدەین بە درێژایی ژیان سود لە نەرمەکاڵایەکە وەربگریت، واتە بۆ ١٠٠ ساڵ کاردەکات ئەو کۆدە



، وە جاری یەکەم بەم شێوەیە هاوکاریان کردم و منیش بۆم نارد تاوەکو زیادی بکەن دواتر لەلایەن کۆمپانیاکەوە کردمیانە ئەندامی گروپی بەشی وەرگێران و لەگەڵ بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیاکە لە وڵاتی بۆسنە و هەرسک قسەم کرد بەناوی Armagan Tugsal کە ئەویش پێی ڕاگەیاندم کۆدی چالاککردنی نەرمەکاڵاکەت پێ دەبەخشم و دواجار کۆدەکەم داخڵ کرد و نەرمەکاڵاکەم بۆ ماوەی ١٠٠ ساڵ بۆ چالاککرا.

# عەبدوڵا نەورۆڵی: هەڵەبجە تەنها لەڕوی مەعنەویەوە پارێزگایە

پارێزگاری هەڵەبجە، رایدەگەیەنێت؛ حکومەت و زۆربەی وەزارەتەکان هاوکاری و مامەڵە لەگەڵ هەڵەبجە ناکەن و دەڵێت:"بەهۆی دەست بەسەراگرتنەوە نەمانتوانیوە هیچ ئەو پلانە جێبەجێبکەین کە بۆ گەشەپێدانی پارێزگاکە دامانڕشتوە".

عەبدوڵا نەورۆڵی، کە زیاتر لە ساڵێکە وەک یەکەم پارێزگاری هەڵەبجە دەستبەکار بوە لە دیمانەیەکی (سبەی)دا باس لە ئاستەنگەکانی بەردەم پارێزگاکە و ئەو بەڵێنانە دەکات کە پێیاندراوە بەڵام جێبەجێ نەکراون و دەڵێت:"حکومەت بەو ئەرکەی لەسەر شانی بو، ئەگەر تەنها کاسێکی جێبەجێ بکردایە، هەڵەبجە دەبوە پارێزگایەک کە سەربەخۆ و کاریگەرانە کاربکات، بەڵام بەداخەوە ئەوە نەکراوە".

ئەو ئاشکرای دەکات زۆربەی وەزارەتەکان مامەڵەیان لەگەڵ ناکەن، باس لەوە دەکات سەلاحیەت و فەرمانی دارایی دەستی ئەوانیشی کردوە، بەڵام: "وەزارەت هەیە کە دەتوانێت هاوکارمان بێت بەڵام نایکات".

ئەو جەخت لەوە دەکاتەوە کە پلانی گشتیگر و هەمەلایەنەیان هەیە، بەڵام هاتونەتە سەر پارێزگایەکی بێ پارەو خەسفوزرو دامەزراوە، دەشڵێت: هەمو هەوڵماندا بۆ خزمەتکردن و بەردەوامیش دەبین، بەڵام ئەگەر دۆخەکە وەک خۆی مایەوە دەبێت بڕیاری دیکەمان هەبێت.

دیمانە: سبەی

• لە چەند ساڵی ڕابردودا هاوڵاتیانی هەڵەبجە و ئێوەش داکۆکیتان لە بەپارێزگابونی هەڵەبجە کرد و ئەو خەونە و داوایەتانە بەدی هات، بەڵام دوای ساڵێک ئایا بە فیعلی هەڵەبجە وەک پارێزگایەکی سەربەخۆ مامەڵەی کراوە لەلایەن حکومەت و ناوەندەکانەوە؟

- ئەوەی لەم ماوەیەدا وەک پارێزگار هەستم پێکردوە، لە روی ماییەوە کە شتی مەلموس بدات بە دەستەوە نەهاتوە، بەڵام لەڕوی مەعنەویەوە خەڵک بە پارێزگای دەزانێت، بەتایبەت ئەوانەی بە دڵسۆزی لەسەر ئاستی حزب و ڕێکخراوەکان و کەسایەتی و تاک هەوڵیاندا و پێداگریان کرد تا بوە پارێزگا.

حکومەت بەو ئەرکەی لەسەر شانی بو، ئەگەر بەو پرۆژە یاسایەی هەڵەبجەی پێ کرایە پارێزگا تەنها جوڵابێت و کاسێکی جێبەجێکرابە لەڕوی یاساییەوە، هەڵەبجە دەبوە پارێزگایەک کە سەربەخۆ و کاریگەرانە کاربکات، بەڵام بەداخەوە ئەوە نەکراوە و ئەتوانیت لە زۆر روەوە وەک قەزایەکی سەر بە پارێزگای سلێمانی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت.

• باس لەوە دەکرێت کە بەشێک لە وەزارەتەکانیش وەک پارێزگایەکی سەربەخۆ کار لەگەڵ هەڵەبجە ناکەن، ئەمە تاچەند ڕاستە؟

- زۆربەی وەزارەتەکان مامەڵەمان لەگەڵ ناکەن، وەک ئەوەی بێتە پێشەوە بۆ دروستکردنی بەڕێوەبەرایەتیە گشتیەکان، هەندێک لە وەزارەتەکان هاوکاربون، بەڵام زۆربەیان تائێستا هاوکار نەبون.

• بۆ هاوکار نین، پارێزگابون بە شایستەی هەڵەبجە نازانن؟

- لە سەرەتاکەتماندا بۆ وەزارەتەکان کە پەیوەندیدارن بە ئیشوکارەکان لە وەزیرەوە تا ستافەکانی خوارەوە، دان بە پارێزگابونی هەڵەبجە دەنێن و باس لە شانازی بونی پارێزگابونی هەڵەبجە دەکەن، بەڵام هەندێکیان باس لەوە دەکەن کە سەلاحیەتەکانیان دیاریکراوە و فەرمانی داراییش لە ئارادایە دواتر ئەوانە دەکەنە پاساوی هاوکارینەکردنیان.

تا ڕادەیەکیش مەسەلەی دارایی و سەلاحیەت بوەتە گرفت، بەڵام ڕەنگە هەندێکیشیان پێیان خۆشنەبێت بەو شێوەیە بێت و مەبەستیان نەبێت وەک پێویست هاوکاری بکەن.

• ئەو پاساوانە بەجێن و بروابپێهێنەرن، یان دەچنە خانەی بیانوەوە وەک ئەوەی ئێوە تێبینیتان کردوە؟

- بەشێک لەو پاساوانە بەجێن، چونکە ئەوانیش بە ڕێنمایی دەستیان بەستراوە لە دامەزراندنی فەرمانبەری نوێ و فراوانکردنی کارەکانیان یان بودجەیەک بخەنە بەردەست بەڕێوەبەرایەتیە گشتیەکە وەک فەرمانگەیەکی نوێ، چونکە زۆربەی ئەو بەڕێوەبەرایەتیە گشتیانە هەمان هەیکەلیەتی بەڕێوەبەرایەتیەکانی جارانیان هەیە، بەڵام هەشە کە دەزانین دەتوانێت بەڵام نایکەن.

• خەڵکەی ئێوە و هاوڵاتیانی هەڵەبجە دان بەخۆتاندا دەگرن، هەر لەڕوی مەعنەویەوە پارێزگا بن؟

- تائێستا سەبرمان زۆر گرتوە و لەگەڵ پرسەکەدا ڕۆیشتوین، هەر لەسەرەتای دەستبەکاربونمانەوە لە کۆبونەوەمان لەگەڵ ڕێکخراوەکان و بەرپرسانی سەروخۆمان و تەنانەت نوێنەری وڵاتان و ئەتەوە یەکگرتوەکان لە هەرێم، ئەو کێشە و گرفتەکانمان بەهەمویان گەیاندوە و ئەوەی ئاگادارین بەهەند داوکاریەکانمانیان وەرگرتوە و پەیوەندیەکی باشیان لەگەڵ دروستکردوین و بە پەرۆشن بۆ هەڵەبجە.

بەڵام بەداخەوە تائێستا حکومەتی هەرێم نەهاتوەتە پێشەوە بەهیچ شێوەیەک یونەوەی هاوکاریمان بکات، یان تەنها پرۆژە یاساکانیشمان بۆ جێبەجێ بکات کە بۆ بەپارێزگابونی شارەکە دەرکراوە.

ئێستا و لەم ماوەیەی کۆتاییدا چەند کۆبونەوەیەکمان لەگەڵ سەرۆک و جێگری سەرۆکی حکومەت کردوە بۆ کاراکردنەوەی ئەو لیژنە باڵایەی لە وەزیرەکان و جێگری سەرۆکی حکومەت پێکدێن و کۆمەڵێک پێشنیارمان کردوە بۆ سەرۆکی حکومەت و ئەو لیژنەیە و بڕیارە لە ئایندەدا ئەو پارەیەی بۆ هەڵەبجە تەرخان دەکرێت لەلایەن ئەو لیژنەیە و ئەنجومەنی وەزیرانەوە خەرج بکرێت بۆ لانی کەمی چارەسەرکردنی کەمێکی کێشەکان.

بۆیە جارێ کاردەکەین و چاوەڕوانین بزانین کارەکانی ئەو لیژنەیە و ئەنجامەکەی بەچی دەکات، ئەگەر دۆخەکە وەک خۆی مایەوە دەبێت بڕیاری دیکەمان هەبێت، چونکە ئێمەش بۆ خزمەت چوینەتە هەڵەبجە و خەڵک چاوەڕێی خزمەتمان لێدەکات و پلانمان هەبوە بۆ کارکردن و گەشەپێدانی پارێزگاکە، بەڵام بەداخەوە بەهۆی دەست بەسەراگرتنەوە نەمانتوانیوە هیچ لەو پلانە جێبەجێبکەین کە بۆ گەشەپێدانی پارێزگاکە دامانڕشتوە، ئەوەی کردومانە تەنها دروستکردنی هەندێک پەیوەندی تۆکمە لەگەڵ ناوخۆ و دەرەوە و فەرمانگەکان و ڕێکخراوەکان.

• ئەو لیژنە باڵایە هیچی پێدەکرێت بۆ هەڵەبجە؟ لەکاتێکدا پێشتر چەند جارێک ئاماژەتان بەوە کرد، خودی سەرۆکی حکومەت بەڵێنی هاوکاریکردن و خەرجکردنی بودجەیەکی داوە و دواتر جێبەجێنەکراون.

- دوای دەستبەکاربونم وەک پارێزگار، لە یەکەم کۆبونەوەی فەرمیمان لەگەڵ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، وردەکاری پێویستیەکانی هەڵەبجە لە روی مادی و مەعنەوی و سەلاحیەتی ئیداری و یاسایی خستمانە بەردەستی و بەڕێزی بەڵێنی دا ئەو پێداویستیانە دابین بکات و بڕی (٥٠٠) ملیۆن دینار تەرخان بکات بۆ دارشتنی هەیکەلی ئیداری و پڕکردنەوەی کەموکوریەکان. بەڵام ئەوە درێژەی کێشا، چونکە ویستیان بەشێوەیەک بماندەنێ کە دەستبەستراوبین، چونکە ئێستا و لەم ساڵ و چەند مانگەدا مانگی تەنها (٤٠) ملیۆن دینارمان لەبەردەستبوە بۆ هەمو پارێزگاکە کە مانگی واهەبوە بەهۆی رۆتینات و حساباتی وشکەوە نەمانتوانیوە ئەو بڕە نیوەی خەرج بکەین یان تا پارەکە گەیشتوە ئیمە دو هێندە قەرزمان هاتوەتەسەر.

ئێمە داوای دەستکراوەیمان کردوە لە خەرجی و سەلاحیەت کە تائێستا نەماتبوە، بەڵام ئێستا بڕیار دراوە کە ئەو (٥٠٠) ملیۆن دینارەمان وەک مینحە بدەنێ و خۆمان لیژنە بۆ خەرجکردنی و پڕکردنەوەی کەموکوریەکان بیکەین بە پشت بەستن بە ڕێنمایی و ڕێگە زەمینیاریەکان.

• واتە ئێستا ئەو (٥٠٠) ملیۆن دینارە هاتوەتە سەر حیسابی ئێوە؟

- وەک نوسراو و رەزامەندی تەواو بوە، تەنها ئەوەی ماوە بخرێتە سەر ژمارە حسابی ئێمە و بەپێی ئەو پلانەی دامان ناوە قەرزەکانی لێدەدەینەوە و کەموکوریەکانی پێ چارەسەر بکەین.

• پلانی ئێوە چیە بەو بودجانەی چاوەڕوان دەکەن بێتە بەردەستتان، گۆڕانکاریەکی نەوعی پێ بکەن لە پارێزگاکە؟

## بە (٥٠٠) ملیۆن دینار گۆڕانکاری نەوعی ناکرێت

# ئەگەر تا ماوەیەکی دیکە پارتی ناوی کاندیدەکانی نەنارد و وەزارەتی ناوخۆش نوسراو و ناوەکانی بۆ ئەنجومەنی وەزیران بەرزنەکردەوە، ئەو کاتە پرسەکە دەخەینە بەردەم لایەنەکان و خەلکی هەڵەبجە و رای گشتی.

- بە (٥٠٠) ملیۆن دینار گۆڕانکاری ئەوتۆ ناکرێت، چونکە ئێستا بەبەهای (١٤٨) ملیار دینار پرۆژە لە هەڵەبجە وەستاوە بەهۆی قەیرانی داراییەوە، ئەو پرۆژانە هەریەکە و لە ئاستێکی جێبەجێکردندان و وەستاون.
بەڵام برە پارەیەکی لەم شێوەیە سودی ئەوەی دەبێت بۆئەوەی کەموکورتی و گرفت و ئاستەنگەکانی فەرمانگەکان و ئەکویتی پارێزگای پێ چارەسەر بکەین، واتە بۆ ئیشی ئالی و کۆمەڵێک پرۆژەی بچوك و کڕینی پێداویست و هاوکاری قائیمقامیەت و شارەوانی و چارەسەری کێشەکانی بینای پارێزگا.

• واتە ئەم برە تەنها بەشی پڕکردنەوەی کەمێکی کەموکورتیەکانی هەڵەبجە دەکات؟
- بەڵێ، ئەمە بۆئەوە نیە ئەنفاقات پارە بۆ ئەو پرۆژانە خەرج بکرێت کە راگیراون، ئەمە پارەیەکە لەبەردەستە بۆ پڕکردنەوەی کەموکوری دیوانی پارێزگا و بەڕێوەبەرایەتیەکان کە ئێستا لەسەر سێیەکی ئەماون و کێشەی رۆژانەیان هەیە، چونکە ئێمە کە دەستبەکاربوین خاوەنی یەك قەلەم و یەك دینار نەبوین و لەرێگەی خەڵك و خێرخوازانەوە لەماوەی (١٩) رۆژدا بیناکەمان تەئسیس کرد.

• پارێزگایەکی وەك هەڵەبجە شایستەیە بەو شێوەیە بشێلدرێت؟
- ئێمە کە لەگەڵ کاربەدەستان گفتوگۆی ئەو پرسانەمان کردوە، بۆنمونە وەزیری ناوخۆ کە ئێمە لەروی ئیدارییەوە سەر بە وەزارەتی ناوخۆین، دڵی پەروەدا ناوە و وتی:"پارێزگایەکی وەك هەڵەبجە دەبێت بودجەیەکی دو ملیار دۆلاری لەبەردەست بێت بە هەمو سەلاحیەتەکانیەوە ئینجا دەبێت بە پارێزگایەکی نمونەیی"، بەڵام ئێمە نە سەلاحیەتەکانمان هەیە نەك دو ملیار دۆلار بەڵکو دو ملیار دینار و تەنانەت (٢٠) ملیۆن دینارێشمان نیە.
بۆیە ئەگەر منیش و ئەویش قەناعەتی وا بێت هەڵەبجە پێویستی بە بودجەیەکی زەبەلاح هەیە، بەڵام بۆی دابین نەکرابێت و هیچی لەبەردەست نەبێت، بۆیە هەقە تەقدیری ئەو خەڵکە بکرێت کە لەماوەی سال و چوار مانگی رابردودا توانیویانە پەیوەندی و هەماهەنگی دروست بکەین و ماندو بون و دڵی خەڵکیان رازی کردوە و توانیویانە ئیشەکانیان تائێستا ببەن بەڕێوە.

• ئەگەر بودجەیەکی وەك ئەوەی دەتانەوێت بۆتان دابین بکرێت، پلانتان چیە بۆ گەشەپێدانی پارێزگاکە؟
- پلانمان بۆ زۆربەی سێکتەرەکان داناوە کە چۆن بەرەوپێشیان ببەین، بەتایبەت کەرتی کشتوکاڵ کە هەڵەبجە ناوچەیەکی بەپیت و بەرفراوانی کشتوکاڵی هەیە و پلانمان هەیە چۆن کاربکەین بۆ بوژاندنەوەی ئەو زەویە کشتوکاڵیانە و زیادکردنی بەرهەمی جوتیاران و خستنەگەڕی خەڵکی سنورەکە.
هەروەها هەڵەبجە و دەوروبەری و بەو ئاسنامەیەش کە هەیەتی، ناوچەیەکی گەشتیاریە و خەڵك زۆر دێنە سەردانی، بۆیە پلانمان هەیە لەو روشەوە بیبوژێنینەوە بە پشت بەستن بە کەرتی تایبەت و کەرتی گشتی.
ناوچەیەکی سنوریشە، تائێستا لە هەوڵی ئەوەین مەرزی شوشمێ تەوێڵە بکەینە مەرزێکی نێودەوڵەتی، لە رابردوشدا لەگەڵ پارێزگای سنە رێککەوتین بە شێوەیەکی نیمچە فەرمی مەرزی (توخود) کردوەتەوە کە ئێستا رۆژانە (٢٠٠) ئۆتۆمبێل هاتوچۆی پێدا دەکات و ئاڵوگۆڕی جولەیەکی دروستکردوە.
بۆیە ئەگەر بودجە و دەسەلاتمان هەبێت، دەتوانین هەڵەبجە بکەینە ئەو پارێزگایەی خەڵك هیوای بۆ دەخوازێت، بەڵام بەداخەوە ئێمە هاتوینەتە سەر ساجی عەلی بێ ئەوەی پارە و خاسخۆر و دامەزراوەمان هەبێت.

• رەنگە لەسەروخۆتانەوە پاساوی قەیرانی دارایی بهێنرێتەوە بۆ هاوکاری نەکردنتان، بەڵام بۆ خۆتان لەرێی کەرتی تایبەت و وەبەرهێنەرانەوە دەرچەیەك بۆ دەربازکردنی پارێزگاکە ناکەنەوە؟
- ئێمە پەیوەندیەکی فراوانمان لەگەڵ کۆمەڵێك وەبەرهێن دروستکردوە پلان و پرۆژەمان خستوەتە بەردەست و بەشێکی هاوکاریمان پێداون بۆئەوەی کاری لەسەر بکەن، زۆربەیان هاتون و کارەکانیشیان دەستپێشان کردوە.
بەڵام بەهۆی ئەم دۆخەی دروستبوە و ئەو قەیرانەی هەیە کە بەشێوەیەکی بەرچاو لەسەر کارەکانی ئەوان رەنگی داوەتەوە و ئیش و کاریان وەستاوە و سیولەکانیان لای حکومەت بوەتە قەرز، بەڵام هەر ئومێدمان هەیە کە کاربکەین لە بواری دروستکردنی کارگە و بالەخانە و شوێنی نیشتەجێکردن و کشتوکاڵ و تەنانەت دروستکردنی کارەبای خۆجێی بەوانە دەتوانین هەڵەبجە بیوژێنینەوە.
ئەی بەغدا دەروازەیەکی دیکە نیە بە روی هەڵەبجەدا؟
- تائێستا عێراق بە فەرمی هەڵەبجەی وەك پارێزگا نەناساندوە و بە نوسراو ئاماژەیان بەوە کردوە کە کۆمەڵێك ئیجرائات ماوە تەواو بکرێت بۆئەوەی هەڵەبجە وەك پارێزگا بناسێنرێت، ئەوەش کێشە بۆ فەریوکردنەوە و تەرخانکردنی بودجە دروست دەکات.
بۆیە ئێستا لەرێی ئەو لیژنە باڵایەی هەیە کارمان لەسەر ئەوە کردوە شاندێکی هەڵەبجە بچێتە بەغدا بۆ تەواوکردنی رێکارەکان و داواکردنی ئەو بودجانەی لە پرۆژەی بودجە بۆمان تەرخانکراوە.
ئێمە هەشت مانگە کار لەسەر ئەم هەوڵانە دەکەین و لەرێی پەرلەمانتار و جێگری سەرۆکی پەرلەمان و هەندێك لە وەزیرەکانەوە هەوڵی دیکەشمان داوە، ئێستا پەیوەندیمان بە نوسینگەی سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیرانی عێراق کردوە بۆ دیدار و کۆبونەوەمان لەپێناو چارەسەرکردنی ئەو پرسانە.

• پێکنەهێنانی ئەنجومەنی پارێزگا، کێشەیەکی دیکەی هەڵەبجەیە، بۆ بوەتە گرێکوێرە؟
- ئەوە پرسێکە زیاتر پەیوەندی بە لایەنە سیاسیەکانەوە هەیە، حیزبەکان سەرەتا رێککەوتن بەپێی بەرکەوتەی هەڵبژاردن کاندیدەکانمان رادەست بکەن، ئێمە لە کۆبونەوەی جدی بوین لەگەڵیان تا لە مانگی (١٠)ی ساڵی رابردو بریاڵاردرا لەماوەی دە رۆژدا ناوەکانمان دروستکرا بەڵام هەر ناوەکانمان رادەست نەکرا.
لە مانگی شوباتی ئەمساڵ چەند کۆبونەوەیەکی دیکەمان کرد، تا لە مانگی ئازاری ئەمساڵ یەکێتی و بەشێکی گۆڕان لەگەڵ بزوتنەوە ناوەکانیان رادەستکردین و دوای فشارەکان لەم کۆتاییانەدا حیزبەکانی دیکەش ناوەکانیان رادەستکردین، تەنها پارتی کە پێیوایە دەبێت ئەندامی زیاتریان بۆ دابنرێت و چوار ئەندامیان هەبێت.
ئێمە لەرێی بەرپرسی لقی هەڵەبجە و وەزیری ناوخۆ کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتیە داوامان کرد فشار بکەن بۆ پێشکەشکردنی ناوی کاندیدەکانیان بۆئەوەی هەڵەبجە، هەڵەبجەی هەموانە و نەکرێتە قوربانی کاندیدێك، بەڵام هەر نەهاتنە پێشەوە.
بۆیە نزیکەی مانگێکە ئەو ناوانەی رادەستمان کراون و کاندیدی لایەنەکانن، بە نوسراوی رەسمی ئاراستەی سەرۆکایەتی و وەزارەتی ناوخۆمان کردوە بۆئەوەی بۆ ئەنجومەنی وەزیران بەرزیبکرێتەوە، بەڵام تائێستا ئەو ناوانە بەرز نەکراونەتەوە بۆ ئەنجومەنی وەزیران، دوێنێش (دوشەممە) بۆ بەدواداچونی ئەو پرسە سەردانی وەزارەتی ناوخۆم کرد و ویستم وەزیر ببینم بەڵام لەوێ نەبو.
پێموایە ئەگەر پارتی ناوی کاندیدەکانی بنێرێت کارەکانی ئەو پرسە زیاتر و خێراتر بچێتە پێشەوە، بۆئەوەش لە چەند رۆژی رابردودا ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی پارتی سەردانی ئێمەی کرد و دوبارە داوامان کرد ناوی کاندیدەکانیان رەوانە بکەن.

• هەڵەبجە لە چاوەڕوانی پێکهێنانی ئەنجومەنەکەیدایە، بۆ فشاری زیاتر ناکەن؟
- ئێستا ئەو پرسە لە وەزارەتی ناوخۆیە، ئەگەر تا ماوەیەکی دیکە پارتی ناوی کاندیدەکانی نەنارد و وەزارەتی ناوخۆش نوسراو و ناوەکانی بۆ ئەنجومەنی وەزیران بەرزنەکردەوە، ئەو کاتە پرسەکە دەخەینە بەردەم لایەنەکان و خەڵکی هەڵەبجە و رای گشتی.
لەگەڵ هەمو ئەو کێشەو گرفتانەشدا، ئێمە کۆڵنادەین لە داواکاری و فشارەکانمان لەپێناو خزمەتکردنی هەڵەبجە و خەڵکەکەی

**"ئێستا لە هەوڵی ئەوەین مەرزی شوشمێ تەوێڵە بکەینە مەرزێکی نێودەوڵەتی"**

# زانکۆی هەڵەبجە و سێ زانکۆی هەولێر یەک هەڵوێستن

**جیهاد هەورامی**

مامۆستایان و فەرمانبەرانی زانکۆی هەڵەبجە، هاوشێوەی هەر سێ زانکۆکەی هەولێر نارەزایەتی نیشاندەدەن لەبەرامبەر سیستەمی پاشەکەوتی مووچە و دواکەوتنی مووچەکانیان و هۆشیاریش دەدەن، کە ئەگەر رەوشەکە بەم شێوەیە بەردەوامبێت ساڵی نوێی خوێندن دەستپێناکەنەوە.

پاش ئەوەی کە هەر سێ زانکۆی سەلاحەدین و و هەولێری پزیشکی و پۆلەتەکنیکی هەولێر بەیاننامەیەکیان بلاوکردەوە لەسەر رەوش و گوزەرانی مامۆستایان و فەرمانبەران و نارەزایەتیان نیشاندا دواکەوتنی مووچە و سیستەمی پاشەکەوت، زانکۆی هەڵەبجەش هاتە ریزیان و بەیاننامەیەکی نارەزایی بلاو کردەوە.

سۆزان حەسەن، فەرمانبەری سەرۆکایەتی زانکۆی هەڵەبجە لەمبارەیەوە بە رۆژنیوزی راگەیاند:"بەداخەوە دوای چەندین جار ئاگادار کردنەوەی حکومەت و لەلایەنی پەیوەندیدار لەسەر کەموکورتی و گیروگرفتەکانی زانکۆی هەڵەبجە، بەڵام بەداخەوە دوای چەندین بەڵێن هێشتا یەک لەو کێشانە چارەسەر نەکراون و سەرباری ئەوەش بەهۆی قەیرانی دارایی مووچەکانمان بەرێژەی زۆر پاشەکەوت دەکرێت و چەند مانگ جاریکیش پێمان دەدرێت".

سۆزان حەسەن، وتیشی:" دوای ئەوەی چەند زانکۆ و پەیمانگایەک بەیاننامەی نارەزاییان بلاوکردەوە و رایانگەیاند، کە لەئەگەری چارەسەرنەکردنی کێشەکان و جێبەجێ نەکردنی داواکاریەکانیان ئامادەنابن دەست بەدەوام بکەنەوە، ئێمەش لەزانکۆی هەڵەبجە بەیاننامەیەکمان ئاراستەی رای گشتی و لایەنی پەیوەندیدار کرد و پشتگیری و پاڵپشتی هەڵوێستی ئەوان دەبین".

لەلایەکی تریشەوە موجاهید ئەمین، مامۆستا لە زانکۆی هەڵەبجە بە رۆژنیوزی وت:"لەراستیدا سیستەمی پاشەکەوت بەپێی گوێدانە هیچ پێوەرێک نەخوازەوە بۆ سەرەوە بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاریگەری ئەرێنی کردۆتە سەر خەڵکی هەرێمی کوردستان، ئێمەش وەک چینی مامۆستایان بەهەموو شێوەیەک ئەم سیستەمە رەتدەکەینەوە، چونکە مامۆستا جیا لە هەمو چین و توێژێک پەیوەندی راستەوخۆی بە ئایندە و داهاتووی خەڵکی کوردستانەوە هەیە".

موجاهید ئەمین، وتیشی:"دەستبردن بۆ قووت و برینی مووچەی مامۆستایان دەستبردنە بۆ ئایندەی رۆڵەکانمان کوشتن و لەناوبردن و بەکام زانینی زانستە و خەمساردیە بەرامبەر ئەم کارە نابەجێیە، بەڵام دیارە حکومەت و دەسەڵات زۆر بێباکن لە دواکەوتن و بەپاشکەوتنی زانست".

ئەو مامۆستایەی زانکۆی هەڵەبجە، رایشیگەیاند:" مامۆستا راستەوخۆ کاریگەری لەسەر سەرجەم چین و توێژەکان هەیە، شێواندنی سیستەمی پەروەردە و زانست لە رێگەی ئەم سیستەمەی حکومەتی هەرێم پیادەی دەکات راستەوخۆ کاریگەری هەیە لەسەر سەرجەم کایەکانی ژیان، بۆیە وەک مامۆستایانی زانکۆی هەڵەبجە پشتگیری لە بەیاننامەکە دەکەین، کە دوێنێ ئاراستەی رای گشتی و لایەنی پەیوەندیدار کراوە".

سەرچاوە:رۆژ نیوز




**هەڵەبجە-ساڵیادی بۆردومانی غۆتەی سوریای کردەوە بەچەکی کیمیاوی**

# هەمیشە من وام

شیعری : ئیبراهیم هەورامانی



[ ١ ]

دەزانم ... باش دەزانم ،
وات پێخۆشە
بڵێ ی ،
چەند عەجولی ،
هەروەك ئەو منداڵانەی ،
بەیانیانێکی زوو ....
گەرەك پڕ دەکەن ،
لە قڕو قاڵ .
دەزانم ...باش دەزانم ،
دوای بینینی یەکتری ،
دوای ئەوەی ،
من دەمەوێ بڵێم
تۆ دەتەوێ بڵێ ی
هیچ نالێین و
هەموو شتێکیشمان ووتوە ..
تۆ لە بلی خۆتا ،
پێم دەڵێ ی :
ئای چەند خۆشم دەوێ ی ،
عەجولە ،
گەنمەشەکەی کۆڵانی ئەو دیوو .
وا دەڵێ ی ،
من هەست دەکەم ...
خوا بەپەلە
زستان ...
هاوین ...
پاییز ....
دەباتەوە بۆ خۆی و
بەدرێژایی ساڵ
بەهار لای ،
من و
تۆ .
بەجێدێڵێ .
دەزانی ،
تامی ئەم بەهارە ،
جیاواز ترە .
لە بەهارەکانی لای خوا ....

[ ٢ ]

ئەگەر تۆ نەبای ،
چیم دابوولە ناودانی باخچە
لەرواندنی گوڵ .
وەك هەر کەسێ تری
ئەم شارە جەنجالە ...
دەچووم
بەدەم کاری خۆمەوە .

هەڵەبجە نیوز
لەهەڵەبجەدەردەچێت
ساڵی یەکەم ژمارە(٥)ئاب ی ٢٠١٦
موبایل: ٠٧٥٠٨٢٥٤٦٠٦
فەیسبوک: حلبجە نیوز

دوالپەرە

پیرموحەمەد لەحەفتاکانی سەدەی ڕابردودا

## ئینستیوتی بانگخوازان خولێکی ڕاگەیاندن دەکاتەوە

بەشی ڕێنمونی و ڕاگەیاندنی نوسینگەی هەڵەبجەی ئینستیتوتی بانگخوازان بەهاوکاری بەشەکانی تر خولێکی ڕاگەیاندن بۆ بوارەکانی (کامێرامانی ومۆنتاژ) کردەوە بۆ ژمارەیەک لەئارەزوومەندانی بوارەکە ڕۆژی ٢٣ی١١ی ١٤٣٧ ک ٢٦ی٨ی٢٠١٦ لەئاهەنگێکدا بەشداربوان خەڵات کران.

بایەخ بە کاروباری پارێزگای هەڵەبجە دەدات
ژمارە(٦١)
ئەیلول-ی ٢٠١٦
خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەر
سەلاح سەعید ئەمین

# هەڵەبجە نیوز
Halabja News

# نارەزایەتییەکان فراوان دەبن

## قوتابخانەکان ناکرێنەوە

هەڵەبجە نیوز –سەرچاوەکان

زیاتر لە (٨٠) بەڕێوەبەری خوێندنگەی ئامادەیی و بنەڕەتی لە پارێزگای هەڵەبجە، بڕیاریاندا خوێندن بایکۆت بکەن.
زیاتر لە (٨٠) بەڕێوەبەری خوێندنگەی ئامادەیی و بنەڕەتی لە پارێزگای هەڵەبجە، لە هۆڵی خوێندنگەی بورهانی حاجی محەمەد کۆبونەوە.لەو کۆبونەوەیە، بەڕێوەبەرەکان بەکۆی دەنگ بڕیاریاندا ڕۆژی ٢٧ی ئەیلول و لەیەکەم ڕۆژی دەستپێکی نوێی ساڵی خوێندندا، دەرگای خوێندنگاکان نەکەنەوە تا ئەوکاتەی حکومەت ناچار دەبێت مافە سەرەتاییەکانیان بۆ دابین بکات.
لەلایەکی تریشەوە،مامۆستایانی نارازی و دەستەی داکۆکیکاری مافی مامۆستایان ،ئامادەکاری تەواو دەکەن بۆ ئەنجامدانی خۆپیشاندانی سەرتاسەری ٢٧ی مانگ .
نوێنەری مامۆستایانی نارازی هەڵەبجەش دەڵێت: پێکهێنانی لیژنەی داکۆکیکار لەمافی مامۆستایان هەمان سیناریۆی ساڵی ڕابردووە بۆ شکاندنی بایکۆتی مامۆستایان.زیاتر ل ٢


کەرتی پەروەردە لەلێواری هەرەسدایە

## نوێنەرایەتی لیژنەی ئۆلۆمپی عێراق لەهەڵەبجە دەکرێتەوە

ڕاگەیاندنی پارێزگا

وەفدێکی هاوبەشی لیژنەی ئۆلۆمپی کوردستان و عێراق سەردانی هەڵەبجەیانکرد و لەگەڵ پارێزگار و جێگری پارێزگار و نوێنەری یانە وەرزشییەکانی هەڵەبجە کۆبوونەوە.ئامانجی سەردانەکە بۆکردنەوەی نوێنەرایەتی لیژنەی ئۆلۆمپی عێراقە لە هەڵەبجە.وەفدەکە پیرۆزبایی خۆیان لەبەپارێزگابوونی هەڵەبجە کرد و باسیان لەوەکرد هەڵەبجە پێگەیەکی گەورەی لەدڵی ئەواندا هەیە. هەوڵیش دەدەن لەبواری وەرزشدا هەڵەبجە لەسەر ئاستی هەموو عێراق ناووناوبانگی زیاتری هەبێت.
پارێزگاری هەڵەبجە بەخێرهاتنی وەفدەکەی کرد و دەستخۆشی لێکردن بۆ هەوڵەکەیان، هاوکاری و پشتیوانی پارێزگای بۆ وەفدەکە دووپاتکردەوەو دواتر وەفدەکە خەلاتی ڕێزلێنانیان بەخشی بەهەریەک لە پارێزگارو جێگری پارێزگاری هەڵەبجە.

## کەمپینی کامیل بۆ ژیانەوە گردبونەوەیەکی نارەزایەتی ئەنجامدا

ڕۆژنیوز – جیهاد هەورامی

وەک لێگەڕانێک بەرامبەر بە ئاوچێگیری دۆخی تەندروستی بریندارانی چەکی کیمیاوی و هۆکارەکانی ئەوانەکردنی ئەو ئەنفوشتنەیەی، کە ئێستە بەهەزاری بریندارانی چەکی کیمیایی، کەمپینی کامیل بۆ ژیانەوە لەگەڵ کۆمەڵێک لەچالاکوانی کۆمەڵگەی مەدەنی گردبونەوەیەکی نارەزایەتیان ئەنجامدا.
بەشداربوانی کەمپینی کامیل بۆ ژیانەوە لەبەردەم ئەنفوشتنە ئەوانەکراوەکەی قوربانیانی چەکی کیمیایی و ژمارەیەک لە چالاکوانان گردبونەوەیەکی نارەزایەتیان ئەنجامدا و بەیاننامەیەکی نارەزایەتیان خوێندەوە عومەر سالح ئەندامی کەمپینی کامیل بۆ ژیانەوەوتی: ئێمە وەک کەمپینی ژیانەوە لە ئەمەرواری ٢٠١٦/٨/٢٢، لە بەیاننامەیەکدا خۆمان و هاوشاریانی هەڵەبجە و هۆشداریمان سەبارەت بە خراپی باری تەندروستی بریندارانی چەکی کیمیایی هەڵەبجە بەگشتی و مامۆستا کامیل بەتایبەتی خستەڕوو، خۆشبەختانە پاش گەیاندنی داواکەمان لەڕێگەی کەسانی دڵسۆز داواکەمان پەشێراپی وەلام درایەوە
عومەر سالح وتیشی: ئێمە وەک کەمپین تەنها چاومان لە مامۆستا کامیل نییە و تەواوی بریندارانی چەکی کیمیایی بەخشاوی چارەسەر دەبینین.
ناوبراو، ئەوەشیوت: لەبەردەم ئەم ئەنفوشتنە بێناژە ئەواو ئەنگراوە نیگەرانی خۆمان دەردەبڕین و داوای ڕوونکردنەوە دەکەین.

## بەڕێوەبەرایەتی گشتی وەبەرهێنان کرایەوە

:سبەی
لە چوارچێوەی پێکهێنانی ئیدارەی پارێزگای هەڵەبجە، بەڕێوەبەرایەتی گشتی وەبەرهێنان لەو شارە کرایەوە وەفدێکی بەڕێوەبەرایەتی گشتی وەبەرهێنانی پارێزگای سلێمانی، سەردانی پارێزگای هەڵەبجەی کرد و بە ئامادەبوونی پارێزگاری شارەکە و جێگرەکانی، لەگەڵ قائیمقام و بەڕێوەبەری ناحیەو سەرۆک شارەوانی سنوورەکەدا کۆبوونەوە.
لەوبارەیەوە عەلی عوسمان، پارێزگاری هەڵەبجە بە وەکالەت، ڕایگەیاند: مەبەستی سەردانەکەی وەبەرهێنانی پارێزگای سلێمانی بۆ کردنەوەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی وەبەرهێنانی هەڵەبجە بوو، بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە بتوانرێت بە شێوەیەکی باشتر کارئاسانی بۆ وەبەرهێنەران و سەرمایەدار و بازرگانان بکرێت و سەرنجیان بۆ کارکردن لە سنووری پارێزگای هەڵەبجە ڕابکێشرێت.

مودریک عەلی
ستەمکار بێویژدانە
..ل ٣

مامۆستایان
پاشەکەوتی موچە
رەتدەکەنەوە
..ل ٣

هۆشیار ئەحمەد
دەرویش
سەلماندنەوەی نارەزایی
..ل ٤

# قوتابخانەکان ناکرێنەوە

## ٨٠ بەرێوەبەر کۆدەبنەوەو بریاری بایکۆت دەدەن

## چەتری نارەزایی خەڵك داوای خۆپیشاندانی مەدەنیانە دەکات

## دەستەی داکۆکی لەمافی مامۆستایان زەنگی بایکۆت لێدەدات

هەڵەبجە نیوز،سبەی،رۆژ نیوز

زیاتر لە (٨٠) بەرێوەبەری خوێندنگەی ئامادەییو بنەرەتی لە پارێزگای هەڵەبجە، لە هۆڵی خوێندنگەی بورهانی حاجی محەمەد کۆبونەوە.
لەو کۆبونەوەیە، بەرێوەبەرەکان بەکۆی دەنگ بریاریاندا رۆژی ٢٧ی ئەیلولو لەیەکەم رۆژی دەستپێکی نوێی سالی خوێندندا، دەرگای خوێندنگاکان نەکەنەوە تا ئەوکاتەی حکومەت ناچار دەبێت مافە سەرەتاییەکانیان بۆ دابین بکات، هاوکات چەتری نارەزایی خەڵك لەبەیاننامەیەکدا داوایکرد: تکایە بە داخستنی دەرگای فەرمانگەکەت و راگرتنی دەوام ، دوایین دەرفەت بدە بە حوکمرانانی هەرێم و کۆتای هێنان بە قەیرانەکان و دروست کردنی کەشێکی لەبارو ئاسایی بۆ ژیان و پاراستنی مافی هاوڵاتیان بە گشتی .
بریارە دروستەکە بدە ن و بە پشتیوانی هەموان ئەم نیشتیمانە لە کەوتنی یەکجاری رزگار بکە و بەشداربە لەرێپێوان و خۆپیشاندانە مەدەنیە شارستانیەکەی هەڵەبجە..
پاش ئەوەی نیوەرۆی ئەمرۆ بەرێوەبەری ٨٠ خوێندنگای سنوری پەروەردەی پارێزگای هەڵەبجە لەکۆبونەوەیەکدا لیژنەیەکیان بۆ داکۆکی لەمافی مامۆستایان پێکهێنا، بەڵام بەرێوەبەرێکی خوێندنگایەکی هەڵەبجە وەك نوێنەری مامۆستایانی نارازی رەخنە لەو لیژنەیە دەگرێت و لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا دژی پێکهێنانی ئەو لیژنەی چەند خاڵێکی خستەروو.عومەر عوسمان، ئەندامی دەستەی مامۆستایانی نارازی هەڵەبجە لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا رایگەیاند:»پاش ئەوەی وەك بەرێوەبەرێك بانگهێشتی کۆبونەوەکە کرام، لەدوای پێشنیار و قسەی زۆرێك لە بەرێوەبەرانی ئامادەبوو ئەوەم بۆ روونبویەوە کە پێکهێنانی ئەم لیژنەیە هەمان سیناریۆکانی سالی رابردون و ناتوانن ببنە نوێنەری راستەقینەی مامۆستایانی نارازی بۆ بەدەستهێنانی ماف و داواکاریەکانیان.
دەستەی داکۆکی لەمافی مامۆستایانیش کاتژمێر هەشت رۆژی ٢٧ی ٩ کەیەکەم رۆژی دەستپێکردنەوەی دەوامی قوتابخانەکانە زەنگی بایکۆت لێدەدات و لەبەردەم پەیکەری مامۆستای نەناسراو لەهەڵەبجە چالاکیەك ئەنجامدەدەن.

# بەرێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵ لەپارێزگای هەڵەبجە دەکرێتەوە

## وەزیری کشتوکاڵ: پێویستە حکومەتی هەرێمی کوردستان و لایەنە سیاسییەکان بایەخی زیاتر بەپارێزگای هەڵەبجە بدەن و قارەمانێتی و قوربانیدانی خەڵکی ئەم ناوچەیە بەهەند وەربگرن

ە
سایتی پارێزگای هەڵەبجە

رۆژی سێشەممە ٩_٨_٢٠١٦، پارێزگاری هەڵەبجە لەگەڵ وەزیری کشتوکاڵ لەدیوانی وەزارەتی کشتوکاڵ کۆبووەو لەکۆبوونەوەکەدا باس لەچەندین بابەتی پەیوەست بەکەرتی کشتوکاڵ لەپارێزگای هەڵەبجە کراو جەختکرایەوە لەسەر پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان، بەوپێیەی ناوچەکە کشتوکاڵیەو پێویستی بەکردنەوەی بەرێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵ هەیە.

لای خۆیەوە وەزیری کشتوکاڵ ئاماژەی بەوەکرد پێویستە حکومەتی هەرێمی کوردستان و هەموو لایەنە سیاسییەکان بایەخی زیاتر بەپارێزگای هەڵەبجە بدەن و قارەمانێتی و قوربانیدانی خەلکی ئەم ناوچەیە بەهەند وەربگرن.

لەکۆبوونەوەکەدا پارێزگاری هەڵەبجە باسی لەوەکرد پارێزگای هەڵەبجە پارێزگایەکی نوێیەو پێویستی بەدامەزراندنی بەرێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵ هەیە بەوپێیە ناوچەکە ناوچەیەکی گرنگی کشتوکالیە، لای خۆیەوە وەزیری کشتوکاڵ رایگەیاند:» پێویستە رۆتینی جێبەجێکردنی ئەو داواکاریە وەلابنرێت و بەزووترین کات بکرێتەوە، لەکۆبوونەوەکەدا باس لەهەماهەنگی نێوان وەزارەتی کشتوکاڵ و پارێزگای هەڵەبجە کرا بۆ پێشخستنی کەرتی تایبەت و کردنەوەی پرۆژەو کارگەی تایبەتی پیشەسازی، کەپشت بەبەروبوومە کشتوکاڵیەکان ببەستێت بەتایبەتی بەرهەمی هەنار و تەماتە، بەشێوەیەکی گشتی چەندین بابەتی دیکەی پەیوەندیدار بەسێکتەری کشتوکاڵ و ئاودێری و ڤێتێرنەری لەلایەن پارێزگاری هەڵەبجە و وەزیری کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو گفتوگۆیان لەبارەوە کرا.

# وەکیل وەزیری یەکەمی وەزارەتی خارجی عێراق وباڵوێزی عێراق لە ئۆکرانیا سەردانی پارێزگای هەلەبجەیان کرد

راگەیاندنی پارێزگا
رۆژی ٢١-٩-٢٠١٦،نزارخیراللە وەکیل وەزیری یەکەمی وەزارەتی خارجی عێراق وبکرجاف باڵوێزی عێراق لە ئۆکرانیاو شاندی وەزارەتی دەرەوەی عێراق سەردانی پارێزگای هەڵەبجەیان کردو،لەگەڵ پارێزگاروجێگری پارێزگار کۆبوونەوە

لە کۆبوونەوەکەدا بەبایەخەوە باس لە بە پارێزگابوونی هەڵەبجە کرا نزارخیراللە لای خۆشیەوە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە پشتگیرو پشتیوانی هەڵەبجە دەبن وبریاروایەلەچوارچێوەی سەردانەکەولە پاش گەرانەوەیان کاربکات بۆ پارێزگای هەڵەبجە لەسەردان کردنی وەفدی پارێزگای هەڵەبجە بۆئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق لە رێگای بەرێزیانەوە

پارێزگاری هەڵەبجە کۆمەڵێك یاداشت پرۆژەی گرنگی بە یان کرد لە کۆبونەوەکەدا لە چوارچێوەی خزمەتکردن بۆپارێزگای هەڵەبجە

لەکۆتای سەردانەکەداپارێزگاری هەڵەبجە سیمبولی هەڵەبجەی پێشکەش بە سەرۆکی شاندەکە کرد



# ستەمکار بێ ویژدانە!

## مودریك عەلی عارف

من بڕوای تەواوم بەوە هەیە کە دەسەڵاتدارە سیاسییە سەرمایەدارەکانی ئەم وڵاتە، لە ویژدان مردووترین سیاسییە دەسەڵاتدارەکانی ئەم گۆی زەوییەن، هەرچییان لەدەست هاتووە کردوویانە و دەشیکەن و درێغی ناکەن لە ستەم و گەندەڵی و دزی و کاری نارەواو نائەخلاقی بوونیان... ئەوان تا ئەو رادەیە بێباکن کە لە پێناو مانەوەی زیاتری خۆیان و بنەماڵە و حیزب و ئایدۆلۆژیاکەیاندا هەموو میللەت بکەنە قوربانی و رووباری خوێن دروست بکەن و خوێنی تاك بە تاکی ئەم گەلە بمژن!!

بەڵام خەفەتی ئەوە زۆر دەخۆم کە ئەم ستەمکارە گەندەڵ و بێ ویژدانانە، هەر ئەم میللەتە ستەملێکراو و چەوساوە پشتیوانی کردن و دەنگی پێدان و سیخوری و راپۆرت نووسییان بۆ دەکردن و بە شانازیان دەزانی و بەو شێوەیە مووچەیان وەردەگرت و بە پارەی نارەوا خۆیان و منالەکانیان ژیان... بۆیە ئێستە و هەر لەم دونیا ئەو ئاگری ستەمە خۆشیان دەسوتێنێ و ژیانیان تاڵ دەکات... خوا بکات سوتان و ئاگری قیامەتیشی بەدوادا نەیەت و دەرفەتی پەشیمانی و تەوبە کردنی ئەم میللەتە مابێت.

**ئەم ستەمکارە گەندەڵ و بێ ویژدانانە، هەر ئەم میللەتە ستەملێکراو و چەوساوە پشتیوانی کردن و دەنگی پێدان**

**خوایەگیان! پەنات پێ دەگرین کە ئەگەر تەنها بۆ چرکەیەک و لە بچوکترین کار و هەڵوێستدا پشتگیری ستەمکارانمان کردبێت و خۆمان دابێتە پەنای ستەم و نادادییەکانیان**

خوایەگیان! پەنات پێ دەگرین کە ئەگەر تەنها بۆ چرکەیەك و لە بچوکترین کار و هەڵوێستدا پشتگیری ستەمکارانمان کردبێت و خۆمان دابێتە پەنای ستەم و نادادییەکانیان.

خوایەگیان! لەمە زیاتر دەرفەتی ستەمکاران مەدە، تاوەکو بەهۆی ستەمی ئەوان و پشتیوانی بەشێك لە ستەملێکراو و چەوساوەکان بۆیان، خەڵکی بێ تاوانی دیکەش نەسوتێ و لەم سەختی ژیان و بژێوی و بێ مووچەییەدا نەمێننەوە... ستەمکارانیش زەلیل و سەرشۆڕ و ریسوا و کەنەفتی دونیا و دوارۆژ بکە

___ئەکاونتی نوسەر لەفەیسبوك

# مامۆستایانی کوردستان سیستمی پاشەکەوتی مووچە رەتدەکەنەوە

## PUKmedia جەواد حەیدەری

گردبوونەوەی لقەکانی یەکێتی مامۆستایان داوای باشکردنی گوزەرانی مامۆستایان و مووچەکەیان دەکات.

سەر لەبەیانی ٢٥-٩-٢٠١٦ گردبوونەوەی یەکێتیی مامۆستایانی هەرێمی کوردستان لەسەرتاسەری شار و شارۆچکەکانی هەرێمی کوردستان و سەرجەم لقەکانی یەکێتی مامۆستایان بەمەبەستی نارەزایی دەربرین بەرامبەر دواکەوتنی مووچە و سیستمی پاشەکەوتی مووچە دەستپێیکرد.

لەسەرجەم گردبوونەوەکاندا بەیاننامەی مەکتەبی سکرتاریەتی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان خوێندرایەوە.

لە میانی بەڕێوەچوونی گردبوونەوەکەشدا مامۆستایانی هەولێر رەخنەیان ئاراستەی لقی هەولێری یەکێتی مامۆستایانی کوردستان کرد و رایانگەیاند کە لقی هەولێری یەکێتی مامۆستایان هەوڵی بچووکردنەوەی نارەزایەتیەکان دەدات و دەوێت وانیشان بدات کە مامۆستایانی هەولێر بە رەوشی ئێستا رازین.

مامۆستایانی هەولێر دەشلێن بڕوایان بە یەکێتی مامۆستایان نەماوە و ئەگەر داواکاری مامۆستایان لەبەرچاو نەگیرێت کەرتی پەروەردە پەك دەکەوێت.

لەئەنجامدا سکرتێری یەکێتی مامۆستایان گردبوونەوەی مامۆستایانی هەولێری پەککخست. مامۆستایانی هەولێر راشدەگەیەنن کە چەندین جار بە یاداشت و بەیاننامە لایەنەکانیان لەرەوشی مامۆستایان ئاگادار کردۆتەوە و داوای چارەسەرکردنی رەوشی مامۆستایان کردووە.

هاوکات لقی سلێمانی یەکێتی مامۆستایان داوایکرد پێداچوونەوە بە پاشەکەوتی مووچەی مامۆستایان بکرێت و رەوشی سیاسی هەرێم چارەسەر بکرێت و راشدەگەیەنن کە تا ئێستا وەڵامی داواکارییەکانی مامۆستایان نەدراوەتەوە.

**لقی هەولێری یەکێتی مامۆستایان هەوڵی بچووکردنەوەی نارەزایەتیەکان دەدات**

لەلایەکی ترەوە لقی کەرکوکی یەکێتی مامۆستایان رایانگەیاند ئەگەر وەڵامی داواکارییەکانی مامۆستایان نەدرێتەوە هەموو رێکارێکی مەدەنی دەگرنەبەر.

لقی هەڵەبجەی یەکێتی مامۆستایانیش جگە لە نارەزایی دەربرین بەرامبەر بە گوزەرانی خراپی مامۆستایان بەگشتی سەرلەنوێ داواکاری پێداچوونەوە بە سیستمی پاشەکەوتی مووچەیان خستەروو.

هاوکاتێش لقی خانەقینی یەکێتی مامۆستایان کە راژەکەیان لەسەر حکومەتی هەرێمی کوردستانە لە گردبوونەوەکەیاندا دژی سیستمی پاشەکەوتی مووچە نارەزایەتیان دەربری.

لقی سۆرانی یەکێتی مامۆستایانیش راگەیاند کە رەوشی سیاسی بوەتە هۆکاری قەیرانەکانی هەرێم و داوای چارەسەری کێشەکانیان کرد.

هەڵەبجە نیوز
لەهەڵەبجەدەردەچێت
ساڵی یەکەم ژمارە(٦)ئەیلول-ی٢٠١٦
موبایل:٠٧٥٠٨٣٥٤٦٠٦
فەیسبوک:حلبجە نیوز

دوالاپەرە

شەوێ،پیاوێ لەبەفرا ما
،نەمرد،ئاگرێکی دوری دی
لەلای من ئائومێدی کوفرە،ئەی ئەم
ئاگرەی دڵم بۆ کێ

پیرەمێرد




# ٢٧ی ٩ لەنێوان ئومێد و بێئومێدیدا!



## دانا عەبدول

لەسەرجەم کەناڵەکانی میدیا بیستراو و خوێنراوەکان و سۆشیال میدیادا بیست و حەوتی ئەیلولی ئەمساڵ زیاد لە سنوری خۆی گەورە کراوە و ئومێدی پێدا هەڵواسراوە و وا نیشان ئەدرێت کە چالاکوانان و خەڵکی نارازی سەرجەم هێلکەکانی خۆیان لە سەبەتەی ئەو رۆژەدا داناوە و سەقفی هیواکانی خەڵکی مافخوراو و دژەگەندەڵ تەنها ئەو رۆژەیە و ئیدی ٢٧ی ئەیلول دەبێتە وەرچەرخانێکی مێژوویی مەزن لە مێژووی ئەم چەرخەی کوردستاندا !..
بەهەموو پێوەرەکان ٢٧ی ئەیلول رۆژێکە وەک هەموو رۆژەکانی ساڵ لەباشووری کوردستان , بەلام خەڵک تووڕەتره و بێزارتره , بەلآم هیچ گۆرانکارییەک لەسەر ئەرزی واقیع رووی نەداوە تا هیواو ئومێدێکی گەورەمان هەبێت , ئاماژەکان پێمان ئەڵێن شەقام هەرگیز ئەوەندەی ئێستا هەتیو و بێ پشتوپەنا نەبووە , هەروەها هێز و لایەن و رێکخراوێکی گەورەمان نییە کە بتوانێت سەرپەرشتی و ئاراستەی نارەزایەتییەکان بکات..
ئەوەی لێرەدا ئەمەوێ بیلێم ئەوەیە کە ئەگەر ٢٧ی مانگ و رۆژانی دواتر هیچ ئەنجامێکی بەدی نەهێنا ئیتر کۆتایی دونیا نییە و نابێ بێهیوا ببین , بەبروای من گەورەکردنی زیاد لەپێویستی ئەم رۆژە بەشێکە لە گەمەکانی دەسەلآت بۆ شەکەتکردنی زیاتری خەڵک..

# مامۆستایان و داواکاری مەدەنیانەی مافەکانیان



## هوشیار ئەحمەد*

مامۆستایان خاوەن ماف وداواکاری رەوای خۆیانن و هیچ کەس و لایەنێک ناتوانێت لەگەورەیی وکەسایەتی ومافی مامۆستایان کەم بکاتەوە ، داواکاری مامۆستایان بەخەباتی مەدەنی وشێوازی شارستانی وسەردەمیانە بەرهەمی دەبێت ئەمەش بەکەسانی ژیروبیری فراوان وخاوەن کەسایەتی دەکرێت و بەرێوە دەبرێت. .
پێویستە هەمووان بەلێبراوانەو ماندونەناسانە چاودێری شاروبارودۆخەکە بکەین و رێگەنەدەین خەڵکی تر لەپاڵ داوای رەوای مامۆستایاندا مەرام و مەبەستی خراپیان بەدی بێنن و دۆخێکی نەخوازراو دروست بکرێت و ئارامی و داواڕەواکانمان تێک بدەن بەناوی چینی مامۆستاو پەروەردەوە کاری هەڵەشەو دواکەوتوانە ئەنجام بدەن،ئەمەش ئەرکی هەمو لایەکە بەجیاوازی بیرکردنەوەو تێروانینمانەوە،مەدەنی بونی دەربرینی نارەزایەتیەکانمان ماناو مەدلولی قوڵی شارستانی خۆی هەیە و کاریگەری زیاتریشی هەیە وزوتر دەمانگەیەنێتە داوا رەواکانمان و دەسەلات ناچار دەکات بەوەلامدانەوەیان. .

*ئەندامی دەستەی داکۆکی لەمافی مامۆستایان

# هەڵەبجە نیوز
Halabja News

بایەخ بە کاروباری پارێزگای هەڵەبجە دەدات
ژمارە(٧)
سێشەممە٤ی١٠ی ٢٠١٦
خاوەن ئیمتیازوسەرنوسەر
سەلاح سەعید ئەمین


# شارەوانی و دادنوسیش بایکۆتیانکرد

## مامۆستایان خۆیان بۆقۆناغی داهاتوی چالاکیەکانیان ئامادەکەن

تایبەت:هەڵەبجەنیوز

رۆژی دوو شەممە٣ی١٠ی٢٠١٦ فەرمانبەرانی شارەوانی وفەرمانگەی دادنوسیش لەهەلەبجەبایکۆتی دەوامیان کرد و رایانگەیاند تادواکارییەکانیان جێبەجێدەکرێتناچنەوە سەرکارەکانیان.
مامۆستایان وچالاکانیمەدەنیش لەهەلەبجە خۆیان بۆ قۆناغی داهاتوی چالاکیەکانیان ئامادەکەن.
هۆشیار ئەحمەد،ئەندامی دەستەی داکۆکی لەمافی مامۆستایان رایگەیاند:ژیانی مامۆستا لەقۆناغێکی مەترسیداردایەو پرۆسەی پەروەردە بەم شێوەیەبەرێوەناچێت و بایکۆت باشترین بژرادەیە بۆفشارکردن.
مامۆستا هۆشیار،لەبارەی ئەوەی بۆ زیاد لەدەستەیەک هەیە لەنێومامۆستایان وتی:سێ دەستەهەیە بەهۆی لێک تێنەگەشتن و لێک دورکەوتنەوەو هەندێ بابەتی تر سێ دەستە دروست بون بەلام بەهۆی گفتوگۆولێک نزیک بونەوە هەولەکان یەک خراون ،هەروەک فەرمانبەرانی شارەوانی و دادنوسیش بایکۆتیان کرد و رایانگەیاند تا وەلامی داواکارییەکانیان نەدرێتەوە ناچنەوە سەرکارەکانیان.




## پارێزگاری هەڵەبجە لە گەڵ نوێنەری سەرجەم لایەنە سیاسیەکان کۆبووەوە

سایتی پارێزگای هەڵەبجە

بەرواری ٢٦-٩-٢٠١٦پارێزگاری هەلەبجە وجێگری پارێزگار لە گەل سەرجەم نوێنەری لایەنە سیاسیەکان کۆبوونەوە لە کۆبوونەوەکەداهەریەک لە بەرێزان بەرێوەبەری ئاسایشی وپۆلیسی هەلەبجەو وتەبێژی پۆلیس وبەرێوەبەری هاتووچۆی هەلەبجە ئامادەبوون,بە مەبەستی پاراستنی باری ئەمنی سنورەکە لە روودانی هەرپشێوی و ئالۆزیەک کە روبدات لە ناوچەکەکەدا لە وادەی خۆپیشاندانەکاندا‌پارێزگاری هەلەبجە لە کۆبوونەوەکەدائاماژەی بەوەکرد کە پشتگیری خەلک وخۆپیشاندەران دەبین لە داواکردنی مافە رەواکانیان بە شێوازێکی مەدەنیانەو هێمنانە لە چوارچێوەی یاساداوە لە کۆتای کۆبوونەکەدا پارێزگاری هەلەبجە ئەوەی خستە رووکە ئەرکی هەمووانە کاربکەین بۆ پاراستنی دام ودەزگاکانی حکومەت ونی یرۆزی هەلەبجە کە پایتەختی ئاشتیەبپارێزرێت.

تەواوی خەرجیەکەی لەئەستۆی نوسینگەی سەرۆکی حکومەتدایە

## کامیل عەبدولقادر،بەرەو ئەلمانیا بەرێکەوت

دوێنێ‌لەمۆنەمێنی هەڵەبجە لەمەراسیمێکی تایبەت کەکۆمەلەی قوربانیانی هەڵەبجە رێکی خستبو، کامیل عەبدولقادر بەرەو ولاتی ئەلمانیا بەرێکەوت بەمەبەستی چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی.
ئاوێنە،عەزیز رەسول: لوقمان عەبدولقادر سەرۆکی کۆمەلەی قوربانیانی هەلەبجە بەئاوێنەی راگەیاند "پاش هەولێکی زۆر بەخۆشحالیەوە ئەمرۆ مامۆستا کامیل لەمەراسیمێکی تایبەت بەگولباران کردن بەرەو ولاتی ئەلمانیا بەرێکەوت بەمەبەستی وەرگرتنی چارەسەر".
وتییشی "تێچوی رۆیشتن و هاتنەوە و چارەسەری لەلایەن نوسینگەی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان گیراوەتە ئەستۆ و بودجەی تێچونیشی کراوەیە هەرچەندێکی تێبچێت بۆی سەرف دەکرێت داواشی کرد هەموئەو کەسانەی بەرکەوتوی چەکی کیمیاوین چارەسەریان بۆ بکرێت".
مامۆستا کامیل زیاتر لەیەک سال و نیوێکە بەهۆی کاریگەری چەکی کیمیاوی لەسەر جێگە کەوتوە لەسەدا٩٠ سیەکانی لەکارکەوتوبو.
لەئێستەدا لەهەڵەبجە ۴۵۰ کەس هەیە کە بەرکەوتوی چەکی کیمیاون داواکارن لەحکومەت و خێرخوازان بەدەم داوایانەوە برۆن هاوکاریان بکەن لە چارەسەر کردنی نەخۆشیەکەیاندا

## یەکێتی مامۆستایان داوا دەکات پێداچونەوە بەپاشەکەوتدابکرێت

کوردیو :مامۆستا عەتا ئەحمەد جێگیری سکرتێری یەکێتی مامۆستایانی کوردستان راگەیاند : یەکێتی مامۆستایان کوردستان پێداگری لەسەر پێداچونەوە بە پاشەکەوتکردنی موچە دەکات و هەر جۆرە پارەیەک لە ژێر هەر ناونیشانێکدا بۆمان تەرخان بکرێت رەتیدەکەینەوەو تەنیا پێداگری لەسەر پێداچونەوە بە پاشەکەوتکردنی موچە دەکەین.
وتیشی یەکێتی مامۆستایان: سەرجەم لقەکان سەرپشککراون لە وەرگرتنی هەر هەلوێستێک و داوا دەکەین لێپرسینەوە لە هیچ مامۆستایەک نەکرێت.راشیگەیاند : سەرجەم لقەکان سەرپشک کراون لە وەرگرتنی هەربریارێک.



هەڵەبجەنیوز،بەهۆی بایکۆتی موچەخۆرانەوە بەشێوەیەکی کاتی هەفتانە دەردەچێت

### هەڵەبجە، مامۆستایانی ئایینیش گردبوونەوە

# بادەنگ بەرزکردنەوەتان یاسایی وشەرعی بێت و ناوزراندن وشێواندن وژینگەپیسکردنی تێدا نەبێت

رۆژنیوز – جیهاد هەورامی

مامۆستایانی ئایینی لە هەڵەبجە هاوشێوەی مامۆستایان و فەرمانبەران، گربدونەوەیەکی نارەزایەتیان ئەنجامدا و شەش داواکارییان ئاراستەی حکومەت و جەماوەر کرد.

لەبەردەم مزگەوتی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەریس، ژمارەیەك لە مامۆستایانی ئاینی شاری هەڵەبجە گردبونەوەیەکی نارەزایەتییان ئەنجامدا و بەیاننامەیەکیان خوێندنەوە، کە تیایدا شەش داواکارییان ئاراستەی حکومەتی و جەماوەری هەرێمی کوردستانیان کرد.

مامۆستا تاهیر بامۆکی، پێش نوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی عومەری کوری خەتاب بەیاننامەکەی خوێندەوە و وتی:»ئێمە وەك زانایانی ئیسلام لەپارێزگای هەڵەبجەدا وەك توێژێکی کاریگەر و پێشەنگ و خەمخۆری ناو ئێوە کە رۆژانە لەخزمەتتانداین، لەم بارودۆخەشدا لەهەموو چین و توێژەکان زیاتر دەناڵێنین بەدەست قەیران و بێ بازاری و گیرفانی خالی، بۆیە بەباشمان زانی ئەم گردبونەوەیە ساز بکەین بۆ دەربرینی هاوخەمی لەگەڵ رۆڵەکانی گەلەکەماندا و پێشکەشکردنی چەند داواکاری و پێشنیارێك بۆ کاربەدەستان و جەماوەری هەرێمی کوردستان کە ئەمانەن:

١ – ئێمە پشتگیری لەگشت مافە رەوا و داواکارییە یاسایی و شەرعیەکانی هاولاتیان دەکەین، گەل مافی خۆیەتی هەموو داواکاریە رەواکانی جێبەجێ بکرێت و هەرێم نەکرێت بە زیندانێکی گەورە بۆ رۆڵەکانی لەلایەن شۆرشگێرانی دوێنێی شاخ و بازرگانان و ملیاردێرەکانی ئەمرۆی شارەوە.

٢ – داواکارین کاربەدەستانی هەرێم و هەموو ئەوانەی کەلەپشت پەردە و ژورە تاریکەکانەوە بریار بەدەستن و نان و بژێوی ئەم گەلە لەدەست ئەواندایە لەبەرخاتری خوا ئەگەر حساب بۆ خوا دەکەن بێنە سەر خەت و وەلامی ئەم هەموو داواکاری و هاوار و باوکەرۆیەی هاولاتیان بدەنەوە، پێش ئەوەی کار لەکار بترازێت و ریسەکەمان ببێتەوە بەخوری دەستپێشخەریەکي مەردانە و جوامێرانە ئەنجام بدەن و دلی رۆڵەکانی گەل خۆش بکەن.

٣ – داواکارین لەهێز و لایەنە سیاسییەکانی هەرێم یەکریزی نەتەوە و نیشتیمان بپارێزن و بەرامبەر بە یەکتر سنگ فراوان و لێبوردە بن، ئێوە چەند ساڵە لەهەول و خەباتتدان و چەندین قوربانیتان داوە لەپێناو رزگاری گەلی کورد، بۆیە دەبێت لەم بارودۆخە ناسك و ترسناکەدا وریابن بنێشتەکەتان بارانی دوبەرەکی و رق و یەکتر نەخوێندنەوە نەیشۆرنەوە.

٤ – داوا لە رۆڵەکانی گەلەکەمان دەکەین با داواکاریەکان و دەنگ بەرزکردنەوەکانتان عاقلانە و رەوا و یاسایی و شەرعی بێت، ناو زراندن و شێواندن و جنێودان و شکاندن و سوتاندن و ژینگە پیس کردنی تێدا نەبێت.

٥ – داواکارین لە دەزگاکانی پۆلیس و ئاسایش و چالاکی مەدەنی و پاسەوانی بنکە و بارەگای لایەنەکان بەگیانێکی بەرزی لێبوردە و سەبرێکی شۆرشگێرانەوە مامەلە لەگەڵ رۆڵەکانی گەلەکەتان بکەن هەرچیتان بۆ دەکرێت لەرێگری لە روودانی کارەساتی نەخوازراو و نەشیاو بەختی بکەن.

٦ – داوا لەدایکان و باوکان دەکەین کەئاگاداری رۆڵەکانتان بن ئامۆژگاریان بکەن بەردبارانی مالی خەلك نەکەن و لە بازاردا پشێوی نەنێنەوە تا روداو و کارەساتی نەخوازراو رو نەدات و یەخەتان نەگرێت.

مامۆستا تاهیر بامۆکی، لەکۆتایی بەیاننامەکەدا وتی: با بەهەمومانەوە هەول بدەین هەرێمەکەمان وەك بیلبیلەی چاومان بپارێزین و رەنجی برا پێشمەرگەکان و خوێنی شەهیدان بەفیرۆ نەدەین و شاری هەڵەبجەی پایتەختی ئاشتی و ناسنامەی گەلی کورد سەربەرزانە لەم قەیرانەش دەربکەین و ببێتە پێشەنگ لە کوردستاندا.

### هەڵەبجە بۆ(هێمن بنەسلاوەی) گرد دەبێتەوە

# ناکرێت لەهەولێر رێگە لەدەنگی ئازاد بگیرێت



سبەی چالاکان و رێکخراوەکانی هەڵەبجە بۆ ئیدانەکردنی ئەو بێرێزییەی بەرامبەر بە هێمن بنەسلاوەیی لە هەولێرا کرا، گردبونەوەیەکی نارەزاییان رێکخست.

بە دروشمی «کەرامەتی هەر مرۆڤێك کەرامەتی هەموومانە»، ژمارەیەك لە چالاکان و رێکخراوەکان و خەلکی هەڵەبجە بۆ ئیدانەکردنی ئەو بێرێزییەی بەرامبەر بە هێمن بنەسلاوەیی لە شاری هەولێر کراوە، لە باخی گشتی شارەکە گردبونەوەکیان رێکخست و داوایانکرد ئەو کەسانەی ئەو کارەیان کردوە روبەروی دادگا بکرێنەوە.

ئاماژەیان بەوەشکرد؛ ناکرێت لە شاری هەولێر رێگە لە دەنگی ئازاد بگیرێت.

ئەو گردبونەوەیە هاوکاتە لەگەل بەرفراوانبونی کاردانەوە و رەخنەگرتن لە ئەنجامدەرانی ئەو رەفتارەی دەرهەق بە هێمن بنەسلاوەیی پێشمەرگە کرا.

# قایمقامی هەڵەبجە پشتیوانی بۆ خۆپیشاندان دەردەبرێت

رۆژنیوز

بایکۆت وگردبوەنەوە کان لەشارو شارۆچکەکانی هەرێم، لەبەرامبەر دواکەوتنی مووچەی فەرمانبەران و مامۆستایان و بێباکی حکومەت لەئاست داواکاری هاوولاتیان، خۆپیشاندانی نارەزایی بەرێوەدەچێت، قایمقامی هەڵەبجەش پشتیوانی خۆی بۆ خۆپیشاندانی مەدەنیانەی هاولاتیان دەردەبرێت.

نوخشە ناسیح، قایمقامی ناوەندی پارێزگای هەڵەبجە بە رۆژنیوزیوت: هاوولاتیان و مامۆستایان و چین و توێژەکانی تر دەستبکەن بەخۆپیشاندانی نارەزایەتی و چەند یاداشت و داواکاریەك ئاراستەی لاینە پەیوەندیدارەکان بکەن، لەبەر ئەوەی ئێمەش خۆمان فەرمانبەرین پشتیوانی داواکاری خۆپیشاندەران دەکەین».

وتیشی:»داوا لە هاوولاتیان و چینوتوێژە جیاوازەکانی هاولاتیانی هەڵەبجە و دەورووبەری دەکەین بەشێوەیەکی مەدەنیانە داوای مافکانی خۆیان بکەن، خۆیان بەدوور بگرن لەهەر کارێکی ئاژاوەگێری و هێرشکردنە سەر مولك و مالی هاولاتیان و بارەگا حزبەیەکان، بۆ ئەو مەبەستەش لیژنەی ئەمنی پارێزگا هەموو ئامادەکاریەکمان کردووە بۆ هەر حالەتێکی نەخوازراو».

قایمقامی ناوەندي هەڵەبجە، ئاماژەی بەوەشکرد، لەگەل لایەنە سیاسیەکاندا گفتوگۆمان کردووە بۆ ئەوەی ئەوانیش لای خۆیانەوە ئەندامان و لایەنگرانیان ئاگادار بکەنەوە کە خۆیان بەدوور بگرن لەهەر کارێکی ئاژاوەگێری، هەروەها ئەمرۆش جارێکیتر لەگەلیان




کۆدەبینەوە بۆئەوەی گفتوگۆی زیاتر بکەین لەوبارەیەوە بە هەمووڵایەك بتوانین نازناوی ئاشتی هەڵەبجە بپارێزین.

# هەڕەشەو بێدەنگی

لەتیف فاتیح فەرەج



لە فەیسبوك شتێكی سەیرم بینی كاتێ پەیجێك زۆر ڕوقایمانە هەڕەشە دەكات و دەڵێ هەر كەس خۆپیشاندان بكات و داوای مافەكانی بكات ئۆباڵی بە ئەستۆی خۆی، ئەو هەڕەشەی قورس تر لەوانە دەكات كە بیانەوێ لە هەولێرو دهۆك خۆپیشاندان بكەن، لەوەش سەیرتر هەر پارتی خۆی گوایە هەمو حیزبەكانی ئاگادار كردوەتەوە لەوەی ئەگەر خۆپیشاندانەكان پارتی بكەنە ئامانج، وەك ئەوەی تا ئێستا پارتی كرابێت، نەك ئەو هەمو میللەتی كردبێتە ئامانج، گوایە ئەویش دەستكراوە دەبێت و بارەگای ئەو حیزبانەش لە هەولێرو دهۆك سەلامەت نابن، ئەمەش هەڕەشەیەكی ترە، ڕێك چیرۆكی ڕوداوەكەی سەرەتای نەوەدەكانی قەڵادزێ و ریزە دوكانەكەمان بیر دەخاتەوە، مام جەلال لە دەرەوە نامەی دەنوسی بۆ بارزانی كە «برا گەورە بێت و چارسەری كێشەكە بكات» كەچی لە دهۆك پەلاماری بارەگاكانی یەكێتی دەدرا، ئێستا پارتی دەیەوێت بڵێ لە تالانی نەوت و نادادی و گەندەڵی و هەمو شتێكا یەكێتیش شەریكە، پارتی لە بری ئەوەی بیر لە چارسەری بە پەلە بكاتەوەو ئەو هەمو پارە دزراوەی براوە بیگێڕێتەوە بۆ نیشتمان هەڕەشە دەكات، ئەمەش بارودۆخەكە لەوە خراپتر دەكات كە ئەوان چاوەڕوانی دەكەن، بۆیە ئێستا دەبێت یەكێتیش وەڵام و هەڵوێستی هەبێت.

ئەمڕۆ خەڵك دەزانێ كۆشك و تەلارەكانتان لە دەرەوە بە چەند ملیۆن دۆلار كردراون، دەزانێ چیتان هەیەو چیتان نیە، بیهێننەوەو تەمەنی دەسەلاتداریێتی خۆتانی پێدرێژبكەنەوە، ئەگەر قەزافی نیوەی ملیارە دۆلارەكانی دەرەوەی هێنابایەوە كە ئێستا دەستیان بە سەردا گیراوە، ڕەنگە توانیبای ماوەیەكی دیكە حوكم بكات، ئێوەش لە بری هەڕەشە لە بری كوشتنی ڕۆژنامەنوس، لە بری كردنەوەی ئەو هەمو كەناڵە ئاسمانیەی بۆ ماكیاجی خۆتان كردوتانەوە هەندێك لەو ملیارەها دۆلارە بگێڕنەوەو تەمەنی حوكمڕانیتان درێژ تر بكەنەوە، بەم نادادی ستەمەوە بە تەمان تاكەی حوكم بكەن، لاتان وایە دنیا هەر وا دەبێت، لاتان وایە نوێنەرایەتی و كونسوڵگەری چوار وڵات لە پایتەخت بو ئێدی هەمو شت بە دڵی ئێوە دەڕوات، ئێوە دەزانن ئەمەریكاو فەرەنساو بەریتانیاو ئەڵمانیاو هەمو وڵاتان ئاگاداری وردو درشتی كارەكانی ئێوەن، دەزانن ئەوان پێكەنینی تەواویشیان بەو دیموكراتیەی ئێوە نایەت، دەزانن هەڕەشە دادی هیچ ستەمكارێكی نەداوە.

لە بری هەڕەشە، لە بری ماكیاج، لە بری كوشتنی ڕۆژنامەنوس، لە بری نادادی و ستەم، لە بری هەوڵدان بۆ چاوترساندنی خەڵك بگەڕێنەوە بۆ لای خەڵك، بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو خەڵكەی بە بیانوی دروستكردنی دەوڵەتەوە برسیتان كردوە، بۆ لای ئەو خەڵكەی تا ئێستا چاو پۆشی لە هەمو ستەم و خیانەتێكی ئێوە كردوە، ئەو خەڵكەی بە نان و ئاوی خۆی ئێوەی كرد بە خاوەنی نەوت و كۆمپانیاو ستەمكاری. گریمان دەیان ڕێژوان و گەرمیانی ترتان كوشت، گریمان دەیان دایكی وەك دایكی سەردەشت و كاوەو وەدات و سۆرانتان جەرگ سوتاو كرد، گریمان دەیان ١٧ی شوباتی ترتان خەڵتانی خوێن كرد، دوای ئەوە چی، ئاخۆ چەندی تر دەتوانن خۆتان بەكورسیەكانتانەوە بنوسێنن؟

**بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو خەڵكەی بە بیانوی دروستكردنی دەوڵەتەوە برسیتان كردوە، بۆ لای ئەو خەڵكەی تا ئێستا چاو پۆشی لە هەمو ستەم و خیانەتێكی ئێوە كردوە**

# لەبارەی وشەی هەڵەبجە وە

موختار عومەر خەلیفە

دەوترێت كابرایەك لەو شوێنەدا لەكۆنەوە بێچوە هەڵۆیەكی گرتووە بەو شێوەیە ناوی لێنراوە (هەڵۆ بەچە) پاشان بووە بە هەڵەبجە.

هەندێكی تر دەڵێن، ئەو شوێنە زۆر دڵگیر بووە بەهۆی باغو بێستانو ئاو شینابییەوە پێیان وتووە (عەجەب جا) لە زمانی فارسیەوە وەرگیراوە، پاشان گۆڕاوە بە (هەڵەبجە)، واتە جێیەكی سەرسورهێنەر.

هەندێكی تر ئەڵێن، كابرایەك پێش هەمو كەس هاتووەو ئاوەدانی كردۆتەوەو ناوی (هەڵۆ بەگ) بووە وردە وردە ئەو ناوە بەهۆی گەشەكردن لەزمانی كوردیدا بوو بە (هەڵۆجا) یان (هەڵەبجە). ئەڵێن ئەو ناوچەیە باغو بێستانی هەبوەو درەختی (هەلوژەی) زۆر بووە، بەهۆی گۆڕانكاری لەزمانی كوردیدا بووە بە (هەڵەبجە).

ریوایەتێكی تر ئەڵێت، لە ساڵەكانی ١٦٠٠ تا ١٦١٥ هەڵۆخانی ئەردەلان هەڵەبجەی ئاوەدان كردۆتەوە هەربەناوی خۆیەوە ناوی ناوە (هەڵۆجە) پاشان بووە بە (هەڵەبجە).

هەندێكی تر دەڵێن، كاتێك خەڵكی ناوچەی كرماشان لەرێگەی بازرگانیەوە ڕۆیشتوون بەرەو (حەلەب) ی سوریا بینیویانە كەوا ئاو هەوای ئەو ناوچەیە لەهەوای ناوچەی هەڵەبجە ئەچێت، ئەوان ناویان لێناوە (حەلەبجە)، واتە (حەلەبی پچوك).

بەڵام هەندێكی تر پێیان وایە كە (ئەلەبجە) لە (ئەلەب ئەرسەلان) ەوە هاتوە، كە میرێكی دەوڵەتی سەلجوقیەكان بووە، لەكاتی سەردانیدا بۆ كوردستان، بە هەڵەبجە گوزەری كردوەو ناوی لێناوە (ئەلەب جا)، واتە شوێنی (ئەلەب ئەرسەلان)، مامۆستا جەمال بابان ئەم ڕایەی پەسەند كردووە.

# دەرگای قوتابخانەكان لە دەرگای پەرلەمان پیرۆز ترنیە

عومەر عەبدول

ئەم هێزە سیاسیانەی كوردستان باش ڕاهاتون لەسەر بێ ڕێزی كردن بە و شوێنانەی مەرجەعن و كۆدەنگی و بەرژەوەندی گشتییان تێدایە ، من لەو بابەتە پارتی و حیزبەكان لێك جیا ناكەمەوە ، چونكە ئەو دەرگایانەی دەنگ و بەرژەوەنی خەڵكن بەلای ئەم هێزانەوە ئاسانە كلۆم كردن و بەستنیان تەنها یەك كات پەنای بۆ نابرێت ، ئەویش كە بەرژەوەندی حیزبەكان بخاتە مەترسی .

لەم خولە نوێیەی بایكۆت كردن بریارە دەرگای قوتابخانەكان نەكرێنەوە ، پرسیارەكە ئەوەیە كە دەرگای پەرلەمان داخرا كاردانەوەی حیزبەكان چی بو ؟ بەش بە حاڵی خۆم ئێستا ئەزانم پەرلەمان لای حیزبەكان بچوك و بێ بایەخ ترە لەوەی دەمانزانی و لە خەیالماندا بو ، ئەم هاوكێشەیە بۆ قوتابخانەش هەر ڕاستە . هەر بۆیە كلوم كردنی دەرگای قوتابخانەكان ، قەت حیزبەكان ناخاتەوە سەر سكەی مۆراڵی سیاسی و جورئەتی ڕوبەڕو بونەوەیان ناداتێ و هەرگیز ڕوی ڕەشیان ناشارێتەوە .

چونكە لە ساڵێك زیاترە پەرلەمانە نازدارەكەی كوردستان ، جێگای یاساو تەشریع و شەرعیەت دەرگاكەی داخراوە بە لۆژیكی هێز لای پارتی و بێ دەنگی هەمو حیزبەكان كەواتە جیاوازیەكە تەنها تەكنیكیەو لە بنەڕەتدا ئەم دەرگایانە بێ بایەخ و سوك و ریسوان . دەرگای گەل و خەڵك و جەماوەرن ، قەت هێندەی دەرگای بارەگایەك پیرۆز نین و نرخیان نیە ، بۆیە من لام ڕونە بریاری داخستنی دەرگای قوتابخانەكان سیاسیەكان داناچڵەكێنێ و حیزبەكان خەبەر ناكاتەوە .

ڕۆژی بیست و حەوتی مانگ ، كێ لەبەرەی خەڵكدایە و خەبات بۆ بەرژەوەندی گەل ئەكات با دەرگای بارەگاكانی حیزبەكەی دابخات ، هەر هیچ نەبێت شەرمەزاری مێژوو نەبێت .

هەڵەبجە نیوز
لەهەڵەبجەدەردەچێت
ساڵی یەکەم ژمارە(٧)سێشەممەی٤ی١٠ی٢٠١٦
موبایل:٠٧٥٠٨٣٥٤٦٠٦
فەیسبوک:حلبجە نیوز

دوالاپەرە

هەرگیـز بە سـوکي مەڕوانـە بۆ کەس
تۆ بۆچي کەسي و ئەو بۆچي ناکــەس
کەسـي و ناکەسـي بەپێي ڕەوشتــە
خودایـش پەنایـە و پشتـە و فریـادڕەس

ماموّستا عەبدولکەریم مودەریس

ساتەوەختی بەرێکردنی کامیل عەبدولقادر،بەرکەوتەی چەکی کیمیاوی بۆدەرەوەی هەرێم بەمەبەستی چارەسەر

phto by haydar hama salaih

حەسەن نازدار



# پایزانە

١
تۆ تەنها خەندەیەکت
خستە سەرلێوان،
سەریشت لەپایز شێوان
٢
پێڵوەکانت
چەقۆی پایزەن
دانە دانە گەڵای
نیگا زەردەکانت
هەڵدەوەرێنن.
٣
گەڵا
چەندعارفانە
لەمەرگ تێدەکات
هەرکە خەزان هات
دەس بە سەما دەکات
٤
خۆر
هەرچوار وەرزەکەی
پایزە بەجارێ
چوون هەموو رۆژێک
چەپک چەپک
گەڵای زەردی
تیشکی لێدەبارێ،

## پێنج پایەی ئارامی و بەختەوەری

لە زانایەکیان پرسی :- هۆکاری ئەو ئارامی و بەختەوەریەی تۆ چیە؟ ووتی :- ژیانی خۆمم لەسەر پێنج پایە بنیاد ناوە :
یەکەم: زانیم رزقی من کەسێکیتر نایخوات بۆیە ئارامم گرت.
دووەم: زانیم خودا من ئەبینێت بۆیە شەرم و حەیام کرد.
سێهەم: زانیم ئیشی من کەسێکیتر نایکات بۆیە هەولم دا .
چوارەم: زانیم کۆتایم مردنە بۆیە خۆمم بۆ ئامادە کرد.
پێنجەم: زانیم چاکە و خراپە وون نابن بۆیە چاکەم زۆر کرد و دورکەوتمەوە لە خراپە .
وە هەموو رۆژێکیش ئەم پێنج پایەیەم بە بیر خۆم دەهێنایەوە و جێبەجێم ئەکردن .

## بۆ چی من ؟

پاڵەوانی بەتوانای تێنسی ویمبڵدۆن ئارتور ئاشی ، لەبەر ئەو خوێنە پیسەی کە لەکاتی نەشتەرگەریەکدا لە ساڵی ١٩٨٣ تێیکرا ، توشی نەخۆشی ئایدز بوو کەوتە جێگاوە و چاوەڕوانی مردن بو .
لە سەرانسەری دنیاوە لایەنگرەکانی نامەیان بۆ دەنارد.
یەکێ لە لایەنگرانی نوسیبووی :
لەبەر چی خوا تۆی بۆ ئەم نەخۆشیە ترسناکە هەڵبژارد؟
ئارتور لە وەلامدا نووسي :
لە دنیادا پەنجا ملیۆن منال یاری تێنس دەسپێدەکەن.
پێنج ملیۆن لەوانە فێر دەبن کە چۆن یاری تێنس بکەن.
پێنج سەد هەزار لەوانە بە شێوەیەکی پیشەیی فێری یاری تێنس ئەبن .
پەنجا هەزار کەسیان ئەچنە پێشبرکێکانەوە و پێج هەزار کەسیشیان ئەناسرێن و بە ناوبانگ ئەبن.
پەنجا کەس لەوانە ئەبنە کێبەرکێ کاری پاڵەوانیەتی ویمبڵدۆن .
چوار کەس ئەگەنە نیوەی کۆتایی و دوو کەسیش ئەگەنە فینال و یاری کۆتایی و کاتێ من بوومە پاڵەوان و بە دەستەکانم جامەکەم بەرز کردەووە هەرگیز نەمووت خوایە بۆ چی لەو هەمووەدا بەس من ؟
وە ئەمرۆش کە تووشی ئەم نەخۆشیە ترسناکە بووم هەرگیز ناتوانم بڵێم خوایە بۆ چی لەو هەمووەدا بەس من ؟

و.لەفارسیەوە:
سەعیدوەهاب:

بایەخ بە کاروباری پارێزگای هەڵەبجە دەدات
ژمارە(٨)
سێشەممە١١ی١٠ی ٢٠١٦
خاوەن ئیمتیازوسەرنوسەر
سەلاح سەعید ئەمین

# هەڵەبجە نیوز
Halabja News

# مامۆستایان هانابۆ بەغداد دەبەن

## مامۆستایان تەئکید لەبەردەوامی بایکۆت دەکەنەوە

هەڵەبجەنیوز

رۆژی شەممە٨ی١٠ی٢٠١٦ دەستەی داکۆکی لەمافی مامۆستایان لەپارێزگای هەڵەبجە کۆبووەوە و بەپێ ی زانیاریەکان چەند بریارێکیان داوەو جەخت لەسەر بەردەوامی بایکۆت و فراوانکردنی چالاکیەکان دراوە.یەک لەبەشداربوەکانی کۆبونەکە لەئەکاونتی خۆی لەفەیسبوک ،بریارەکانی نێو کۆبونەوەکەی بەمجۆرە ئاماژە پێداوە:و بەردەوامبون لەسەر بایکۆت و. ئەنجامدانی چالاکیەکی بەرفراوان .هەروەها کۆکردنەوەی واژۆی مامۆستایان بۆ فشاری رێکخراوی یونیسیف لەسەر هەرێم.لەگەل گەیاندنی داواکاریەکانمان بە لیژنەی پەروەردەی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق و ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق،کەتیایدا داوا کراوە بەغدا فریای کەرتی پەروەردەی هەرێم بکەوێت. تا کاری پێویستی لەسەر بکرێت هەروەها رۆژی یەک شەممە ٩ی١٠ی٢٠١٦بەئامادەبوونی بەرێوەبەری پەروەردە و لقی هەلەبجەی یەکێتی مامۆستایان و دەستەی داکۆکی لەمافی مامۆستایان و مامۆستایانی زانکۆ کۆبوونەوەیەک ، دیارترین بریارەکانیش ئەوەیە کە مامۆستایان بەردەوام ئەبن لەبایکۆت هەتا داواکارییەکانیان جێ بەجێدەکرێت.



وەرگیراوە

## بەرێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی هەڵەبجە دەکرێتەوە

وەزیری کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاوی هەرێمی کوردستان بریارێک بۆ کردنەوەی (بەرێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵ) لەو پارێزگایە دەردەکات و، فەرمانبەرێکی بەرێوەبەرایەتی کشتوکاڵی پێشووش دەکاتە بەرێوەبەرە گشتیەکەی بە وەکالەت،کەناڵی ئاسمانی پەیام بلاویکردەوە، .بەپێی بریارێک کە ژمارەی ٥٨١٦ ی لەسەرە و رۆژی٦ ی ١٠ ی ٢٠١ی و بە ئیمزای عەبدولستار مەجید وەزیری کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو دەکراوە ،بریار دراوەبە: :یەکەم: کردنەوەی بەرێوەبەرایەتی گشتی بەناوی (بەرێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی هەڵەبجە) .دووەم: دانانی بەرێز (ستار محەمەد سالح) فەرمانبەر لە پەرێوەبەرایەتی کشتوکاڵی هەڵەبجە بە (بەرێوەبەری گشتی) ئەو بەرێوەبەرایەتیە بە وەکالەت .بەپێی نوسراوەکەی وەزیری کشتوکال، فەرمانەکە لەرۆژی دەرچونیەوە دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە. .

## بۆچی دەبێت پشتگیری بایکۆتی مامۆستایان بکرێت؟

سەلاح سەعید ئەمین

مامۆستایان،تەنها توێژێکن زۆرینەیان ئیشی دووەمیان نیە و بژێوی ژیانی خۆیان و خێزانەکەیان لەسەرئەو موچەیەیە وەریدەگرن،ئەمە ئەگەر مانایەک بۆ ئیشی دوەم مابێتەوە،بەهۆی ئەو قەیرانە داراییەوە کە روو لەهەرێم کردوەو لەهۆکارەکایدا باس و خواسی زۆر هەیە وهەندێک بەدروستکراو و هەندێکی تر هۆکارەکەی بۆ دابەزینی نرخی نەوت وبرینی بودجەی هەرێمی دەگێرنەوە لەبەغداوە.
پرسیارەکە ئەوەیە،دەگونجێت داوا بکرێت لەمامۆستایان بایکۆت بشکێنن ودەوام دەست پێبکەنەوە؟وەلام ئەوەیە :نەخێر،گونجاو نیە ئەو داوایە لەمامۆستایان بکرێت،زۆر بەسادەیی لەبەرئەوەی باوکی هیچ قوتابیەک ئامادەیە ئەگەر دوکاندار بێت بێ بەرامبەر شمەک بداتە کریارەکانی،شۆفێرێک ئامادەیە سالێک بێ بەرامبەر نەفەرەکانی هاتوچۆ پێبکات،پزیشکێک ئامادەیە سالێک بێ بەرامبەر نەخۆشەکانی ببینێت،فەرمانبەران ئامادەن بێ بەرامبەر بەدەوامی پرەوە کاروباری هاولاتیان بەرێبخەن..هتدکێ ئامادەیە لەغیابی قوتی ژیانیدا و لەبەرامبەر وەرنەگرتنی سادەترین مافی خۆیدا کە موچەکەیەتی دەوام بکات،ئەوکات دەتوانێت داوا لەمامۆستایانیش بکات بایکۆت بشکێنن..
بەگیرفانی خالی وبەزیهنی ماندووی دەستی بێموچەیی و دەرهاویشتە کەلەکەبوە تاقەتپپروکێنەکانی قەیرانی داراییەوە،مامۆستا چۆن دەتوانێت وانە بلێتەوە،مامۆستاش بەشەرن و دەخۆن ودەخۆنەوە و هەستیان هەیە،نەک رێیان لێمەگرن،بەلکو پشتگیریشیانبن،بایکۆتەکەیان هەقە،هەق..

## پێشانگایەک بۆ کتێب دەکرێتەوە

هەڵەبجەنیوز
گروپی نمەی باران بەهاوکاری زیاتر لەپازدە رێکخراو ،بەمەبەستی ئاسانکاری ودەست راگەیشتن بەکتێب وخزمەتێک بەبواری مەعریفە پێشانکایەکی کتێب .دەکاتەوە
لەو پێشانگایەدا هەرکەس چەند کتێب ببەخشێت دەتوانێت ئەوەندەش وەربگرێت دوو کتێبیش بەدیاری وەربگرێت.شوێنی پێشانگاکە باخی گشتی هەڵەبجە ،لەرۆژی دوو شەممە .١٠ی١٠ی ٢٠١٦ کرایەوە



هەڵەبجەنیوز،بەهۆی بایکۆتی موچەخۆرانەوە بەشێوەیەکی کاتی هەفتانە دەردەچێت

## داوای دۆعای خێر دەکات
## مامۆستا کامیل عەبدولقادر،سوپاسنامەیەك ئاراستە دەکات

هەڵەبجەنیوز
مامۆستا کامیل عەبدولقادر،بەرکەوتەی کیمیاوی کەئێستا لەولاتی ئەلمانیایە بەمەبەستی چارەسەر سوپاسنامەیەك ئاراستەی هەمو ئەوانە دەکات کەلەمەراسیمی بەرێکردنیدا لەمۆنۆمێنتی هەلەبجە ئامادەبون.
لە ئەکاونتی خۆی لەفەیسبوك ،کامیل عەبدولقادر دەنوسێت:پڕ بەدڵ سوپاسی هەموو ئەو ئازیزو خۆشەویستانە دەکەم کە لە رۆژی بەرێکردنمدا بۆ چارەسەر لە ئەلمانیا ئەزیەتیان کێشاو ئامادەبوون لە مەراسیمی خواحافیزی و بەرێکردنمداو گەورەیی خۆیانیان نواند.
ئێستا من لە نەخۆشخانەی (گرۆسهانسدۆرف) م لە هامبۆرگ و پشکنینی پزیشکیم بۆ دەکرێت و تا چەند رۆژێکی دیکەش پشکنینەکان بەردەوام دەبێت پاش ئەنجامی تەواوی پشکنینەکانیش بریار دەدرێت چیم بۆ بکرێت، هێشتا نازانرێت چی دەتوانن بۆ منی بکەن، ٣ رۆژە هەندێك چارەسەرم پێ دەدەن بەڵام بریاری کۆتایی ماوەیەکی زیاتری دەوێت.
داواتان لێ دەکەم لە دوعای خێر بێبەشم نەکەن،رۆژی دوو شەممە ٤ی١١ی ٢٠١٦لەمەراسیمێکی تایبەتدا لەمۆنۆمێنتی هەلەبجە کامیل عەبدولقادر بەمەبەستی چارەسەری نەخۆشیەکەی بەرەو ولاتی ئەلمانیا لەلایەن چین و توێژە جیاجیاکانەوە لەهەلەبجە بەرێخرا..

## ئاهەنگ بۆ یادی هیجرەت سازدەکرێت

ئاکوردیو ــ هەڵەبجە ــ حەیدەر حەمە صالح
بەمەبەستی بەرزو پیرۆز راگرتنی سالیادی کۆچی پێغەمبەر مان موحەمەد (درودي خوای لەسەر بێت ) و سالی نوێی ١٤٣٨ی کۆچی و لە ژێر دروشمی ( شارێك بۆ هەموان و نورێك بۆ مرۆڤایەتي ) زانایانی پایتەختی هەلەبجە ئاهەنگێك ساز دەکەن.
مامۆستا عەبدول حەمید فەرەج ئەندامی لیژنەی سەرپەرشتیاری ئاهەنگەکە لە لێدوانێکیدا بۆ کوردیو رایگەیاند : سازکردنی ئاهەنگێك بەبۆنەی سەری سالی کۆچی و هیجرەتی پێغەمبەرمان موحەمەد (درودی خوای لەسەر بێت ) لە شاری مەککەی زێدی لەدایك بونیەوە بۆ شاری مەدینەی منەورە چەندین پەیام و وانەی گرنگی تێدایە کە تەواوی مرۆڤایەتی پێویستی پێیەتی لەهەمان کاتدا هەست دەکەین ئەم جۆرە بۆنە ئاینیانە بەجۆرێك لە جۆرەکان فەرامۆش کراوون لەلایەن حکومەتەوە هیچ گرنگیەکی ئەو تۆی پێنادرێت ،بۆیە پێمان وایە زیندو راگرتنی ئەم بۆنانە ئەرکێکی ئاینی ئێمەی زانایانە .
راشیگەیاند : ئاهەنگەکە کۆمەلێك زانای هەلەبجەی پایتەختی ئاشتی سەرپەرشتی دەکەن لە ژێر دروشمی ( شارێك بۆ هەموان و نورێك بۆ مرۆڤایەتی )دایە و لە رۆژی دوو شەممە بەرواری ١٠یتشرینی یەکەم کە دەکاتە ٩ی موحەرمی سالی ١٤٣٨ی کۆچی لە باخی گشتی هەڵەبجە لە کات ژمێر ٣:٣٠خولەکی پاش نیوەرۆ ساز کراو کە چەند وتار و پەخشان و سروودی تێدا پێشکەش دەکرێت کە شایستەی ئەو یادە مەزنەبێت .



مامۆستایان:بایکۆتی دەوام وگردبونەوەکانیان بەردەوامیان هەیە (وێنەکە وەرگیراوە)

## صەبری ئەیوب !

ئەیوب ٧ کوری هەبوو ... ٧ کچیشی هەبوو ... سامان و مەرو مالاتێکی زۆری هەبوو ... زۆر دەولەمەند بوو ... ٧٠ سالیش لەسەر ئەم ژیانە بوو !
دوای ئەوە لە کتوپری خوای گەورە هەموو منالەکانی لێ سەندەوە - دوای ئەوە گشت سەروەت و سامانەکەی لێ سەندەوە - دوای ئەوەش توشی نەخۆشیەك بوو کە چارەسەری نەبوو ئەبەد !ئەو نەحۆشیەی توشی هات بە جۆرێك قورس و بە ئازار بوو کە گۆشتی جەستەی لێ ئەبوەو هەلئەوەری ... دواتر بۆگەنی کرد ... بە جۆرێك خەلکی بێ چارەبوون دووریان خستەوە لە خۆیان هەرچەندە پێغەمبەری خواش بوو !!
خێزانەکەی ئەیوب ئەچوو ئیشی ئەکرد هەتا خزمەتی ئەیوبی پێ بکات - تا وای لێهات ئیشیان پێ نەئەکرد وئەویشیان دوور خستەوە لە خۆیان چونکە ئەیان وت تۆ ئێمە توشی نەخۆشی ئەکەیت ... چونکە سەردانی ئەیوبی ئەکرد .... ئەیوب وای لێهات کرم لە سەر گیانی ئەکەوتە خوارەوە ... ئەویش هەلی ئەگرتەوە و کرمەکەی ئەخستەوە لەشی خۆی ... ئینجا تاقیکردنەوەکە گرانتر بوو بۆ ئەوەی کە تەنها دلی لێی ئەداو تەنها زمانی ئەجولا !
١٨ سال بەو نارەحەتیە مایەوە ..بۆ یەکجار لە رووی نەهات بلێ خوایە شیفام بدە .... هەتا خێزانەکەی پێی وت : تۆ یەك جار داوا لە خوا بکە من دلنیام خوای پەروەردگار شیفات ئەدا ...
ئەیوبیش پێی فەرموو : ( عەیبەیەو شەرمەزاریە ٧٠ سال لە ناو نیعمەت و بەروبووم ژیاندوومی .. ئێستاش ٧٠ سال لە نارەحەتی و ئازاری صەبر نەگرم !!)
هەتا لە کۆتایش لە رووی نەهات و تەنها فەرمووی : ( خوایە من توشی نارەحەتی هاتووم و تۆش ارحم الراحمینی )
خوای گەورە شیفای بۆ نارد و پێی فەرموو : ((هەستە لەو ئاوە بخۆرەوەو خۆت بشۆرەوە ))
پاشان بوەوە بە خاوەنی ١٤ کچ و ١٤ کور و سەر و سامانێکی زۆر زیاتر لە وەی پێی درابوو لە رابردوو.... گەرایەوە بۆ سەردەمی پێش ١٨ سالەکە بە دووقاتەوە ... لەپاداشتی ئەو صەبرە عەزیمە !...

لەفەیسبوکەوە-دیاری ئەحمەد

# تکایە خۆپیشـــــاندان ریســـــوا مەکەن

شوان هەورامی



اتی خۆی کە یاسای خۆپیشاندان لە خولی پێشووی پەرلەمانی کوردستان دەرچوو ، مشتومڕی زۆری لەسەر کرا ، چونکە لە وڵاتانی دیموکراتیدا خەڵك بڕیاری خۆپیشاندان دەدەن و حکومەت بەس کاری پاراستنیەتی ، بەڵام نوسەرانی ئەو یاسایەی کوردستان بۆ ڕێگریی لە خۆپیشاندان ئەو یاسایەیان نووسیی ، بۆ ئەوەی حکومەت بە هیچ شێوەیەك ڕێگە نەدات بە خۆپیشاندانێ کە زیانی بۆ پەزەکانی دەسەلات و حیزبە پاوەنخوازەکانی هەبێت .
ئەو کاتەش ڕووناکبیران و ڕۆژنامەنووسان و زۆربەی چین و توێژەکان دەیانزانیی ئەوانەی لە پشتی نوسینی ئەو یاسایەوەن ، مەبەستیانە بە دەرکردنی یاسایەکی مەدەنیی ، بەچاوبەست و چەواشەکاریی دیموکراسیانە بنەماکانی دیکتاتۆریەت بچەسپێنن ، بۆیە ئەو کاتە نیگەرانیەکان بە دەیان چالاکیی کۆبوونەوەو نارەزایی ، پەیامی خۆیان بە پەرلەمان و حکومەت و ڕێکخراوە جیهانیەکانی مافی مرۆڤ گەیاند ، بەڵام عەرەب زۆر ڕاستیان وتووە : ژیان بۆ کەسێ نیە کە هاوار بکات ( لا حیاه لمن تنادی ) .
ئەوەی سەیری کوردستان بکات دەزانێت ، بە پێی ئەو کەشەی کە لە زۆنی سەوزدا هەیە ، پەراوێزێك بۆ ئازادیی بوونی هەیە ، ئەویش لە لێبووردەیی ڕەنگەکەوە نیە ، کەشەکەی ئێرە ئەوەی بەرهەم هێناوە ، بۆیە هەرچەندە پێشێلکاریی بەرانبەر ڕۆژنامەنووسان و تۆڕەکانی میدیا و بگرە خۆپیشاندەرانیش دەکرێت ، بەڵام ئازادیی نارەزایی و خۆپیشاندان تیایدا بە هیچ شێوەیەك بەراورد ناکرێت بە زۆنی زەرد .
بەڵام کە خۆپیشاندانی فەرمانبەران و مامۆستایان و چین و توێژەکانی تر لە زۆنی سەوزدا دەکرێت ، هیچ کاریگەرییەکی نیە لەسەر بڕیاری حکومەت و ئەوان گوێ نادەنە نیگەرانیەکانیان ، چونکە زۆنەکەی خۆیان نقومی دیکتاتۆریەت و داپڵۆسین کردووە ، تەنانەت لەسەر پۆست و کۆمێنتی تۆرە کۆمەڵایەتیەکانیش خەڵك دەگرن و ئەشکەنجە و ئازاریان دەدەن . بۆیە دەسەڵاتدارانی زۆنی زەرد نەك نیگەران نین بەڵکو خۆپیشاندانی زۆنی سەوزیان پێخۆشە ، لەبەر ئەم خاڵانە :
١. ئەوە بە نیشانەی ئەوە لێکدەدەنەوە کە کێشەکان تەنیا لە زۆنی سەوزدا بوونیان هەیە و زۆنی ئەوان شامی شەریفە ، تێناگەن لەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان زۆنی ئەوانیش وەکو شامی ئەمڕۆ دەشلەقێ ، چونکە سوننەتی ژیانە ستەمکاریی کورت ترین ڕێگەی هەڵخلیسکان و هەڵدێران و هەرەسە

**لە وڵاتانی دیموکراتیدا خەڵك بڕیاری خۆپیشاندان دەدەن و حکومەت تەنها کاری پاراستنی خۆپیشاندانەکەیە حکومەتە مافیاییەکان وەکو گورگ ڕەفتار دەکەن و جەماوەر وەکو ڕانەمەڕ دەبینن**

.٢. تەنانەت دەڵێن ئێمە ڕێز لە خۆپیشاندانی مەدەنیانە و ئاشتیانەی لەو شێوەیە دەگرین و پشتیوانیی لە داخوازییە ڕەواکانیان دەکەین ، لە ئازاری چین و توێژەکانی کۆمەڵی کوردەواریش تێدەگەین ، کەچی هەمان خۆپیشاندانی ئاشتیانە و مەدەنیانە لە زۆنی زەرددا قەدەغەیە و بە هیچ شێوەیەك ڕێگەی پێنادرێت ، چونکە بە پێی یاسا دەبێ حکومەت ڕێگەی پێ بدات و حکومەتی زەردیش ڕێگە بەوە نادات لە پایتەختی کونسوڵگەرییەکان و مۆڵە گەورەکان و هۆڵە زرق و برقدارەکانی هەڵبژاردنی شاجوانی کوردستان و دەیان ڕێکخراوی بیانیی وەبەرهێنی سەرمایەداری گومان لێکراودا خۆپیشاندان بۆ نارەزایی فەرمانبەران و مووچەخۆرانی هەرێم ڕێك بخرێت ، چونکە بە پێی فەرمایشتی پارێزگاری پایتەخت ئەوان بەرنامەی بە دوبەی کردنی هەولێریان هەیە و خۆپیشاندانی مەدەنیانەش ئەو خەونە شیرینەیان لێ تێکدەدات .
٣. ئەوان چاك دەزانن ئەو خۆپیشاندانانە تا ڕۆژی دواییش بەردەوام بێت ، هیچ ناگۆڕێت ، بە جۆرێکیش خۆپیشاندان سووك و ریسوا دەکەن کە لەمەودوا هیچ کەسێك بڕوای بە خۆپیشاندانی مەدەنیانە نەمێنێت ، ئەوەی بڕوای وابێت بەرانبەر حکومەتی دیکتاتۆریی و میلیشیایی خۆپیشاندان دەکات و کاریگەریی دەبێت لە خەوی غەفڵەتدایە ، خۆپیشاندان یەکێکە لە چەکە کاریگەرەکانی هاوڵاتیان لە حکومەتە دیموکراتیی و دەستووریی و دامەزراوەییەکاندا ، هەر بۆیەش خۆپیشاندانی وا هەیە دەبێتە هۆی ڕووخاندنی کابینەی حکومەت .
بەڵام حکومەتە مافیاییەکان وەکو گورگ ڕەفتار دەکەن و جەماوەر وەکو ڕانەمەڕ دەبینن و هاواریان وەکو بارەباری مەڕ لە قەڵەم دەدەن ، گورگ کاتێ دەسڵەمێتەوە کە بزانێت تەڵەو کەمینی بۆ دانراوە ، وەکو وتراوە : مشتەکۆڵە لە درەوشە دەگەڕێتەوە .
کاتێ خۆپیشاندانی پرتەقاڵیی لە ئۆکرانیا سەرکەوت ، کە مافیا و دزەکان کە خۆیان لە پشتی پۆستی سیاسیی و دیبلۆماسیی و پەرلەمانتارییەوە شاردبوەوە ، یەکە یەکە هێنانیانە دەرەوەو خستنیانە ناو حاویەی خۆڵ و خاشاکەوە !!
ئەمانە بۆچی میلیشیا و چەکداریان هەیە ؟ بۆچی ڕێگە نادەن پەرلەمان و دامەزراوەی دەستووریی لە هەرێمدا درووست ببێت ؟ بۆچی ڕێگە نادەن پەرلەمان چاودێریی کارنامەی حکومەت بکات ؟ بۆچی ڕێگە نادەن لیژنەی نەوت و غازی پەرلەمان چاودێریی ئەو دۆسیەیە بکات ؟ بەڵام بۆ چاوبەست کۆمپانیایەکی بەدناوی وەکو خۆیان دەهێنن بۆ ئەوەی لە پشتی داتاکانیەوە کارە مافیاییەکانیان بشارنەوە !!
حکومەتە مافیاییەکان وەکو گورگ تکام وایە مامۆستایان و فەرمانبەران و چین و توێژەکان نوێنەرانیان دیاریی بکەن و ناو بەناو ئەوان بایکۆت و مانگرتنەکان ڕێك بخەن و ڕابگەیەنن ، بۆ دەوامکردن یا نەکردن ، ئیتر چیتر زاراوەی خۆپیشاندان و فەلسەفە دیموکراتیەکەی ناشیرین و سووك نەکەن ، چونکە لە سیستمی دیکتاتۆریدا خۆپیشاندان بۆ لە ریشە دەرهێنانی سیستمەکەیە و ناکرێ بە مەدەنیانە و ئاشتیانە داوا لە مافیا و دیکتاتۆر و دز و جەردە بکرێت کە هەق بۆ خاوەن هەق بگێڕنەوە ، کە دیارە تا ئێستاش خەڵکی کوردستان ئەو بڕیارەیان نەداوە وەکو ئۆکرانیەکان بکەن ئیتر با ئەو زاراوە جوانەش ناشیرین نەکەن ، وەکو حیزبەکان زاراوەی سازانیان ناشیرین کرد !

- نوسەروڕۆژنامەنوس

## لە چاوەڕوانی (عادلە خانمێك) دا

ڕەشماڵ بە ڕەشماڵی، هۆزی جافان
گەڕام.
لەوێ نەبووی !
( باخی میر ) و ( کانی ئاشقان ) گەڕام.
لەوێ نەبووی !
بە ئەسپەشێ
شارەزوور و سنە و هەورامانیش
گەڕام.
لەوێش نەبووی.
ئەی تۆ لە کوێی ؟
ئەی شاژنی بێ تاجی شاری شارەزور.
لەسەر گلکۆکەی ( تاهیر بەگ )
لە مەزاری عەبابەیلێ
فاتیحام خوێند.
لەوێش نەبووی!
پیرێك وتی هێی بێخەبەر
( خان بەهادوور ) ئێوە خۆش
بڕوام نەکرد.
هەبێ و نەبێ خەڵەفاوە !
( ئەحمەد موختار ) شەهیدکرا.
وتم یاران
شاژنی بێ تاجی شاری شارەزوور
هەر دێتەوە ..
دە، وەرەوە، بێ قەزابی !
ڕادیۆو تەلەفزیۆن نەما
ڕۆژنامەو گۆڤار نەما
بۆ هاتنەوەت..
بانگەوازی تیادا نەکەم
تاکو ئێستا، دەنگت نییە ڕەنگت نییە ..
دە، وەرەوە، بێ قەزابی !
ئەمڕۆ، لە هەموو ڕۆژێك زیاتر
کچ و ژنی وڵاتەکەم
پێویستییان بە
( خان بەهادوور ) یکی وەك تۆیە.

.............................................

عادلە خانم، کچی عەبدولقادر بەگی ساحێبقران و هاوسەری ( عوسمان پاشای جاف- وسمان پاشای جاف ) بوو ،دایکی هەردو شاعیری ناودار ( ئەحمەد موختار بەگی جاف) و ( تاهیر بەگی جاف ) بوو.
ساڵی ١٨٥٩ لە ( سنە ) لە دایك بووە ، لە ٧/١٩ / ١٩٢٤ لە هەڵەبجە، کۆچی دوایی کردووە.
لە سەردەمی خۆیدا ئنگلیزەکان، لەلایەن خۆیانەوە نازناوی بەرزی هیندی ( خان بەهادوور ) یان، بە( عادلە خانم ) بەخشیوە، بەهادوور بەمانای ئازا.



فەتاح حەسەن
دانیمارك-ڤالبی

هەڵەبجە نیوز
لەهەڵەبجەدەردەچێت
ساڵی یەکەم ژمارە(٨)سێشەممە١١ی١٠ی٢٠١٦
موبایل:٠٧٥٠٨٣٥٤٦٠٦
فەیسبوک:حلبجە نیوز

## دوالاپەرە

لە مامۆستایەکیان پرسي : دڵێك کە شکابێت دیسان ئەتوانێت عاشق ببێتەوە؟
. مامۆستاکە ووتي : بەڵێ ئەتوانێ
پرسیان : باشە تۆ تا ئێستا لە پەرداخێکي شکاودا ، ئاوت خواردوەتەوە؟
مامۆستاکە ووتي : باشە ئێوە لەبەر پەرداخێکي شکاو وازتان لە ئاوخواردنەوە هێناوە؟

ئەنجومەنی ڕێکخراوەکانی هەڵەبجە
بە هاوکاری بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی هەڵەبجە
لەژێر چاودێری وەزیری کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو

2016

Festival Second

دووەمین فیستیڤاڵی هەنار

Second Hanar Festival
for national production in halabja governorate

دووەمین فیستیڤاڵی
هەنار

بۆ بەرهەمە خۆماڵییەکانی پارێزگای هەڵەبجە

ڕۆژ : ١ شەممە 2016/10/16
کات : 10ی بەیانی
شوێن : شاری یاری هەڵەبجە

بۆزانیاری زیاتر
07501190205

## ڕۆژنم



دانا هەڵەبجەیی-هۆلندا

جارێکییان بە برپرسێکی باڵام ووت:
ئەو کابرایە باش ئەناسن کە ئەو پۆستە گرنگەتان پێداوە؟، ووتی ئەزانم مەبەستتت چییە، بەڵێ باش دەیناسین، ووتم: چۆن؟، ووتی: بەڵێ بەعسییە و کاتی خۆیشی سەر بەدەزگای موخابەراتی بەعس بووە، هەر لەبەر ئەوە ئەو پۆستەمان پێداوە کە بۆ پاککردنەوەی خۆی هەرچی پێ بڵێین، بێ سێ و دوو جێبەجێی ئەکات، وە هەتا ماوە چاوشۆرمانە و لە فەرمانمان دەرناچیت، ئەی قابیلە یەکێک دانێنین لە خۆمان پیاوتر و نیشتمانپەروەتر بێت، سبەی ئابرومان بەرێت ئەگەر شتیک بە دلی ئەو نەبێت.
ئەوە نمونەیەکی بچووکی بەڕێوەبەرایەتی سیستمەمی دەسەلاتی حیزبیی کوردیی، هەر بۆیە دۆخەکەمان بەو ئاقارە گەیشتووە.

کە گەرامەوە بۆ کوردستان زۆر ئومێدم هەبوو کە بتوانم، ئەوەی ئەمەویت ئەنجامی بدەەم.
نەک نەتوانرا و نەیانهێشت، بەڵکو ئەوەی کە ئومێدیشم پێی بوو، دارما و خرایە ژێر گڵ.
ئەمە نەک من بەلکو ئازار و بێ ئومیدی زۆرێک لە کوردانی تاراوگەی گرتوەتەوە.
هەربۆیە، ئەو سیستەم ونۆرمی کەلتووورە کۆمەلایەتییە وا شێوێنراوە، ئەگەر هێزیک و عەقلییەتێکی تازە و پاکژ و بێگەرد نەیەتە ئاراوە، و رادیکالانە مامەلە نەکات و ئەو خڵتە و تلپە ڕانەماڵێت، ئەوا لە ئێستای قەد باشتر نابێت،
جا زۆر ووتن سیاچەمانە خۆشە و پینە و پەرۆ و لاوانەوە دادی کەس نادات،،،،
ئێتر گلەیی خۆتان لەسەر خۆتان

## دۆڕانە
## قورسەکەی کاسپارۆف

کاسپارۆف شەترەنج زانی بە ناوبانگ ، لە یاریەکی شەترەنجا بە کەسێکی تازەکار و ناشارەزا دۆرا. هەمووان سەریان سورماو لە هۆکارەکەیان پرسی . کاسپارۆف ووتی : هەرگیز لە یاریکەدا نەمدەزانی کە ئەو تازەکار و نەشارەزایە ، لەبەر ئەمە ئەو هەر جولەیەکی ئەکرد من دەمویست بزانم ئەو چە پلانێك لە مێشکیدایە. هەندێکجار لە خیالی خۆمدا پلانەکەی ئەوم دەخوێندەوە و پێشبینی جوڵەی داهاتویم ئەکرد. بەڵام لەوپەڕی سەرسورماندا دیسان جوڵەیەکی سادەم لەوەوە ئەدی . تەرکیزم ئەکرد کە رەنگە پلانە تازەکەی بدۆزمەوە . ئەوەندە بیرم لای جوڵەکانی ئەو بوو کە داشەکانی خۆمم وون کردبوو . کاتێك کە مات بووم و دۆڕاندم ، تێگەشتم کە جوڵەکانی ئەو لەبەر نەشارەزایی ئەو بووە.
یاریەکەم دۆڕاند بەڵام پەندێکی گەورەم وەرگرت . " هەموو جوڵەکان ، فێڵێکیان لە پشتەوە نیە . ئەوەندە فێڵمان لێکراوە و پلانمان بۆ یەکتر داناوە کە باوەر بە جوڵەیەکی راستگۆیانەش ناکەین ، ڕێگاکە وون ئەکەین و ئەدۆڕێین !."
گەورەترین هەڵەیەك کە ئێمەی مرۆڤەکان لە پەیوەندیەکانماندا لە بەرانبەر یەکتری ئەیکەین ئەوەیە کە " نیوە ئەبیستین ، چارەکێك تێ ئەگەین ، هیچ بیر ناکەینەوە و دوو هێندەش کاردانەوە ئەنوێنین ."

## لە بیرەوەریەکانی
## نیل ئارمسترانگ

من مرۆڤێکی هەستیار نیم . کاتێ ماڵی باوکمم جێهێشت نەگریام . کاتێ پشیلەکەشم مرد نەگریام ، کاتێکیش لە ناسا کارم دەست کەوت نەگریام ، وە حەتا کاتێکیش پێم خستە سەر مانگ هەر نەگریام .
بەڵام کاتێك لەسەر مانگەوە سەیری زەویم کرد ، دڵم پر بوو. بە شپرزەیی و گومانەوە بەو ئاڵایەی کە قەرار بوو لەسەر مانگ هەڵیکەم ، یاریم ئەکرد. لەو مەودایەوە رەنگ و هۆز و نەتەوە دیار نەبوو . ئێمە بوین و ماڵێکی خری شین . لەبەر خۆمەوە ووتم : مرۆڤەکان بۆ چی ئەجەنگن ...؟
پەنجەی دەستمم روو بە زەوی گرت... هەموو سامان و دارایيم و گۆی زەوی بەو هەموو گەورەیی و عەزەمەتەوە ، لە پشت پەنجەم شاردرانەوە ... وە لەو کاتەیا بوو من فرمێسك بە چاوما هات و گریام .

و.لەفارسیەوە: سەعید وەهاب

بایەخ بە کاروباری پارێزگای هەڵەبجە دەدات
ژمارە(٩١)
هەینی١١ی١١ی ٢٠١٦
خاوەن ئیمتیاز وسەرنوسەر
سەلاح سەعید ئەمین

# هەڵەبجە نیوز
Halabja News

# ئەزهەر قبوڵیکردوە و هەرێم دان بەشەهادەی خانەقای بیارەدا نانێت

## زانکۆی هەڵەبجە دەبێتە دەستەخوشکی زانکۆی پیتەرپازمای هەنگاری

لە میانەی سەردانێکیدا بۆ پارێزگای هەڵەبجە و کۆبونەوەی لەگەڵ ئیدارەی پارێزگاکەدا، کونسولی گشتی هەنگاریا لەهەرێمی کوردستان ئاشکرایکرد، هەریەکە لە زانکۆی هەڵەبجە و زانکۆی پیتەرپازمای هەنگاری دەبنە دەستەخوشک، بۆ ئەو مەبەستەش لە هەفتەی داهاتودا بە فەرمی ڕێککەوتنامەیەک واژۆ دەکرێ. کابا ڤێزیکێنیای کونسولی گشتی هەنگاریا لە هەرێمی کوردستان، دوای یادکردنەوەی ڕۆژی سەربەخۆیی وڵاتەکەی لە هەڵەبجە، لەگەڵ ئیدارەی پارێزگای هەڵەبجە کۆبوەوە.لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا، کابا ڤێزیکێنیا، کونسولی گشتی هەنگاریا لە هەرێمی کوردستان، ئەوەی بۆ ڕۆژنامەنووسان خستەڕوو:«ئەمرۆ لەکۆبونەوەماندا لەگەڵ پارێزگاری هەڵەبجە، تیشکمان خستە سەر پەیوەندیەکانمان لەگەڵ پارێزگای هەڵەبجە و شارەکانی تری هەرێمی کوردستان لەو چوارچێوەیەشدا، زانکۆی هەڵەبجە و زانکۆی پیتەر پازمای هەنگاری دەبنە دەستە خوشکی یەکتر، بۆئەومەبەستەش جارێکی دیکە سەردانی هەڵەبجە دەکەمەوە... زیاتر

ل.٣


دیمەنێک لەخانەقای بیارە

## هەڵەبجە، دژ بەداخستنی کەناڵەکوردییەکان گردبونەوەیەک ڕێکخرا

ڕۆژنامەنووسان، چالاکوانان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی شاری هەڵەبجە، ئیدانەی داخستنی کەناڵە کوردییەکانی باکوری کوردستان دەکەن، کە ناوەندەکانیان لە ئەوروپایە و جەخت دەکەنەوە، کە تورکیا ناتوانێت بەم کردەوانەی دەنگی ئازاد لەو پارچەیەدا کپ بکات، .لە بەردەم پارکی یاری لە شاری هەڵەبجە، ڕۆژنامەنووسان، چالاکوان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی لە هەڵەبجە گردبوونەوەیەکیان دژ بە داخستنی کەناڵە کوردییەکان لە باکوری کوردستان و تورکیا و وڵاتانی ئەوروپا ئەنجامدا و تێیدا بەیاننامەیەکیان خوێندەوە.

پایتەختی ئاشتی ڕۆستەم خامۆش

ل.٢

کارە دەستیەکانی ناوچەی هەورامان

ل.٣...

عەیبە بەجێی هێشتین

ل.٤...

### زیاد لەسەد و سی ساڵە فەقێی لێ نەبراوە

## لەسەر دەستی (شێخ عومەر زیائەدین) دروست کراوە، ١٥١ئیجازەی مەلایەتی بەخشیوە، ئێستا٨٨ فەقێی هەیە

مێژوی خانەقای بیارە بۆ ١٣١ ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، کە لەسەر دەستی (شێخ عمر زیادەدین) دروست کراوە، ١٥١ئیجازەی مەلایەتی دراوە بەو فوتابیانەی کە لێرە خوێندویانە، لەئێستەدا ٨٨ فەقێ تیایدا دەرس دەخوێنن، بەڵام حکومەتی هەرێمی کوردستان دان بەشەهادەی فەقێکانی خانەقای بیارەدا نانێت.
مامۆستا فاخر شەفلاوەیی سەرپەرشتیاری خانەقای بیارە بۆ ئاوێنە وتی: لەسەردەمی خانەقای بیارە بنیات نراوە لەلایەن (شێخ عمر زیادەدین)و بوەتە ناوەندێکی عیلمو زانست خزمەتی بەرچاوی کردوەو بەسەدان زاناو مامۆستای گەورەی پێگەیاندوە بەڵام بەداخەوە لەئێستەدا لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە دان بەشەهادەی خانەقای بیارەدا نانرێت لەکاتێکدا لەساڵی ١٩٧٠دەرچوی خانەقا لەزانکۆی ئەزهەر لەقاهیرە قبوڵ کراوە، بۆیە چەند جار لەگەڵ وەزیری ئەوقاف قسەمان کردوە جەنابی وەزیر پێی ڕاگەیاندم دەبێت بەبڕیارێکی تایبەت ئەو کێشەی شەهادەی فەقێیانە چارەسەر بکەین بەڵام تائێستا وەڵامیان نەداوینەتەوە.
مەلا فاخیر وتیشی : لەئێستەدا (٨٨) فەقێ لەخانەقای بیارە دەرس دەخوێنن هەر فوتابیەکیش بۆ ماوەی چوار ساڵ بۆ شەش ساڵ و هەشت ساڵ دەبێت بخوێنێت کە ٢٠ کتێبی تایبەت هەیەو لەسەر دەمی (شێخ عمر زیادەدین) دانراوە تائێستەش لەسەر ئەو مەنهەجە دەخوێنین دەبێت فوتابیەکە ئەو کتێبانە تەواو بکات ئینجا شەهادەی مەلایەتی دەدرێتی زۆربەی فوتابیەکانمان یەک تا سێی ساڵی دەچنە فوتابخانەی حکومی پاشان ڕو دەکەنە خانەقای بیارە بۆ خوێندنی فەقێیەتی لێرە شەهادەی مەلایەتی وەردەگرێت لەبەر تەنگی شوێنەکەمان ناتوانین فوتابی زۆر وەربگرین...زیاتر

ل ٢

### حکومەتی هەرێم دان بەبڕوانامەکانیدا نانێت

## سەدو سی و یەک ساڵە فەقێی لێئەبڕاوە

# خانەقای بیارە: ڕۆژانە خواردنی ٢٠٠ کەس دەدرێت

مێژووی خانەقای بیارە بۆ ١٣١ ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، کە لەسەر دەستی (الشیخ عمر ضیاءالدین) دروست کراوە، ١٥١ ئیجازەی مەلایەتی دراوە بەو فەقێیانەی کە لێرە خوێندوویانە، لەئێستادا ٨٨ فەقێ تیایدا دەرس دەخوێنن، بەڵام حکومەتی هەرێمی کوردستان دان بەشەهادەی فەقێکانی خانەقای بیارەدا نانێت.

مامۆستا قاهیر شەقڵاوەیی سەرپەرشتیاری خانەقای بیارە بۆ ئاوێنە وتی: لەسەردەمی خانەقای بیارە بنیات نراوە لەلایەن الشیخ عمر ضیاءالدین و بووەتە ناوەندێکی علم و زانست خزمەتی بەرچاوی کردووە بەسەدان زاناو مامۆستای گەورەی پێگەیاندووە بەڵام بەداخەوە لەئێستادا لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە دان بەشەهادەی خانەقای بیارەدا نانرێت لەکاتێکدا لەساڵی ١٩٧٠دەرچووی خانەقا لەزانکۆی ئەزهەر لەقاهیرە قبوڵ کراوە، بۆیە چەند جار لەگەڵ وەزیری ئەوقاف قسەمان کردووە جەنابی وەزیر پێی ڕاگەیاندم دەبێت بەبڕیارێکی تایبەت ئەو کێشەی شەهادەی فەقێیانە چارەسەر بکەین بەڵام تائێستا وەڵامیان نەداوینەتەوە.

مەلا قاهیر وتیشی : لەئێستادا (٨٨) فەقێ لەخانەقای بیارە دەرس دەخوێنن هەر فەقێیەکیش بۆ ماوەی چوار ساڵ بۆ شەش ساڵ و هەشت ساڵ دەبێت بخوێنێت کە ٤٠ کتێبی تایبەت هەیەو لەسەر دەستی الشیخ عمر ضیاءالدین دانراوە تائێستاش لەسەر ئەو مەنهەجە دەخوێنن دەبێت فەقێیەکە ئەو کتێبانە تەواو بکات ئینجا شەهادەی مەلایەتی دەدرێتێ زۆربەی فەقێیەکانمان یەک تا سێ ساڵی دەچنە فەقێخانەی حکومی پاشان ڕوو دەکەنە خانەقای بیارە بۆ خوێندنی فەقێیەتی لێرە شەهادەی مەلایەتی وەردەگرێت لەبەر تەنگی شوێنەکەمان ناتوانین فەقێی زۆر وەربگرین.

هەروەها ڕوونیشیکردەوە : خەرجی خانەقا لەسەر بنەماڵەی شێخان و خەڵکی خێرخوازە کە خواردن دابین دەکرێت بەشێوەیەک دەتوانین بڵێین ڕۆژانە خواردنی ٢٠٠ کەس دەدرێت، ئەو کەسانەش دێن لێرە لەخانەقای بیارە گۆڕی (شێخ عمر ضیاءالدین و شێخ نەجمەدین و شێخ عەلائەدین)ی تێدایەو ئەو گەشتیارانە دێن بۆ سەر گۆڕی ئەو شێخانە بەهۆی پیاو چاکی و لەخواترسی ئەو شێخانە خەڵکی سەردانی مەزارگەکەیان دەکەن لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دوکانانەی کە لەدەوروبەری خانەقاکە هەیە موڵکی خانەقاکەن هەموو داهاتەکەی بۆ خانەقاکە دەگەڕێتەوەو دەکرێتە مەسروفی ڕۆژانە بۆ خانەقا.

سەرپەرشتیاری خانەقای بیارە ئاماژەی بۆ ئەوەکرد ، بڕیار بوو لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان خانەقای بیارە نۆژەنکرێتەوەو لەسەر شێوەی مزگەوتێکی تورکی بکرێتەوە، کە شێوەی ئێستەی خانەقا دەگۆڕدراو شوقەی تایبەت بەفەقێکان دەکرایەوەو مامۆستایانی تایبەتیش بڕیاربوو بێن دەرس بڵێنەوە بەڵام بەداخەوە لەبەر شەڕی داعش و قەیرانی دارایی ئەو پرۆژەیە وەستێندرا.

دەربارەی ڕاکێشانی گەشتیار بۆ ناحیەی بیارە بەهۆی خانەقای بیارەوە، مەلا قاهر وتی دوو جۆر گەشتیار ڕوو دەکەنە ئەم ناوچەیە هەندێ گەشتیار کە دێن بەمەبەستی گەڕان و سەیران بۆ ناوچەکەو سەردانی خانەقاش دەکەن، هەندێکی تر تایبەت بەمەبەستی زیارەت کردنی خانەقاو شێخانی نەقشبەندی دێن بۆ ئێرە کە لەڕۆژهەڵاتی کوردستان و شارەکانی تری کوردستانەوە سەردانی ئێرە دەکەن و زۆر بەی کات لێرە دەمێننەوە،چونکە لێرە شوێنی مانەوەو خواردن دابین کراوە بۆ ئەو کەسانەی کە زیارەتی ئەم خانەقایە دەکەن.

ناوبراو وتیشی نزیکەی ٧٠٠ کتێبمان هەیە مێژوویەکی کۆنیان هەیە کە ئەتوانێت ناتوانی زۆر ئەمێنیتەوەدیوی پێکەی لەبەر کۆنیەیان ڕزیون بۆیە لەبەرئامەسەدایە لەگەڵ دارایی ڕێگەبدات لیژنەیەکی پسپۆڕ پێکبێنین و هەموو ئەو کتێبانە چاپێکتر لەچاپ بدەینەوە.

بەپێی ئەو سەرچاوانەی مامۆستایانی تەریقەتی نەقشبەندی پشتی پێدەبەستن پەیامبەری ئیسلام (محمد) دروودی خوای لەسەر بێت دەچێتە خەوی (الشیخ عمر ضیاء الدین) داوای لێدەکات کە لەبیارە ئەو خانەقایە بکاتەوە، الشیخ عمر ضیاء الدین) لەمسجدەکانی لەنجەف کەربەلا بوو بەهەشت دەچێتەوە سەر ئیمامی حەسەن و حسێن. شێخ عمر کوڕی شێخ عوسمانی گەورەی تەریقەتی نەقشبەندییە.

مامۆستا قاهیر شەقڵاوایی ١٩٩٣ دێتە ناحیەی بیارە ئیجازەی مامۆستای ئاینی لەخانەقای بیارە وەردەگرێت چەندین ساڵە سەرپەرشتیاری گشتی خانەقای بیارەیە هاوسەرگیری لەناحیەی بیارە کردووە

ئاوێنە-عەزیز ڕەسوڵ

## پایتەختی ئاشتی

ڕۆستەم خامۆش
هەولێر

هەڵەبجەی ئازیز
شاری شیرینم
هەر ئاوەدان بی
مەڵبەندی ژینم
تۆ سەربڵندی
لە گشت جیهانا
جوان و
ڕەنگینی لە
کوردستانا

ئەی هەڵەبجەکەم
پایتەختی ئاشتی
جێگەی
شانازی وردو
درشتی
شاری
دێرینی
پێکەوە ژیانی
باوەشی
سۆزو
ئەوینی گیانی

شارەجوانەکەم تۆ
خۆشەویستی
تۆی لە نێو دڵان ،
لە بیرو هەستی
نازیزو شیرین ، وەک
سۆمای چاوی
پایتەختی ئاشتی
جوانترین ناوی

شیعری : ڕۆستەم خامۆش
ئاوازی : جوان کەریم
وتنی : ژیلا تەها
مۆسیقاو تۆمار : خالید فتاح

# کارە دەستییەکانی هەورامان مەترسی لەناوچوونیان لەسەرە

ئامادەکردنی:هاوکار و جیهاد

ناوچەی هەورامان کە بە
دەستڕەنگینی دانیشتوانەکەی و
جوانی سروشتەکەی بەناوبانگە،
لە ئێستادا ئەو پیشە دەستیانە
رویان لەکەمبوونەوە کردووە و
هەندێکیشیان مەترسی لەناوچوونیان
لەسەرە، گەشتیارانیش کردنەوەی
مۆزەخانەیەک بۆ نمایشکردنی
پیشە دەستیەکان بەگرنگ دەزانن.
گرنگترین ئەو پیشە دەستیانە کە
لەرابردوو ئێستاشدا لە ناوچەی
هەورامان ئەنجامدراون بریتین
لە دروستکردن و چنینی کڵاش
و شاڵ و فەرشی و بەرهەم
هێنانی چەند بەرهەمێکی وەک
رووبەهەنارو شەربەتی مێوژو
دۆشاوی توو،
هەروەها چەندین
کار و پیشە و
بەرهەمیتر.
سەرهەنگ
عوسمان،
خاوەنی یەکێک
لە دووکانە
کلتورییەکانی
شارەدێی
بیارەی ناوچەی
هەورامان،
بۆ رۆژنیوز
باسی ئەوەکرد،
خەڵکی ناوچەی
هەورمان
بەشێوەیەکی
گشتی بەوە بەناوبانگ بوون کە
زۆربەی پێداویستی و نیشانەکانی
رۆژانەی خۆیان بە دەستی
خۆیان بەرهەمیان هێناوەو
سودیان لەبەرهەمی بازاڕەکان
وەنەگرتووە.
سەرهەنگ وتی:«لە ئێستادا
بەهۆی چەند هۆکارێکی جیاواز
کە گرنگترینیان کۆچکردنی
هەورامیەکانە لە گوندەکانەوە
بۆشارەکان، بوەتە هۆی ئەوەی
کە هەورامیەکانیش تا رادەیەک
وازیان لە کارو پیشە دەستیەکانی
خۆیان هێناوە، بەجۆرێک کە
زۆربەی ئەو کەسەرستەو نیشە
دەستیانەی لە دووکانەکەی مندا
هەن و دەبینرێن لە هەورامانی
رۆژهەڵات دوستکراون و ئێمەش
هاوردەیان دەکەین».
وتیشی:«هێنان و هەستەرووی
ئەم کەرستە کەلەپوری و
پیشە دەستیانە کاریگەریەکی
راستەوخۆیان هەبووە لە
زیادبوونی ژمارەیەکی زیاتر لە
گەشتیار بۆناوچەی هەورمان،
بەتایبەتی ئەو گەشتیارانەی کە
لەشارەکانی سلێمانی و هەولێر و
شار و شارۆچکەکانی ناوخۆوە
دێنە ناوچەکە کەرستەو شمەکە
خۆماڵییەکان دەکڕن، بەڵام بەداخەوە
تا ئێستا سەنتەرێک یاخود
مۆزەخانەیەکی تایبەت لەناوچەکەدا
بوونی نیە کە ببێتە هۆی پاراستن و

لە ناو ئەچوونی ئەو کەرستانەی
کە لە رابردوودا لەلایەن کەسانی
شارەزاوە دروستکراون، هەر
ئەوەش وایکردووە کە هەندێک
لیشی دەستی کە لەرابردودا
دروستکراون لەناوچوون و ئەوەی
توێ نەزانن چۆن دروستدەکرێت».
ئەوەشی وت:«ئێمە شانبەشانی
هەستەرووی شمەکە کەلەپوریەکان
و نیشە دەستیەکان لەهەمان کاتدا
لەو خۆراک و بەرهەمانەشمان
هەستەرەوو کە خۆماڵین و
لەکارگەکان بەرهەم ناهێنرێن، وەک
رووبەهەنارو گوێزی هەورامان
و هەنگوینی شاخ و دۆشاو
و مرەبای میوە جیاوازەکان،
ئەوەش وایکردووە کە بازاڕی
شارۆچکەی بیارە قەرەباڵغیەکی
زیاتر بەخۆیەوە ببینێت».
هەروەها، هاوکار حەمە برایم،
وەک گەشتیارێک کە لە شاری
سلێمانییەوە هاتبویە شارەدێی
بیارە بۆ رۆژنیوز قسەیکردو
وتی:«هەبونی شمەک و کەرستە
کەلەپوریەکان لەهەر جێگایەکی
هەرێمی کوردستان گرنگی و
تایبەتمەندی خۆی هەیە، هەر
لەو چوارچێوەشدا ناوچەی
هەورامان تایبەتمەندی خۆی
هەیە و بە کەرستەو شمەکی
خۆماڵی بەناوبانگە، ئەمەش
وای لە گەشتیاران کردووە کە
ئەگەر بۆجارێکیش بێت روو لەم
ناوچەیە بکەن».
ئاماژەی بەوەشکرد، بەداخەوە
لە ئێستادا لە ناوماڵەکاندا شتە
کلتوریەکان زۆر بەکەمی بەدی
دەکرێن، بۆیە هەبونی چەند دوکان
و شوێنێکی تایبەت بەم شمەکە
کەلەپوریانە هۆکارێکی باش
دەبن بۆ بەزیندوو هێشتنەوەی
کلتورو کەلەپوری کوردەواری،
جێگەی خۆشیەتی کە لایەنی
پەیوەندیداریش زیاتر هێتی خەڵکی
ناوچەکەو ئەم دوکاندارانەش بدات
کە کەرستەو شمەکی کەلەپوری
زیاتر بخەنە بازاڕەوەو لەهەمان
کاتیشدا هێتی هاوڵاتیان بدرێت کە
ئەو کەرستە خۆماڵیانە بەرکار.

بهێنن.
هاوکار وتی:«زۆر کەرستەو
پێداویستی هەن کە نیشی
دەستین و بەشێکن لە کەلەپوری
کوردەواری، بەڵام خەریکە
لەناودەچن و بنویان نامێنێت،
بۆیە جێگەی خۆیەتی کە
وەزارەتی رۆشنبیری بیر لە
دروستکردنی مۆزەخانەیەک
بکاتەوە بۆ پاراستنی ئەو شمەک
و کەرستانەی کە مەترسی
لەناوچوونیان لەسەرە، چونکە
مەرج نیە هەموو کاتێک تەنها
گەشتیاری ناوخۆی سەردانی
ناوچەکە بکەن، بەڵکوو ئەو
گەشتیارە بیانیانەشی کە دێنە



ناوچەکە بەچاوی خۆیان ئەو
کەرستانە ببینن کە خەڵکی
ناوچەکە بەدەستی خۆیان
دروستیان کردووە».
یەکێکی تر لە خاوەن دوکانە
کەلەپوریەکانی ناوچەی
هەورمان بەناوی جیهاد ئامیر،
بە رۆژنیوزی وت:«بەداخەوە
بەردەوامی قەیرانی دارایی
کاریگەری لەسەر بازاڕی ئێمەش
کردووە، بە جۆرێک بە بەراورد
بەساڵانی رابردوو فرۆشتنی
کەرستەو شمەکە کەلەپوریەکان
کەمی کردووە، ئەوەش بوەتە
هۆی ئەوەی کە ئێمەی خاوەن
دوکانە کەلەپوریەکانیش نەتوانین
رێژەیەکی زۆر ئەو شمەکانە
بهێنین بیخەینە بازاڕەوە».
وتیشی:«هەبوونی شمەکە
کلتوری و نیشە دەستیەکان
کاریگەریەکی راستەوخۆی
هەبووە کە ژمارەیەکی زیاتر
گەشتیاری ناوخۆیی و بیانی روو
لەناوچەکە بکەن، بەڵام ئەوەی
بوەتە گرفت لەناوچەیەکی گرنگ
و بەرفراوانی وەک هەوراماندا
تا ئێستا لایەنە پەیوەندیدارەکان و
حکومەتی هەرێمیش نەیتوانیوە
کارێکی وەها بکەن کە زیاتر
ناوچەکە بە هاوڵاتیان و
گەشتیاران بناسێنن».
رۆژنیوز



# یاخیبونی مەدەنی و گۆڕانکاری

سەلاح سەعید ئەمین

کاتێک دەوڵەت یان حکومەت بەئەرکەکانی خۆی
هەڵناسێت بەرامبەر بەهاوڵاتیەکانی،لە دابینکردنی خۆشگوزەرانی لە
رێگەی چەسپاندنی یاساو شەفافیەت لەکۆی کایەکانی ژیانی کۆمەڵگەدا
بە کایەی ئابوری ودارایشەوە ،کاتێک حکومەت لەبەرجەستەکردنی
عەدالەتی کۆمەڵایەتیدا شکست دەهێنێت و جیاوازییەکی گەورەی چینایەتی
لەکۆمەڵگەدا دروست دەکات ولەماوەیەکی زەمەنی کورتدا هەزاران
ملیار دێر وەک قارچک هەڵدەتۆقن و لەلایەکی تریشەوە رێژەیەکی زۆری
هاوڵاتیەکانی لەژێر هێڵی هەژارییەوە دەژین،کاتێک [illegible]
حکومەت لەشێوێک بۆ داواکاری و خواستەکانی خەڵکیش لەشێوێکی
تر،ئەوا ئەوکات وەک «هنری دیڤید سۆرۆ»ی نوسەری ئەمەریکی
دەڵێت:ئەرکی تاک بەتاکی کۆمەڵگایە لە حکومەت راست ببێتەوە و
داوای مافەکانی بکات،یان وەک دەڵێت:«نابێت تاک لەکۆمەڵگەدا
ئەسلیمی خواستەکانی حکومەت ببێت کاتێک یاری بەچارەنوسی بکات
و بەردەوام ئایندەیەکی نادیاری دەبات،نابێت تاک دەستەوەئەژنۆ بوەستێت
لەبەردەم حوکمەتێکدا کاتێک لەعەدالەت لادەدات،بەڵکو پێویستە لێی
یاخی ببێت ئەگەر بەزیندانی کردنیشی کۆتایی بێت»ئەم حەکیم و نوسەرە
ئەمەریکیە،وەک ئەوەی قسە بۆ ئەمڕۆی ئێمە بکات لەهەرێمی
کوردستان،ئاماژە بەوە دەکات:«رەنگە تەنها یاخیبونی هاوڵاتیێک لە
یاسایەکی خراپ و ستەمکارانە ،هۆشیارییەکی میللی دروست بکات و
ئەنجامە خوازراوەکان بەدیبهێنێت».
بەهاری عەرەبی بەپزیسکەی ئەو ئاگرە دەستی پێکرد کە «موحەمەد
بوعزیزی»فرۆشیاری سەر عەرەبانە ئەنجامیدا،لەبەردا بەرامبەر بە
دەسەڵاتە ستەمکارەکەی «بن علی»ی تونس،کەدواتر بەشێکی زۆرلە
وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقیای گرتەوە،کە تا ئێستاش
ناوچەکە کوڵ دەدات بەو یاخی بونەی بوعزیزی ، ئەو یاخیبون و
راپەرینەی «بوعزیزی» پێی هەستا بوە جیاکەرەوەو فاسیلەی مێژووی
پێش خۆی و دوای خۆی،بەهاری عەرەبی بەکۆی گشت ئەنجام و
کاریگەرییەکانی هەرچیەک بون و بێ ئەو راستیە کەسناکاتەوە کە وەک
«غاندی هێمای بۆ دەکات،یاخیبونی مەدەنی یان ناتوندوتیژییانە دەتوانێت
ئەوە بکات کە بەچەک و هۆکارەکانی تر ناکرێن».
لەهەرێم،رۆژ لەدوای رۆژ حکومەت شکستەکانی زیاتر وگەندەڵیەکانی
فراوانتر دەبن،باج لەسەر بوار جیاجیاکان چەند قاتبوەتەوە و
لەبەرامبەردا خزمەتگوزاری وکوالێتی خزمەتگوزارییەکان روو
لەداکشانن،لەنێوان حکومەت وهاوڵاتیاندا بۆشاییەکی هێجگار گەورە
دروست بوەو پێدانی موچە لەکاتی خۆیداو بەکەمتر لەنیوەش
بەحکومەت هەڵناسورێت،حکومەت دەستی داوەتە «بەتایبەتکردن»ی
خزمەتگوزارییە گشتیەکانی وەک ئاو و کارەبا و هتد...لەکاتێکدا
شارەزایان باس لەوە دەکەن،بۆنمونەکارەبا بەپێی ستانداردی جیهانی
حکومەت خۆی زیاتر لەبەشی پێویستی هاوڵاتیانی هەرێم بەرهەم
دەهێنێ،دەیگوازێتەوە،دابەشیشی دەکات بەڵام ئێستا دێت دەیداتەکەرتی
تایبەت،پرسیارەکە ئەوەیە،خۆی بۆ ئەوە ناکات کەکەرتی تایبەت دەیکات
ولەبەرامبەردا بارگرانیەکی زۆر بۆ هاوڵاتیان دروست دەکات،لەکوێی
دنیادا هەبوە حکومەتێک خۆی لەسەربودجەی گشتی کۆی پێویستیەکانی
بەرهەمهێنانی وزەیەکی وەک کارەبا دابین بکات و دواتر بیداتە
کەرتی تایبەت،نمونەی ئەوە هەیە کۆمپانیایەک لەسفرەوە پرۆسەیەکی
بەرهەمهێنانی وەک کارەباوە دەست پێبکات وبەسەرمایەی خۆی
بەرهەمی بهێنێ وبیگوازێتەوەو دابەشیشی بکات و بەنرخێکی گونجاو
بیداتە هاوڵاتیان نەک وەک ئەوەی لەهەرێم هەیە.
کورت وکرمانج،ئێمە دەبێ لەبەردەم حکومەتێکی
شکستخواردودا،ین،یاخیبونی مەدەنیانەو گرتنە بەری رێوشوێنی
ناتوندوتیژیانە بوەتە ئەرکی تاکی تاکی ئەم کۆمەڵگایە،ئێمە دەبێت
هەڵبژێرین لەنێوان ئەوەی حکومەت دەستی داوەتە لەناعەدالەتی و
ناشەفافی و هەمو ئەوانەی بەسەرمان کێشاوە،یان یاخیبونێکی
مەدەنی و کاردانەوەیەکی ئەوتۆ ناتوندوتیژیانە کەسنورێک بۆ
ئەوبارودۆخ وگوزەران و شێوازی حکومڕانیە دابنێت کەژیان [illegible]
سەدەیەکە پێوەی گرفتارین ورۆحی ئینتیما وخۆشەویستی بۆ خاک
وولاتیش تێدا کوشتوین.

# بایکۆتی مامۆستایان و فەرمانبەران بەردەوامە

بایەخ بە کاروباری پارێزگای هەڵەبجە دەدات
ژمارە(١٠)
یەکشەممە ٢٠ی ١١ی ٢٠١٦
خاوەن ئیمتیازوسەرنوسەر
سەلاح سەعید ئەمین

# هەڵەبجە نیوز
Halabja News

## کاندیدەکانی ئەنجومەنی پارێزگا لەهەوڵی پێکهێنانی ئەنجومەنەکەیاندان

### ئەمرۆ خۆپیشاندانە

هەڵەبجەنیوز

ئاسۆ کەمال،لەدەستەی داکۆکی لەمافی مامۆستایان،بەهەڵەبجە نیوزی راگەیاند: وەک مامۆستایانی هەلەبجە بریارمان داوە رۆژی یەکشەممە٢٠ی١١ی٢٠١٦ خۆپیشاندانێک بکرێت .لەفولکەی شەهید عومەری خاوەر بۆ بەردەم باخی گشتی کاتژمێر دەی بەیانی ،ئەم مامۆستایە ئەوەشیگوت: پەیامماں تەنهاداواکاری چاک کردنی موچەی مامۆستایان و فەرمانبەرانە،مامۆستا ئاسۆ کەمال،سەبارەت بەسەرپەرشتیکردنی خۆپیشاندانەکە وتی: بەرێوەبەرەکان و یەکێتی مامۆستایان و دەستەی داکۆکی لە مافی مامۆستایان ئامادەکاری بۆدەکەن .شایانی باسە،بایکۆتی مامۆستایان وفەرمانبەران وبەهۆی سیستەمی پاشەکەوتی موچە و نەدانی لەکاتی خۆیدا نزیکەی دوو مانگە بەردەوامی هەیە .




### هەوڵی پێکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە دەدرێت

هەڵەبجەنیوز:تایبەت

کاندیدەکانی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە ،هەولی پیکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە دەدەن و هەوڵەکانیان بۆ ئەو مەبەستە چر کردوەتەوە. هەڵەبجەنیوز،زانیویەتی زۆرینەی کاندیدەکانی لیستەجیاوازەکانی ئەنجومەنی پارێزگاکە دور لەچاوی کامێراکان و بەنهێنی هەوڵەکانیان چڕکردوەتەوە بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنەکەو لەم روەشەوە ،بریاریانداوە قسە بۆ راگەیاندنەکان نەکەن وهەولەکانیان ئاشکرانەکەن،تاگەشتن بەئەنجامێک.

---

## هۆشداری لەدوبارەبونەوەی ١٧ی شوبات دەدرێت

چالاکانی خۆپیشاندان و نارەزایەتیەکانی شەقام لەتۆرە کۆمەلایەتیەکان هۆشداری لەدوبارە بونەوەی ١٧ی شوباتی ٢٠١١دەدەن هاوکات لەگەڵ فروانبونی چالاکیەکانی شەقام وخۆپیشاندان وبەشداری کردنی چین و توێژە جیاوازەکان لەگەل مامۆستایان و فەرمانبەران،چالاکانی شەقام و خۆپیشاندانەکان هۆشداری لەفۆستنەوەی نارەزایەتەکان دەدەن لەلایەن حزبە سیاسیەکان و داوا دەکەن، نارەزایەتی وچالاکیەکانی شەقام بەحزبی نەکرێن،و حزبەسیاسیەکان بەکردەوە پشتگیری شەقام بکەن. لە١٧ی‌شوباتی ٢٠١١ و رۆژانی دواتر لەپارێزگاکانی سلێمانی و هەڵەبجە وئیدارەکانی گەرمیان وراپەرین زیاتر لەدوو مانگ خۆپیشاندان بەرێوەچو ،دژ بەناعەدالەتی وگەندەلیو کۆمەڵێک لەهاولاتیان و هێزە ئەمنیەکان بونە قوربانی و دواتر خۆپیشاندانەکان بەهێزی ئەمنی کۆتایانپێهێنرا.

## شاندێکی ئیتاڵی سەردانی هەڵەبجەیانکرد

رۆژ نیوز ـ جیهاد هەورامی شاندێکی ولاتی ئیتالیا و ئەندامێکی رێکخراوی شاروانیەکانی جیهان بۆ ئاشتی سەردانی هەڵەبجە و ئەندامانی کۆمەڵگەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە کرد. شاندێکی ولاتی ئیتالیا و ئەندامێکی رێکخراوی شاروانیەکانی جیهان بە ئاشتی سەردانی کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجەیان کرد و لە کۆبونەوەیەکیاندا لەگەڵ سەرۆک و جێگر و ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە بریاریاندا، کە لە داهاتویەکی نزیکدا لە بواری ئاشتی و ژینگە و پرسی ژنان هاوکاری هەڵەبجە بکەن. حیکمەت فایەق، ئەندامی باڵای کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە ئەوەی رایگەیاند: «لە چوارچێوەی ئەو پەیوەندی و هاوکاریەی نێوانمان شاندێکی ولاتی ئیتالیا بە سەرۆکایەتی ژنە چالاکوانی رێکخراوی شاروانیەکانی جیهان بۆ ئاشتی، فوجیتا، بە یاوەری خدر کەریم سەردانی کۆمەڵەکەمانیانکرد

برایەتی نەوت!
دەلیل جەمال
ل٢..

کەسوکاری خوێندکاران پشتگیری بایکۆتی مامۆستایان بکەن...
ل٣

شیعرێکی ئیبراهیم هەورامانی
ل٤...

## لەماوەی یەك ساڵدا

# ٣ کارگەی بەرهەمهێنانی خواردنی خۆماڵی لەهەڵەبجە کراونەتەوە کەرەستەکانی ئەم کارگانە لەسنورەکەدا بەئاسانی دەست دەکەون

لەپارێزگای هەڵەبجە لەلایەن وەبەرهێنەرانەوە لەمساڵدا سێ کارگەی وەبەرهێنان کراونەتەوە، پارێزگاری هەڵەبجەش ئاماژە بۆئەوەدەکات بەردەوامدەبن لەهاندانی وەبەرهێنان بۆ کردنەوەی کارگەی زیاتر.

ئا: عەزیز رەسوڵ

**عەلی عوسمان پارێزگاری هەڵەبجە بەوەکالەت دەڵێت "کردنەوەی سێ کارگە لەماوەی بونی هەڵەبجە بەپارێزگا زۆر گرنگە بەردەوامیش دەبن لەهاندانی وەبەرهێنەران تاوەکو بتوانین سەرمایەدارەکان سەرمایەکەیان لەبواری کردنەوەی کارگەی جۆراوجۆر بخەنەگەڕ بتوانین ژێرخانی ئابوری پارێزگای هەڵەبجە زۆر بەهێز بکەن".**

:دیاری عوسمان ئەمساڵ کارگەیەکی دۆشای هەناری لە پارێزگاکە کردەوە کە ناوەندی بەرهەمهێنانی باشترین هەناری کوردستانە بۆیە چاوەڕوانی خۆی‌و خاوەن باخەکانیش وایە ئەم کارگەیە بتوانێت ئاسانکاریان بۆبکات بتوانن بەرهەمی هەنارەکانیان لەخراپبون بپارێزێت، دەڵێت "لەبەر زۆری باخی هەنار لەناوچەکەمان بیرم لەوەکردەوە هاوشێوەی کارگەی دۆشاو منیش کارگەی تایبەت بەدۆشاوی هەنار دامەزرێنم بۆیە لەوڵاتی ئێرانەوە ئەم کارگەی ئاوی هەنارەم هێناوە لەئێستەدا کارگەیەکی گەورە نیە ئەگەربێت‌و لایەنی حکومی هاوکارمان بێت ئەتوانین ئەم کارگەیە بکەینە کارگەیەکی گەورە کە سودێکی زۆر باشی دەبێت بۆ پارێزگای هەڵەبجە". ئەوەش دەڵێت "سێ شەفت

کاردەکەین بە(٩) کرێکار ئیشەکانمان دەکەین لەیەك کاتژمێر (٢٠)تەن هەنار پاڵەفتە دەکەین‌و (٢٠٠)لیتر ئاوی هەناری لێدروستدەبێت، لەم (٢٠٠)لیترەیش دەتوانرێت (٧٠)کیلۆ دۆشاوی هەناری لێبەرهەمبێت، هاوکات بۆ هەر تەنێك هەنار ئێمە بری(١٠٠)هەزار دینار لەخاوەنەکانیان وەردەگرین لەلایەن باخدارەکانی هەڵەبجەو هەورامانیشەوە پێشوازییەکی زۆرباش لەکارگەکەمان کراوە بەرهەمەکانیان بۆ ئێمە دێنن تاوەکو بۆیان پالفتە بکەین".

دانانی ئەم کارگەیە دڵی باخدارەکانی پارێزگای هەڵەبجەو هەورامانی خۆشکردووە، بەجۆرێك عوسمان حەمەکەریم کە خاوەنی باخی هەنارە لەناوچەی هەورامان بۆ ئاوێنە وتی"من ساڵانە زیاد لەدە تەن هەنارم دەبێت بەهۆی ساغ نەبونەوەیان بەپارەیەکی کەم دەمفرۆشتن، بەڵام ئەمساڵ لەبەر دامەزراندنی ئەم کارگەی ئاوی هەنارە لەهەڵەبجە هەنارەکانم نەفرۆشت‌و هێنامن بۆ ئەم کارگەیە دەیکەمە روبەهەنار بەوهۆیەوە داهاتی زیاترم دەستدەکەوێت".

چاوەڕوان دەکرێت ئەمساڵ پارێزگای هەڵەبجە ٢٥ هەزار تەن هەناری هەبێت ئەوەش زیاترە لەئاستی پێداویستی ناوخۆیی لەوەرزی پایزدا کە وەرزی پێگەیشتنی هەنارە، بۆیە ساڵانە بەهۆی نەبونی ساردخانەوە ئەو بەرهەمانەی ساغ نابنەوەو دەفەوتێن.

عەلی عوسمان پارێزگاری هەڵەبجە بەوەکالەت دەڵێت "کردنەوەی سێ کارگە لەماوەی بونی هەڵەبجە بەپارێزگا زۆر گرنگە بەردەوامیش دەبن لەهاندانی وەبەرهێنەران تاوەکو بتوانین سەرمایەدارەکان سەرمایەکەیان لەبواری کردنەوەی کارگەی جۆراوجۆر بخەنەگەڕ بتوانین ژێرخانی ئابوری پارێزگای هەڵەبجە زۆر بەهێز بکەن".

پارێزگاری هەڵبجە دەڵێت"ئێمە قسەمان لەگەڵ خاوەن کارگەکان کردوە کە دەبێت کەرەستە خاوەکانی سنورەکەی خۆمان بەکاربهێنن لەهەمانکاتدا گەنجانی شارەکە سودمەندی یەکەمبن لەدەستکەوتنی هەلیکار لەکارگەکانیان".

عەلی عوسمان وتیشی "پارێزگای هەڵەبجە پارێزگایەکی بەتەماتەیە ئەوە لەناوخۆ هەیە

لەمساڵدا لەپارێزگای هەڵەبجە بوژانەوەیەکی تارادەیەکی باش دەدات بەژێرخانی ئابوری پارێزگای هەڵەبجە زۆرپێویستە لایەنی حکومی ناوچەکە زیاتر هانی وەبەرهێنان بدەن وتیشی "گرنگی کارگەکانی هەڵەبجە لەوەدایە کە کارگەی کشتوکاڵی‌و چنین‌و رستنەکە مادەکانیان زۆر بەئاسانی لەسنورەکە دەست دەکەوێت پێویست بەوەناکات پارە بنێریتە دەرەوە ئەو پارەیە هەر بۆ ناوخۆ دەبێت کاتێك کارگەی دۆشاوی تەماتەکە پێویستی

نوێیە زۆر پێویستە کارگەی جۆراوجۆری تیابکرێتەوە تاوەکو بتوانین ئابوریەکی بەهێز بۆ پارێزگاکە دەستەبەربکەین بۆ ئەو مەبەستەش لەگەڵ هەمو وەزارەتەکان قسەکراوە تاوەکو بەهەموان هانی زیاتری وەبەرهێنەران بدەین بێن‌و لەهەڵەبجە وەبەرهێنان ئەنجام بدەن".

بونی هەڵەبجە وەکو ناوەندێکی گرنگ بۆ کشتوکاڵ‌و ئاودێری، هەڵەبجەی کردوەتە ناوەندی بەرهەمهێنانی بەرهەمی خۆماڵی، بۆیە ئابوریناسان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کردنەوەی کارگەکان هانی زیادبونی بەرهەمی خۆماڵی دەدات.

بێستون محەمەد ئابوریناس بۆئاوێنە باوەری وایە سەرکەوتنی هەمو وڵاتێك بەستراوەتەوە بەئابوریەکەیەوە، کردنەوەی ئەو سێ کارگەیەش

کارگەی هەنارەکەش بەهەمان شێوە، هەرجی کارگەی چنین‌و رستنەکەیە بەهەمان شێوەی هەردو کارگەی سنورەکە لەروی بەخێوکردنی ئاژەڵی مەڕو ماڵات دەوڵەمەندەو دەتوانرێت سود لە خوری ئەو ئاژەڵانە بۆ کارگەکە وەربگیرێت".

هەڵەبجە هاوسنورە لەگەڵ وڵاتی ئێران‌و زۆرێك لەو کارگەو پێداویستیانەی کە پێویستیان بێت لەوڵاتی ئێرانەوە هاوردەدەکرێت کە ئەویش جارێکی تر برە پارەیەکی کەمتری تێدەچێت بۆ سەرمایەدارەکان تاوەکو کارگەکان هاوردەی پارێزگای هەڵەبجەی بکەن.

-ئاوێنە نیوز

لەفەیسبوکەوە

دەلیل جەمال

## برایی نەوتی یان برایی خوێنی؟

هیچ شتێك دادی چارسەری ریشەی قەیرانەکان نادات نەگەرانەوە بۆبەغدا نە رێککەوتنی لابەلاو ژێربەژێر نە شەریکەبەش وشەریکە دز نە خزمایەتی وشارچییەتی نە درووشم وپلانی بێ بنەما.....ئەوەی چارسەرە گەل خۆی بریاری راست ودروست بدات ،تازە پێم وانییە بەم هێزوسیاسی و دەسەڵات دارانەی ئەمرۆ کە لەبری (خوێن) نەوت بەدەمارەکانییان دەروات ئێستا ئەمانەبوونەتە برای نەوتی تێکەل بوون بوونەتە برا ئامۆزا خالۆخالۆزا برائ نەوتین دەبێت لەرگەوە چارسەربکرێت دەبێت هەرچی نەوتی دەمارییانە دەربهێنرێت ئەمانە نەسییاسەت نەئایدۆلۆژیاونە فکرنایانبەستێتەوە ئەوەیدەیان بەستێتەوە نەوت و تاڵانی گەندەڵییە

**ئەم دەسەڵاتدارانە نەسیاسەت، نەئایدۆلۆژیا،نە فکرنایانبەستێتەوە ئەوەی دەیانبەستێتەوە نەوت و تاڵانی گەندەڵییە**

# پێویستە خێزانەکان لەپێش مامۆستایانەوە داوای مافی مامۆستا بکەن

## کەسوکاری خوێندکاران نازانن پشتیوانی لەبایکۆتی مامۆستا بکەن یان لەدەستپێکردنەوەی خوێندن

کەسوکاری خوێندکاران جگە لەنیگەرانییان تائێستا بەفەرمی هەڵوێستیان نازانرێت لەبارەی بەردەوامی بایکۆتکردنی ناوەندەکانی خوێندنو کردنەوەی دەرگای قوتابخانەکان، توێژەرێکی کۆمەڵایەتیش دەڵێت "بەشێك لەخێزانەکان نائومێدبون لەوەی کە هەر هەنگاوێکی مەدەنیانە ناتوانێت حکومەتو دەسەلات ناچار بەباشکردنی بارودۆخی مامۆستا بکات".

ئا: سروە جەمال

لەگەڵ ئەوەی خێزان پێگەیەکی گرنگی هەیە لەکۆمەڵگادا، بەلام ماوەی ٥٢ رۆژە دەرگای قوتابخانەکان نەکراونەتەوەو سەرەرای نیگەرانیەکانیان نازانرێت خێزانەکان پشتگیری بایکۆتکردنی ناوەندەکانی خوێندن دەکەن یان دەیانەوێت منداڵەکانیان بچنەوە قوتابخانە.

لەنجە کە هەمیشە بەپەرۆشەوە دەیەوێت هەواڵی کردنەوەی دەرگای قوتابخانەکان یان بەردەوامی بایکۆت بزانێت وتی "تێنەگەم مامۆستا چ دۆخێکی هەیە، ژیانو گوزەران ئاوا نابێت، بەلام ئەوە ناخۆشە کە نازانم خوێندنی ئەمساڵی منداڵەکانم چی لێدێت؟!"

ئەو کە دایکی سێ خوێندکارە بەنیگەرانیەوە وتیشی "من نازانم پێویستە چیبکەم هەم مامۆستا مافی خۆیەتیو هەمیش منداڵەکانم مافی خۆیانە بخوێنن".

لەتیف حوسێن کە توێژەری دەرونیە لەبارەی رۆڵی خێزانەکان لەم دۆخەی ئێستادا دەڵێت "بارودۆخی هەرێمی کوردستان لەروی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابورییەوە بەجۆرێك تێکچوە رۆڵی چینوتوێژەکانی کۆمەڵگا هەرچییەك بێت لاواز دەردەکەوێت. چونکە ئەوەی لەم بارودۆخانەدا زیاتر رۆڵی دیارو بەرچاوە حزبە سیاسیەکانە، ئەوەی پەیوەندی بەرۆڵی دایکانو باوکانەوە هەبێت لەپشتگیریکردنی مامۆستاو نیگەرانییان لەداخستنی دەرگای قوتابخانەکان، بەشێکیان بەتەواوی لەگەڵ هەرهەنگاوێکی مامۆستایاندان کە بەئاراستەی کردنەوەی دەرگاکانی قوتابخانە بێت، بەشێکی تریشی دەگەرێتەوە بۆ ئەو نائومێدیەی کە لەناو بەشێکی زۆری مامۆستایانیش خۆیاندا بونی هەیە، بەوەی کە هەر هەنگاوێکی مەدەنیانە ناتوانێت حکومەتو دەسەلات ناچار بەباشکردنی بارودۆخی مامۆستا بکات لەبەرامبەر کردنەوەی دەرگای قوتابخانەکان".

بێستون حەمە جەزا، ئەندامی ئەنجومەنی راگەیاندنی مامۆستایانی نارازی لەبارەی رۆلی خێزانەکانەوە دەڵێت "رۆڵیان خراپ نیە وەك ئەوەی لە دژمان نەچونەتە سەر شەقام پشتگیریشیان نەکردوین، بەلام لەچوارچێوەی مافی منداڵەکانی خۆیان رۆڵێکی خراپیان بینیوە چونکە ئەبوایە ئەوان پێش ئێمە لەسەر شەقام بونایە راستە حکومەت قەیرانێکی دروستکردوە لەدرێژەی ئەو هەمو قەیرانانەی کە هەیە، قەیرانی بایکۆتی خوێندن بوە بەقەیرانێکی هاوبەش لەنێوان مامۆستاو کەسوکاری خوێندکار، ئەوان نەیانتوانیوە ئەو رۆڵە ببینن پێش مامۆستا بێنە سەرشەقام داوای مافی مامۆستا بکەن لەپێناو مافی خوێندکارەکەی".

هەماهەنگیو پشتگیرییەی دایکانو باوکان بۆ مامۆستای منداڵەکانیان هەستی پێناکرێت".

لەتیف حوسێن هاوکات لەرێکخراوی تاکۆیە بۆپرسە کۆمەڵایەتیو دەرونیەکان بەپێویستی دەزانێت کە " بۆئەوەی پرۆسەیەکی تەندروستمان هەبێت لەبواری پەروەردەو فێرکردندا پێویستە دایکانو باوکانو تەواوی کۆمەڵگا پشتگیری داواو داخوازی مامۆستابن، رێگاکانی فشار لەسەر دەسەلات زیاتر بکەن بۆئەوەی ئاور لەژیانو گوزەرانی خەڵکی بداتەوە، بیریشمان نەچێت سیستمی ئەم ولاتە وایکردوە هەمو موچەخۆر بینو ژیانو کاری هەمو سێکتەرەکان وابەستەی یەکترییە و کاریگەری لەسەر یەکێك لەو سێکتەرانە کاریگەری لەسەر کۆی ژیانی خەڵکی دەبێت لەکوردستاندا".



لەوبارەیەوە عەزیز ئالانی، نوسەرو توێژەر دەڵێت "لەباری نائاساییو لەکاتی قەیرانەکانو جەنگدا ئەرکەکانی خێزان گرنگتر ئەبێت، خەڵك کە لەبارودۆخێکی ناهەمواردا دەژین دەسەلاتی سیاسیش کەمترین مافی هاولاتیانی دەستەبەرنەکردوە، بۆیە کاتێك یەکێك لەو ناوەندە گرنگانە کەموکوری هەبێت ئەوە کێشەیە، ئێستا خێزانو کۆمەڵگاش هەردو لەقەیراندان کە دواجار ئەوەش پۆتە دابەزینی ئاستی زانستی منداڵو پێگەی خوێندن لەقوتابخانەو زانکۆو پەیمانگاکان".

لەلایەن بەشێك لەچاودێرانی بواری پەروەردەو نوسەرانەوە باس لەپەیوەندی کلاسیکی نێوان خێزانەکانو قوتابخانەکان دەکرێتو تائێستا بە فەرمی هەڵوێستی خێزانی خوێندکارەکان نازانرێت، لەوبارەیەوە لەتیف حوسێن دەڵێت "لەئێستاو رابردوش بەهۆی سیستەمی پەروەردەو ئەو بارودۆخەی کۆمەڵگای ئێمە تێدا گوزەری کردوە، ئەو هەماهەنگییە نابینرێت لەنێوان خێزانو قوتابخانەدا کە ببێتەهۆی بەرەوپێشچونی پەروەردە، لەبارودۆخێك کە بەشی زۆری خەڵك نائومێدە لەوەلامو هەنگاوی دەسەلات بەرامبەر داواکانی، هەربۆیە ئەو

ئەو ئەندامەی لیژنەی راگەیاندنی مامۆستایان ئاماژەی بۆ ئەوەکرد کە "بەداخەوە هەر لەدایكو باوکی خۆمانەوەو خەڵکانی تریش هەبوە تاخوێندنی تەواوکردوە نەیزانیوە لەئەدەبیە یان زانستیەو پۆلی چەندە؟ ئەوە واقیعە، هۆشیاری خێزانەکان لەئاستی ئەوەدانیە کە هەست بەوە نەکەن، قەیرانی بایکۆتی پەروەردە هەموی هەڵواسراوە بەشانی مامۆستا، نازانن داوای مافی خۆی ئەکات کە ئەمەش بۆتەهۆی پێشێلکردنی مافی خوێندکارو ئەبوایە ئێمە وەك پایتەختی رۆشنبیری کە کەسوکاری خوێندکاران بەشێکیان دکتۆرو ئەندازیارو چینی رۆشنبیرن بۆیە سەد خێزان بهاتایەتە سەر شەقامو بیوتایە ئێمە وەك کەسوکاری خوێندکارەکان گلەییمان لەمامۆستا نیە ئەرکیان راپەراندوە کاتێك مافەکانی پێدراوە، بەلام ئێستا کە بێ مافەو بێ حورمەتی پێکراوە گەر بایکۆتەکەی لەپێناوی پارەشدا نەبێت لەپێناوی ئەوەدایە سبەی لەروی بێت بچێتەوە ناو هۆلەکانی خوێندن کە دەیان کۆمێنت دەبینرێت سوکایەتی بەمامۆستا دەکەنو دەڵێن کە چوینەوە ناو پۆل وادەڵێین، بۆیە بەشێکی شەرەکەمان لەپێناوی گەراندنەوەی شکۆو حورمەتە بۆ مامۆستاو .

# گرێدانەوەی خۆپیشاندان بەخیانەت

حەسەن مستەفا

ئەوەی چەند رۆژە لەشەقامەکانی شاری سلێمانی (پایتەختی رۆشنبیری)و هەڵەبجەو شارۆچکەکانی دیکە دەگوزەرێت، لەخۆپیشاندانو بلندکردنی دەنگی نارەزایی لەلایەن مامۆستاو فەرمانبەران هەر ئەوەیشە لەشەقامی شارو پایتەختی ولاتە پێشکەوتووەکانەوە دەیبینینو دەکرێت، بەلام لەوێ گوێیەك هەیە دەنگەکان دەبیستێو دەستێك هەیە خەمەکانی ئاوێزانی خەمەکانیان دەکات، کەچی لێرە بەپێچەوانەوە، سەرەرای راگرتنی تەواوی پرانسیپەکانی خۆپیشاندانی مەدەنییانەو دوور لەهەر هەرەشەو گورەشەو هەڵکوتانەسەر دەزگا حکومیو حزبییەکان، هێمنانە لەشوێنێکی دەستنیشانکراو رێپێوان بەشێوەیەکی زۆر بەرپرسانە بەرێوەدەچێو داواکارییەکانیش هیچیان لەسەرووی داواکاریی ناواقیعیدانین، بەڵکو جەختکردنەوەو بیرهێنانەوەن بۆ دەسەلاتی کوردی کەئەوەی دەرهەق بەتوێژی مامۆستایانو فەرمانبەران دەکرێ ناهەقییەو داوای گێرانەوەی هەقە.

ئەم جۆرە رێپێوانانەمان پێشووتر لەولاتان بینیون، بەلام لەبری ئەوەی وەزیری پەیوەست یان سەرۆك وەزیران بێمنەتی نیشانبدەن، تا لەتوانایاندا بوەبێت بەپیر داخوازییەکانەوە رۆیشتوونو ئەوەی نەشکراوەو لەدەسەلاتیاندا بووەو جێبەجێنەکراوە دەستیان لەکار هەڵگرتووە.

# هەیە لەم نیشتمانە دەژێ لە ڤێلاکانییدا ٨٠ ژووری نوستنی هەیە!! کەچی هەر لەسەر ئەم خاکەی ناوی هەرێمی کوردستانە هاونیشتمانی هەن بەگەرمای پوشپەرو سەرمای رێبەندان لەژێر نایلۆن دەیگوزەرێنن

ەوەی زۆر جێی نیگەرانییە، ئەوەیە زۆربەی سەرچاوە بۆ بەدەستهێنانو کەڵەکەکردنی سەرمایەی دارایی ناوچەکە لێرە هەڵدەقولێ، کەچی بێدارایترین تاکەکانی ئەوانەن لێرە چاو دەبرنە خۆشییەکانی دەرەوە. بەدەر لەو رێژە سەرمایەدارە گەورانەی لێرە بوونیان هەیەو سەرمایەکانیان لەماوەی زێرینی راپەرینەوە تا ئێستا کەڵەکەکردووە...!!

دەزانم هەیە لەم نیشتمانە دەژێ لە ڤێلاکانییدا ٨٠ ژووری نوستنی هەیە!! کەچی هەر لەسەر ئەم خاکەی ناوی هەرێمی کوردستانە هاونیشتمانی هەن بەگەرمای پوشپەرو سەرمای رێبەندان لەژێر نایلۆن دەیگوزەرێنن... نامەوێت زۆر بکەومە بەراوردکاریی چونکە تا زیاتر برۆم خەرەندەکە بەرینتردەبێو هیچ پردێك ناتوانێ بەیەکەوەیان بگەیەنێت. کەواتە ئەو دەنگانەی ئەمرۆ لەشەقام بلند دەبنەوە، سەرچاوەیان لەم نادادپەروەرییە وەرگرتووە.

لەیەکەم رۆژی راپەرینەوە تا ئەمرۆ گەورەترین پرسیار بۆ من ئەوەبووە، ئەوەی لەدوای بەعس کۆماندەکاتەوە تۆبلێی شێوە ژیانێکی عادیلانەو یەکسان بێ، کە ئەمجارە وەك هاولاتییەکی ئاسایی ژیان بکەین، کەچی ئەفسووس، دوای راپەرین... زۆرینەمان لەگەڵ هەمان جۆری ژیان بەریەککەوتینەوە، بەجیاوازیی ئەوەی ئەمجارە لەژێر ناونیشانی دیکەی نیشتمانپەروەرییو پێفرۆشتنی دروشمی کوردایەتی روبەروبووینەوە !!..بەداخەوە بەم دروشمانە زۆربەمان کەوتینەوە ژێر باری چاوبەستنو چەوسانەوەو گیرفانێکی خاڵیو دڵێکی پر قەهر. کەچی هاوارێکی پر لەئازاریش رەوا نابینو ناتوانن گرێی نەدەنەوە بەخیانەت لەنیشتمان!.

خەندان

هەڵەبجە نیوز
لەهەڵەبجەدەردەچێت
ساڵی یەکەم ژمارە(١٠)یەکشەممە ٢٠ی١١ی٢٠١٦
موبایل:٠٧٥٠٨٣٥٤٦٠٦
فەیسبوک:هەڵەبجەنیوزحلبجە نیوز



تا ئێستا میوانی ئەوەندە بێ شەرمی
،وەکودڵتەنگی وخەفەتم نەدیوە
بە زۆریش دەریان بکەیت هەر ناڕۆن

نێلسۆن ماندێلا

## سالار مەحموود



شەقام
لێگەڕێن، با
شەقاٌم هەر خۆی قسە
بکات
با، تەنها خۆی، هەر
تەنها خۆی
هاوار بکا
لێگەڕێن، با
بە تەنٌها خۆی بقیژێنێ
و
کۆشکی ستەم وێران
بکا

..........

شەقام بە تەنهایی
جوانە
لێیگەڕێن با
هێندەیتر جوان و
زەریف بێ
ژانی ژیان گرتوویەتی
لێگەڕێن با
هەر بۆخۆی، مامانی
خۆی بێ




## ئۆباماو مناڵە سورییەکە

باراک ئۆبامای سەرۆکی ئەمریکا، چاوی بە ئەلێکس و خێزانەکەی کەوت لە کۆشکی سپی کەماڵەکەی خۆی پێشکەش بە منداڵێکی ئاوارەی سوریاکرد، ئەو منداڵەش «عەمران دەقنیش» بوو کە لەبۆردومانێکی فرۆکە جەنگیەکاندا لەشاری حەلەب لەژێر داروپەردووی ماڵەکەیاندا رزگارکرا.
لەنامەیەکدا بۆ ئۆباما ئەلێکس نووسیبووی «بەرێز سەرۆک ئۆباما ئەو منداڵەت لەبیرە کە بە ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن بۆ نەخۆشخانەیان گواستەوە لەسوریا؟ هەروەها نووسیبووی «تکایە دەتوانیت دەستیبگریت و بیهێنێت بۆ ماڵەکەی ئێمە؟

لەکاتی پێشوازیکردنەکەدا پاش هەواڵپرسین ئۆباما وتی «نامەکەتم زۆر بەدل بوو هەموویم بۆ هەموان خوێندەوە و گوێبیستی نامەکەشت بوون، ئۆباما وتیشی «تۆ زۆر باش و بەخشندەبوویت، خۆشبەختانە ئەوەش وایکرد کە خەلک بەهەمان شێوە بیربکەنەوە و هاوسۆزی دەرببرن بۆ کۆچبەران، بۆیە من شانازیت پێوەدەکەم و زۆر بەخێرهاتیت .

پێشتر لەکۆبوونەوەی باڵای سەرکردەکاندا کە لەپەراوێزی کۆبوونەوەی ئاسایشی نێودەوڵەتی لە٢٠ی مانگی ئەیلول لەنیویۆرک ئەنجامدرا بۆ کۆکردنەوەی کۆمەک بە کۆچبەران، ئۆباما نامەکەی ئەلێکسی خوێندەوەو وتی ئەوە هەست و وشەی منداڵێکی تەمەن شەش ساڵە.

## لەبەرتۆ دڵم نایە بمرم

شیعری ئیبراهیم هەورامانی

( ١ )
لەبەر تۆ نەبوایە ،
لەم شارە
دور دەکەوتمەوە
دوور.....
دوور......
لە شوێنێکی ئەو جێ دورانە.
بێئەوەی
کەس بزانێ دەمرم .
لەبەرتۆ
دڵم نایە.



( ٢ )
تۆ هەستت کردوە
هەر چوار وەرزی ساڵ
پاییز
زستان
هاویین
بەهار .
لەیەک دە چوون .
گەر دڵی تۆ نەبا لە سینەمدا .
( ٣ )
ژیان چەند تامێکی شیرینی دەبێ
بەرلە خواردنی بەرچایی
تۆ بلی ی
بەیانیت باش .
( ٤ )
لە وێنەکە دا دەمبینی ،
چۆن ...؟
بە دیارشکانی دڵێکە وە
حەرفەکانی ووتنم ،
بیر چۆتەوە ؟
دەتەوێ ...
لە دڵشکان تێبگەی
کەمێک زیاتر
لە وێنەکەم بڕوانە ؟
( ٥ )
هێندە درەنگ کەوتی ،
ووتم :
لەوە دەچێ
کەمێ تر
کۆتایی ژیان بێ ؟
( ٦ )
بە بیرم نایە ،
لە کەیەوە تۆم خۆش دەوێ .
ئەوەندە دەزانم
لەگەڵ گەورە بوونی تۆدا
دڵی منیش ،
گەورە دەبێ .
تا جێگەی تۆی تێدا بێتەوە
هیچی تر .
( ٧ )
وێنکەت لە دڵ دەگرم
تا لە چاوی بەد ،
بەدوور بیت .

## تکایەکی گرنگ بۆ ئەوانەی دەفامن

بەرێزم! بەڵێ تۆ، ئا ئا لەگەڵ تۆمە، باش لێم رامێنە و سەرنجم بدە، قەیدی نییە و من هیچ پێی کەم ناکەم، تەماشایەکی من بکە و سەرت بکەرەوە بە قاوغی رزیو و داتەپیوی خۆتدا، نەکا بەرگەی هەلگرتنی سەرت نەگریت، نەکا چاوەکانت لە تەریقیدا بکەونە خوارەوە و بکەونە بەر پێیپەکانت و نوکە پێیپەکیان تێ هەلدەی.
بەرێزم! دەزانی کە من هیچ شەرم نامگرێ و تەریق نابمەوە لەم حاڵەی کە تێیدا دەژیم، چونکە دەزانم هیچ دەست و خەتایەکی خۆمی تێدا نییە کە ئەمە حال و گوزەرانمە، دەزانم کە چەنێك رەنجم داوە تا بەم حاڵە بێ حاڵەشەوە دەژیم.
دەزانم کە بەهۆی نەفسی نزم و لوتی بەرز و دلی رەق و ویژدانی مردووی چەندین گەندەل و هەوەس بازو نەفس پەرست و دوور لە خوا و دژ بە دین و بازرگانی مایە پوچەوە، من کەوتوومەتە ئەم حال و گوزەرانەوە.
بەرێزم! بەو شێوەیە تەماشام مەکە، چۆن رووت دێ سەر بەز بکەیتەوە، لەکاتێکدا کە ویژدانت لێ کەوتووە و ئەخلاق و ئینسانییەت لەو گەرەکەی دیکە لێ بەجێ ماوە و دەرگای دلت بە قوفلێکی ژەنگگرتوو کلۆم دراوە.... سەیرم مەکە و باش بزانە هیچم لە تۆ و هاوشێوەکانت ناوێ... تەنها تکایەکم لە تۆ و ئەوانی دیکەش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە:
(بەزەییتان بە مندا نەیەتەوە کە لەم حال و گوزەرانەدا دەژیم، بەزەییتان بە خۆتاندا بێتەوە کە من بەم شێوەیە دەژیم و ئێوەش بەو چەشنەی کە هەر خۆتان دەزانن...)
من ئەگەرچی شتە هەبووەکانی ئێوەم نییە، بەلام باش بزانن شتانێکم هەیە، کە ئێوە حەسرەتیان بۆ دەخۆن (دل، ویژدان، ئیمان، ئەخلاق، ئینسانییەت، کەرامەت، شعورو ئیحساس، پاکی و بەرائەت وهتد...) کە بە هەموو سەرمایە و هەبووەکانی ئێوە، ناتوانن تۆزقالێك لەم سەرمایانەی من بکرن...
بمبوورن کە پێم وتن (بەرێزم!) برۆن و بەزەییتان بە خۆختاندا بێتەوە کە چەنێك رووت و رەجاڵ و بێ حالن.

مودریك عەلی عارف

## قائیمقام:لەهەوڵی بەردەوامداین بۆ بەفەرمی کردنی مەرزی (شۆشمێ - تەوێڵە)


# هەڵەبجە نیوز
Halabja News

بایەخ بە کاروباری پارێزگای هەڵەبجە دەدات
ژمارە(١١)
کانونی یەکەمی ٢٠١٦
خاوەن ئیمتیازوسەرنوسەر
سەلاح سەعید ئەمین


# پــەروەردە لــەلــێواری هــەرەســدایــە

## ٢١ بەرکەوتوی چەکی کیمیایی گەڕانەوە

سبەی

دواێ وەرگرتنی چارەسەر، (٢١) هاوڵاتی بەرکەوتوی چەکی کیمیایی هەلەبجە، گەرانەوە هەرێمی کوردستان و (١٥) بریندارى دیکەش هێشتا نەگەڕاونەتەوە و پێویستیان بە ئەنجامدانی نەشتەرگەری هەیە. لە ماوەی رابردودا بەرێوەبەرایەتی گشتی شەهیدان و ئەنفالکراوانی هەرێمی کوردستان، (٣٦) هاولاتی بەرکەوتوی چەکی کیمیایی هەلەبجەی بەمەبەستی وەرگرتنی چارەسەر رەوانەی ئێران کرد، ئەمرۆش ژمارەیەک لەو هاوڵاتیانە لەمەرزی نێودەولەتی باشماخی قەزای پێنجوێنەوە گەرانەوە هەرێمی کوردستان. شادی غازی، نوێنەری بەرێوەبەرایەتی شەهیدان و ئەنفالکراوان لە هەلەبجە، لەوبارەیەوە رایگەیاند؛ ئەو (٢١) بریندارەی گەڕاونەتەوە چارەسەریان وەرگرتوە، بەڵام هێشتا (١٥) بریندارى دیکە نەگەراونەتەوە و پێویستیان بە ئەنجامدانی نەشتەرگەریە، بۆیە ئەوان لە وڵاتی ئێران ماونەتەوە».


وەرگیراوە

## بایکۆتی مامۆستایان بەردەوامیهەیە

چالاکانی بایکۆت وخۆپیشاندانەکانی مامۆستایان و فەرمانبەران لەتۆرەکۆمەلایەتیەکان جەخت لەبەردەوامی بایکۆت دەکەنەوەتاجێبەجێکردنی داواکارییەکانیان،بەرێوەبەری پەروەردەی هەلەبجە بەوەکالەت بەنوسراوێک داوای وەرگرتنی غیابی ئاراستەی بەرێوەبەرەکان کردوە

## کەناڵێکی تەلەفزیۆنی ناخۆی دەکرێتەوە

رۆژی ١٧ی١١ی٢٠١٦ کەناڵی هەلەبجە،وەک کەناڵێکی بینراوی ناوپارێزگای هەڵەبجە کرایەوەبەپێی زانیارییەکان ،ئەوکەناڵە وەک یەکەم کەنالی فەرمی ناوهەلەبجە خۆیناساندوەو بەرێوەبەرانی هیواخوازن لەرێگەی ئەم کەناڵەوە بتوانین خزمەتێک بە پارێزگای هەڵەبجە و شارەزوور و هەورامان بکەن و بۆشاییەک لە راگەیاندنی بینراو پربکەنەوە ..

## جوتیارە زیان لێکەوتوەکان قەرەبوو دەکرێنەوە

کوردیو ـ هەڵەبجە ـ حەیدەر حەمە صالح جێگری پارێزگای هەڵەبجە رایدەگەیەنێت تەوای ئەو جوتیارانەی بەهۆی گەران بەدوای نەوتدا لە رێگەی کۆمپانیای گاز پرۆمی روسیەوە زیانیان بەرکەوتوە قەرەبووی مادی کراونەتەوە .
کاوە شێخ عەلی جێگری پارێزگاری هەڵەبجە بۆ کارو باری هونەری لە لێدوانێکیدا بۆ کوردیو رایگەیاند : لیژنەی گەران بە دوای نەوت دا لەماوەی مانگی هەشتی رابردودا سەرجەم کارەکانیان تەواو کردوە و بەپێی ئەو رێکەوتنەی لەگەڵ وەزارەتی سامانەشروشتیەکانی حکومەتی هەرێم هەیە پێویستە ئەو کۆمپانیا کە بە شوێن نەوت دا دەگەرێت کە کۆمپانیایی گاز پرۆمی روسیە قەرەبوی سەرجەم ئەو زەویانەبکاتەوە کە چێنرابن یان لەکاتی بەروبومدابن ئەگەر زیانی لێکەوتبێ کە لەلایەن لیژنە فەرعیەکانەوە کە لەناحیەکانی سنورەکەماندا هەیەکە پێنج ناحیەیەو چواریان لای ئێمەیە .
راشیگەیاند : ئەوان بە پێی دۆنم و مەتر چوارگۆشەیە و ئەو زیانانە قەرەبوو دەکەنەوە ئەمەش لە ناحیەیەکەوە بۆ ناحیەیەکی تر دەگۆرێت تا ئێستا سەرجەم ئەو هاولاتیانە قەرەبوو کراونەتەوە کە زیانیان بەرکەوتوە لەکاتی گەران بەدوای نەوتدا لەسنورەکەدا یان راپرۆتەکانیان گەشتۆتە وەزارەتی سامانە سروشتیەکان کە چەند جوتیارێکن و ژمارەیان چوار کەسەلەماوەیەکی نزیدا ئەوانیش ئەو قەرەبوە وەریدەگرن هەموو جوتیارەکانی تر وەریان گرتوە قەرەبوەکەش مادەیە واتە پارەیە و بەپێی جۆری بابەتە چێنراوەکەیە و روبەرەکەی لیژنەکە هەلسەنگاندنی بۆ دەکات .
ماوەی چەند ساڵێکە کۆمپانیایی گاز برۆمی روسیی لە سنوری پارێزگای هەڵەبجەدا سەرقالی گەرانە بەدوای نەوتدا و تا ئێستەش بە شێوەیەکی فەرمی رانەگەیەنراوە کە ئایا بوونی نەوت لە سنورەکەدا لە چ ئاستێکدایەو کەی دەست بە بەرهەم هێنان دەکەن .

## یادی لەدایکبونی پێغەمبەر(د.خ)دەکرێتەوە

بریارەدوای‌نیوەرۆی‌یەکشەمە١١ی١٢ی٢٠١٦ لەپاریگای شاهۆحەمەفەرەج،بەرێەبەرایەتی گشتی ئەوقافی هەڵەبجە و دەستەی زانایانی پاریزگای هەڵەبجە ئاهەنگێک بۆ یادی لەدایکبونی موحەمەد پێغەمبەر(د.خ)سازبکەن

# ژنانی هەڵەبجە بە گرنگیەوە باسی هۆکارەکانی کەمی توندوتیژی دەکەن

ڕۆژنیوز – هاوکار و جیهاد
بەراورد بە شاروشارۆچکەکانی دیکەی هەرێم، حاڵەتەکانی ئەنجامدانی توندوتیژی دژ بە ژنان لەپارێزگای هەڵەبجە کەمترین ڕێژەیان تۆمارکردووە، چالاکوانانی هەڵەبجەش بەگرنگی دەزانن ڕێکخراوەکانی ژنان لە شارەکانی دیکەوە لەگەڵ چالاکوانانی هەڵەبجەدا گفتوگۆ بکەن بۆ کەمکردنەوەی توندوتیژییەکانی سەر ژنان لە تەواوی هەرێمدا.

بەگوێرەی ئامارەکانی نوسینگەی مافی مرۆڤی هەڵەبجە، لە ماوەی ١١ مانگی ڕابردودا لە سنوری پارێزگای هەڵەبجە تەنها ٤١ حاڵەتی توندوتیژی دژ بە ژنان تۆمارکراون، لەکاتێکدا لەساڵی ڕابردودا ٦٥ حاڵەت تۆمارکرابوون، ئەوەش بە بەراورد بەشارەکانی دیکەی هەرێم ڕێژەیەکی کەمترە.

لەوبارەیەوە، فێنك کەیخەسرەو چالاکوانی کۆمەڵگای مەدەنی، بە ڕۆژنیوزی وت:»هۆکاری کەمی ئەنجامدانی توندوتیژی دژ بەژنان چەند هۆکارێکی خۆی هەیە، کە هەندێکیان پەیوەندییان بەلایەنی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری ژنان خۆیانەوە هەیە، هەروەها ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیش هۆکارێکی باش بوون بۆ ئەوەی هەردوو لایەنی ژن و پیاو هۆشیار بکەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هۆشیاری خودی ژنانی هەڵەبجە لەکایە جیاوازەکاندا هۆکارێکی دیکەیە، چونکە سەردەمانێك ژن لەهەڵەبجە قایمقام بووە لەشارەکانی ترکارێکی ڕێگەپێنەدراو بووە».

وتیشی: نابێت لەم نێوەندەدا هۆشیاری پیاوانی سنورەکەش نادیدە بگرین، چونکە ئەوانیش ڕۆڵێکی سەرەکییان هەیە بۆ ڕەخساندنی ئەم دۆخە، چونکە زۆربەی ئەو توندوتیژیانەی کە بەرامبەر بەژنان دەکرێت لەشارو شارۆچکەکانی هەرێم لەلایەن پیاوانەوەیە، بۆیە زۆر گرنگە لەشارەکانی دیکەش هەما ڕۆشنبیری لەئاست مافەکانی ژنان پەیرەوبکرێت.

ئەو چالاکوانەی کۆمەڵگای مەدەنی، ئەوەشی وت: ئەرکی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و خودی ژنانە کە بتوانن لەڕێگەی ئەنجامدانی سیمینارو کۆڕو کۆبونەوەی تایبەتەوە لەشارەکانی دیکەش، باس لەم جۆرە هەڵسوکەوتە بکرێت کە لەناوچەکەدا پەیرەو دەکرێت، بۆئەوەی کەمترین حاڵەتی توندوتیی دژ بەژنان تۆمار بکرێت.

لەسەر هەمان پرس، دڵسۆز محەمەد، وەك یەکێك لە ژنانی هەڵەبجە بۆ ڕۆژنیوز دواو وتی: بەهۆی ئەوەی کە هەڵسوکەوتی پیاوان لەگەڵ ژناندا لەسەر بنەمای لێکتێگەیشتن و لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی هەردولا بونیادنراوە، لەگەڵ ئەوەشدا پیاوانی هەڵەبجە ئازادییەکی زیاتریان داوە بە ژنان، هاوکات ژنانیش ئەو ئازادییەیان لە سنوری بەرژەوەندی هەردوولادا بەکار هێناوە و بۆکاری دیکە بەکاریان نەهێناوە، ئەوەش وایکردووە هۆکارێکی کاریگەرو باشبێت بۆ ئەوەی ڕێژەی توندوتیژی دژ بەژنان لەم سنورەدا بەکەمی تۆمار بکرێت.

وتیشی: ڕۆشنبیری تاکەکان لەبارەی هەڵسوکەوتییان بەرامبەر بەژنان بوەتە هۆی ئەوەی کە کاریگەری ئەرێنی بکەنە سەر کۆمەڵگا، دواجار ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیش سودییان لەو ڕۆشنبیرییە بینیوە بۆ ئەوەی کە لەناو کۆمەڵگا بەرجەستەی بکەن، لێرەدا بە بڕوای من پێویستە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدنی شارو شارۆچکەکانی دیکە لە نزیکەوە لەگەڵ ژنان و پیاوانی هەڵەبجە و ڕێکخراوەکاندا گفتوگۆکانیان لەبارەی چۆنیەتی هەڵسوکەوتی پیاوان و ژنان بەیەکەوە بخەنە بەرباس، بۆئەوەی پێکەوە بتوانن سود لە ڕاوبۆچونەکانی یەکتر وەربگرن کۆمەڵگایەکی دور لە توندوتیژی فەراهەم بهێنن بۆ ژنان.

**بەراورد بە شاروشارۆچکەکانی دیکەی هەرێم، حاڵەتەکانی ئەنجامدانی توندوتیژی دژ بە ژنان لەپارێزگای هەڵەبجە کەمترین ڕێژەیان تۆمارکردووە.**

# دژی دەستگیرکردنی مامۆستایان گردبونەوەیەك لە هەڵەبجە بەڕێوەچوو

ئا: جیهاد هەورامی

دژی دەستگیرکردنی مامۆستایانی نارازی سلێمانی، مامۆستایانی هەڵەبجە گردبونەوەیەکی نارەزایەتیان ئەنجامدا و ئیدانەی ئەو کارەیان کرد و لەبەیاننامەیەکیشدا دوپاتیان کردەوە کە بەردەوام دەبن لەسەر مانەوەیان لەسەر شەقام بۆبەدەستهێنانی داواکاریەکانیان.

لە بەردەم بانکی کۆنی هەڵەبجە و بەئامادەبونی ژمارەیەك لەمامۆستایانی نارازی وچالاکوانان، بەمەبەستی ئیدانەکردنی دەستگیرکرنی ژمارەیەك لە مامۆستا نارازیەکانی سلێمانی کەدوێنێ لەلایەن هێزە ئەمنیەکانەوە دەستگیرکران، گردبونەوەیەك ئەنجامدرا.

لەگردبونەوەکەدا بەیاننامەی مامۆستایانی نارازی لەلایەن محەمەد حەمەڕەزاوە خوێنرایەوەو ڕایگەیاند:»دوای تێپەڕبوونی ٢٥ ساڵ لەحوکمرانی دەسەڵاتی کوردی لە هەرێمی کوردستاندا، لە ئێستادا ڕووبەڕووی چەندین قەیرانی جۆراوجۆر و دەستکرد بوینەتەوە، بەتایبەت دواکەتن و پاشەکەوتکردنی مووچە کەماوەی دوو ساڵە موچەخۆرانی گیرۆدەکردوە و بۆ ئەم مەبەستەش لەڕێگای جۆراوجۆر و مەدەنیانەوە مامۆستایانو مووچەخۆران داوای مافی ڕەوای خۆیان دەکەن».

لەو بەیاننامەدا هاتبوو:»لەبەرامبەردا دەسەڵاتی کوردی زۆر بێباکانە دەڕوانێتە داواکاریەکان و ئامادەی چارەسەرکردنی کێشەکانی نیە».

محەمەد حەمەڕەزا کە بەیاننامەکەی دەخوێندەوە، وتیشی:»بەداخەوە سەرباری چارەسەرنەکردنی کێشەکان دەسەڵات لەڕێگەی هێزە ئەمنیەکانەوە هەستاوە بەسزادانی خۆپیشاندەران و کەسانی نارازی، بەجۆرێك لەڕێگەی سزای سیاسی و هەڕەشەی کوشتن و هەڵکوتانە سەر ماڵ و حاڵیان و سوتانی سەیارە و دواجاریش پەلاماردان و دەستگیرکردنیان، هەر بۆیە زۆر پەتوندی ئەم کردەوانەی دەسەلات شەرمەزار دەکەین و پێیان ڕادەگەیەنین کە ئێمە سورین لەسەر مانەوەمان لەسەر شەقام و داوای جێبەجێکردنی داواکاریەکانمان دەکەین و شەقام چۆڵ ناکەین، تا ئەو کاتەی سەرجەم داواکاریەکانمان بۆ جێبەجێ نەکەن».

لەدرێژەی خوێندنەوەی بەیاننامەکەدا ناوبراو وتی:»لەپای ئەو کردەوانەی دەسەلات پێیان ڕادەگەیەنین، کە دوو ڕێگەیان لەبەردەمە، یان ئەوەتا دەگەڕێنەوە ناو گەل و داواکاریەکانمان بۆ جێبەجێ دەکەن، یاخود چارەنوسیان لە دیکتاتۆرەکانی تری وەك سەدام و داارودەستەکەی باشتر نابێت، کە گەل ڕووبەڕووی بویەوەو ڕاپەڕینی ئەنجامدا تا دەسەڵاتی ڕژێمی بەعسی لەباشوری کوردستان ڕامالی».

**دەسەڵاتی کوردی زۆر بێباکانە دەڕوانێتە داواکاریەکان و ئامادەی چارەسەرکردنی کێشەکانی نیە**



## ساڵیادی وەفاتی مامۆستا مەلاصالحی گەورە

١٧-١١ ساڵیادی وە فاتی مامۆستا مە لاصالحی گە ورە یە یە کە م زانای ئیسلامی سیاسی و باوکی ڕابوونی ئیسلامیە لە کوردستاندا مامۆستا مەلاصالحی گەورە زانایەکی مەزن و پیاوێکی شۆڕشگێر و کەسایەتیەکی بەناوبانگ و قازییەکی دادوەرولیهاتو و زیرەك و دەریای زانست بو، لە کتیبی زانا بە ناوبانگە کانی عێراق (اعلام علماء کوردستان ) بە درێژی باسی کراوە و لە بزوتنە وەی ڕزگاریخوازی گەلی کورددا ڕۆلیکی زۆر گرنگی بینیوە و زۆربەی ڕۆژنامە کانی ئە وکاتە باسیان لە هەڵویست و جوامێری کردوە و بەهۆی ئەو خەبات و تیکۆشانەیشی زۆر جار توشی زیندان و دورخستنەوە و ئازار بوە و هەرگیز کۆڵی نەداوە، هێشتا دەستمان قەلەمی نەگرتبوو و نەچوبوینە قوتابخانە کە لە حوجرە جوان و دلگیرەکەی باوە گەورە لە مزگەوتی کانی غاشقانی هە لەبجە فیری قورئان و ئاداب و ڕەوشت و فتح القریب و سیرەی رسول الله بوین و بە پەروەردە یەکی ئیسلامی گۆشی کردین ئەوە ندە بە قسەی خۆش پیی دەوتین هەرحە زمان نەکرد تەواو نەبین، باوە گەورە پیاوێکی زۆر دە ست کراوە بوو هە موو بە یانیەك تورەکەی دەرئەهێنا و خەرجی ڕۆژانەی ئێمەی و مناڵانی هاورێمان و مناڵانی گەرە کی ئەدا، باوەگەورە باوکی زانایان و فەقێکان و خەلکی هەژار و لێقەوماوی ناوچەکە بوو هەمیشە دەرگاو دیوە خانی کراوە و والا بوو، سەرەنجام لە بەرەبەیانی ١٧-١١-١٩٩٠ لە شاری سنە دلە گەورەکەی لە لیدان کەوت و لە لایەن زانایانی ئەهلی سوننە مەراسیمێکی بی وێنەی بۆ سازکراو لەزۆربەی شارەکانی ئیران وەك سنە و کرماشان و مەهاباد و پاوە مەراسیمی ماتەوایی بۆ سازکرا و هەر لە شاری سنە بەخاك سپێردرا ،شایانی باسە مامۆستا مەلاصالح لەگەڵ مامۆستا مەلاعبدالعزیزی پریس هەردوکیان ڕۆڵێکی گرنگیان بینیوە لەگەیاندنی بانگەوازی ئیسلامی.

ئەکاونتی ڕێگا هەڵەبجەیی

## نوخشە ناسیح،قائیمقامی ناوەندی هەڵەبجە:
# لە هەوڵی بەردەوامداین بۆ بەفەرمی کردنی مەرزی (شۆشمێ - تەوێڵە)

وتوووێژ: هاودەنگ محەممەد
بەشێك لەودیدارەی کەرۆژنامەی جام کوردی لەگەڵ نوخشەناسیح،قائیماقمی ناوەندی هەڵەبجە سازیداوە:
هەڵەبجە ئەو شارەیە کە لە ئەزمونی خۆبەرێوەبەری کوردستانی عێراقدا وەك پێویست بوژانەوەی بە خۆیەوە نەبینیوە. ئەمە سەرەرای ئەوەی شارێکی مەرزییەو سنوورێکی فراوان و چەندین مەرزی فەرمی و نیمچە فەرمی هەیە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێراندا.
ئەوە بوو دواکات هەڵەبجە هەلی بە پارێزگابوونی بۆ هاتە پێشەوەو هاوڵاتیانی ناوچەکە گەورەترین دەرگای ئومێدیان بە رووی خۆیاندا کردەوە، بەڵام ئەو دەرفەتەش قەیرانە یەك لە دوای یەکەکانی هەرێمەکەی بە دوای خۆیدا هێنا.
بۆ ئەوەی زیاتر لە حاڵ و گوزەرانی ئەو پارێزگایە تێبگەین، بە پێویستمان زانی وەك جام کوردی گفتوگۆیەك لەگەڵ قایمقامی هەڵەبجە بەرێز نوخشە ناسیح ئەنجام بدەین.

- لە سەرەتای بە پارێزگابوونی هەڵەبجەوە هاوڵاتیانی سنوورەکە چاوەروانی گەشەو ئاوەدانی زیاتر بوون، تۆ چ پلانێکت هەبوو بۆ روو بە رووی قەیرانەکان؟

+ سەرەتا سوپاس بۆ جام کوردی کە هەمیشە پردی پەیوەندی بووە لە نێوان هەرێم و کۆماری ئیسلامی ئێران.
سەبارەت بە پرسیارەکەت راستە هاوڵاتیان لەگەڵ بە پارێزگابوونی هەڵەبجە چاوەروانی گەشەو ئاوەدانی زیاتربوون، بەڵام من بۆ ئەوە دەست بەکار نەبووم کۆتایی بە قەیرانەکان بهێنم، چونکە قەیران تەنها لە هەڵەبجە نیە، بەڵکو قەیرانەکان سەرتاسەرییەو هەموو شارو شارۆچکەیەکی هەرێمی کوردستان و ئەتوانم بڵێم بەشێك لە شارەکانی ناوەراستی عێراقیشی گرتوەتەوە.
بەڵام ئێمە لەگەڵ بەدەست بەکاربوونمان پلانمان هەبووە بۆ ئەوەی بزانین چی بکرێت، ئەگەرچی هەڵەبجە پێویستی بە بودجەیەکی گەورە هەیە بەڵام بە داخەوە کە ئەم پارێزگایە دروست بوو، قەیران زیاتر بوون، بەڵام ئەمەش بە مانای ئەوە نیە کە قەیران هەبوو ئیتر ناتوانین خزمەت بە هاوڵاتیان بکەین، چونکە مەعلوم نیە ئەم بارودۆخە تا کەی درێژە دەکێشێت.

- ئایا پێتان وایە بتوانن مامەڵەیەکی جیاواز بکەن لەکاتێکدا لە دۆخێکی نەبوونی و بێ بودجەییدان ؟

+بەڵێ توانیومانە زیاتر لەوەی چاوەرێ ئەکرێت هەوڵ بەین، چونکە ئەگەر سەردانێکی مەیدانی بۆ سنووری ئەم پارێزگایە بکەیت دەبینیت کە چەندین پرۆژە لە جێبەجێکردندایە، لەکاتێکدا پارێزگاکانی تر بەو شێوەیە پرۆژەی تێدا نیە جێ بە جێ بکرێت.
هەر بۆیە بەردەوام لە هەوڵداین بۆ ئەوەی ئەو پرۆژانەی کە وەستاون بە هۆی بێ بودجەییەوە،لەرێگای سەردان و هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتە پەیوەندیدارەکان ئەو پرۆژانەوە بکەونەوە کار تاوەکو هەرچی زوترە پرۆژە خزمەتگوزارییەکان ژیانێکی نوێ بکەنەوە بە بەر ئاوەدانی پارێزگاکەدا.
بە تایبەتی لە ئێستادا هەوڵمانداوە پرۆژەی رێگای دوو سایدی هەڵەبجە – سەیدسادق بچێتە بواری جێ بە جێکردنەوەو تەواو بکرێت.
ئەمە دڵسۆزی وەزارەتە بۆ هەڵەبجەو سوپاسی ئەنجومەنی وەزیرانیش ئەکەین کە هاتن بە دەم داواکەمانەوە .

- ئێران و هەرێم نزیکەی (١٠٠٠)کم سنووری هاوبەشیان هەیە، بە رای ئێوە چۆن ئەتوانرێت سوود لەم دەرفەتە وەربگیرێت بۆ خەڵکی ناوچەکە؟

+ بێگومان ئێمە هاوسنوورین لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران، ئەرکی دراوسێیەتیمان لە سەر یەکتر هەیە، پێویستە چی چاکە بۆ باشترکردنی گوزەرانی هاولایانی هەردوولا ئەنجامی بدەین، ئەوەش بە سەردان و کۆبونەوەو هەماهەنگی دەکرێت. وابزانم بەردەوام ئەو هەنگاوانە هەیە لەلایەن هەردوو لاوە.

- هەڵەبجە ژمارەیەك مەرزی نیمچە فەرمی و فەرمی هەیە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران، تا چەن ئاڵوگۆری شمەك و کاڵا بازرگانیەکان لەو مەرزانە ئاستی بژێوی خەڵکی ناوچەکەی باشتر کردووە؟

+ لە ئێستادا ژمارەیەك مەرز کە هاوکارە بۆ باشترکردنی بژێوی خەڵکی سنوورەکە جموجوڵی بازرگانی تێدایە وەك (مەرزی ملەخوردو دزاوەرو شۆشمێ و سازان و گریانە).
ئەگەرچی پێش بە پارێزگابوونی هەڵەبجە هەوڵەکان بەو ئاراستەیە بوون کە مەرزی (شۆشمێ - تەوێڵە) بکرێتە مەرزێکی گەشیاری، چونکە ئەوەندەی زەمینە سازی هەیە بۆ ئەوەی مەرزێکی گەشتیاری بێت، ئەوەنە گونجاو نیە بکرێتە مەرزێکی هاوردەو هەناردەی کاڵا بازرگانیەکان، بۆیە ئەگەر پێشتر لە سەر ئاستی قەزا ئەو هەوڵانە بە ئەنجام نەگەشتبن، ئەوە ئێستا لە سەر ئاستی پارێزگا بەرنامەرێژی هەیە بۆ ئەوەی ئەو مەرزە بکرێتە مەرزێکی گەشتیاری و کۆبونەوەو پرۆتۆکۆلی نوێ ئەنجام بدرێت لە نێوان هەردوولادا، چونکە پێگەی هەڵەبجە لە رووی ئیدارییەوە پارێزگایە هاوشێوەی پارێزگای کرماشان.
بۆیە بروامان وایە ئەگەر ئەو رێکەوتنانە تا ئێستا جێبەجێ نەکراوە کاریگەری ئەوەی لە سەر بووە کە هەندێك سەلاحیەت لای ئێمە نەبووە وەك چۆن پاوە قەزایەو هەندێك سەلاحیەت ئەگەرێتەوە بۆ ئوستانی کرماشان.
بەڵام لە مەرزە لاوەکیە نیمچە فەرمیەکانەوە هەندێك کەلوپەل و کاڵا بە شێوەی ترانزێت ئاڵ و گۆر ئەکرێت، ئەمە تەنها بۆ بژێوی هاوڵاتیانی نیشتەجێی سنوورەکەیەو ئەوە نیە، بەڵام مەرزی (شۆشمێ تەوێڵە) لە ئێستادا بۆ ئەوەیە کە رێگری لە هەناردەو هاوردەی هەندێك ئاڵ و گۆر بگیرێت کە بە رێکەوتنی هەردوولا رێگا پێدراوە وەك سوتەمەنی و مەوادی بیناسازی و خواردەمەنیە کشتوکاڵیەکان، بەڵام ئێمە تموحی ئەوەمان هەیە کە مەرزی سازانیش بکرێتەوە، بەڵام ئەوەیان بودجەیەکی زۆری پێویستە لە بەر ئەوەی ئەکەوێتە ناوچەیەکی شاخاوی و لە سەر روباری سیروانە لە رۆژئاوای باشووری هەڵەبجە، بەڵام ئەوەیان پلانی دوای کردنەوەی مەرزی (شۆشمێ - تەوێڵە) یە.



**ئێمە تموحی ئەوەمان هەیە کە مەرزی سازانیش بکرێتەوە، بەڵام ئەوەیان بودجەیەکی زۆری پێویستە لە بەر ئەوەی ئەکەوێتە ناوچەیەکی شاخاوی و لە سەر روباری سیروانە لە رۆژئاوای باشووری هەڵەبجە**

## شانزەی سێ چیمدی لە هەشتاوهەشتەوە بۆنی سێوم لێدێت ..

-١-
کیمیاباران، رووینەدابوو
لە ژێرزەمین
خاولی تەرم، دابەشدەکرد
پیرێك وتی
خۆت لەبیر نەکەی، حەوبرا.

-٢-
بە بەر ماڵی (عومەری خاوەر)دا،
رۆشتم
ئەی نازانم!
بۆ نەمردم؟

-٣-
قرخە و لرخە
لە تەك، قاقا و پێکەنیندا
تێکەڵ، بە رشانەوە دەبوو.

-٤-
ئەڵقاو ئەڵق
بە، رەشبەڵەك، هەڵدەپەرین.
بێئاگا بوون
کە، سەرچۆپی، مەرگ دەگرن.

-٥-
کۆرپەیەك، پەیتا، پەیتا
گۆی مەمکی
دایکە مردووەکەی دەمژی.

-٦-
مێردمنداڵێك
پەلی، باوکە نابیناکەی
رادەکێشا
ناو بە ناوێك
هاواری، لە، دایکی دەکرد.

-٧-
دایك و کچێك
بە کەمامەی (خەڵوز)ەوە
دەستیان، لە ملی یەك نابوو.

-٨-
کۆترە شینکەی
سەر (قسن)ەکەی، عەبابەیلێ
وەکو (شوبات) ، نەیاندەگماند.

-٩-
پیرەمێردێك
دوو سێ، بیست و پێنجی، چوار
ئەسپی
رادەوەشاند.
بە، تەنها، یەك وشەی دەوت
ئاو.

-١٠-
دەڵەسەگێك
تووتکەکانی، دەلستەوە.
ناو بە ناوێك
روو لە ئاسمان
دەیقرووسکاند.

-١١-
چەندساڵێك بوو
بیرێك (پاکلەمە ) نەکرابوو.
بە، جام ، ئاوم، لێدەرهێنا.

-١٢-
لە پاڵ، درەختێکی، وشکهەڵاتوو
لە ژێر، گوانی، مانگایەکدا
سەتڵە شیرێك
مێش تێدابوو.

ل‌فەتاح حەسەن
دانیمارك ڤالبی

هەڵەبجە نیوز
لەهەڵەبجەدەردەچێت
ساڵی یەکەم ژمارە(١٠)کانونی یەکەمی ٢٠١٦
موبایل:٠٧٥٠٨٣٥٤٦٠٦
فەیسبوک:هەڵەبجەنیوزحلبجە نیوز

## دوالاپەرە

لە باسی مەینەت و دەردی دەروونی بۆیە دەم نادەم
لە خوێناوی دڵی پڕ غەم کە سینەم مەوج ئەدا تا دەم
غەمم دێتی کە بۆ وەك كۆدەك ئاگر بەردەمە کاغەز
لەبۆ نوسینی غەمنامەی دڵم هەرگا قەڵەم دادەم
مەحوی

ئەم وێنەیە وێنەی پیشمەرگەی شۆرشی ئەیلولە،لە بەهاری ساڵی ١٩٦٣ لە هەڵەبجە گیراوە،لە بۆنەی یادی شەهیدێکدا گیراوە.وێنەی باوکم (شەهید حەمە گوڵپی) دوەم کەسی ریزی یەکەمە لە چەپەوە،دوای چوار مانگ لە شەری پردی زەڵمدا شەهید بو.وێنەی خەزورم (مامۆستا شیخ حەمەئەمین) لە ریزی دوەمدا لای چەپەوە کەسی پێنجەمە.لەئەکاونتیدکتۆر فایەق گوڵپی-یەوە




## سەبارەت بەهۆزی جاف

جوگرافیا و عەشیرەت و تیرەکانی جاف
زۆربەی ئەم عێلە ئەمرۆ لە پارێزگاکانی سلێمانی و کەرکووك و دیالەدا دەژین و هەر دوو ناوەندی قەزای کەلار و هەڵەبجە بە شار و مەڵبەندی سەرەکیی جاف و شوێنی نیشتەجێبوونی سەرەکیی بەگزادەکانیان دەژمێردرێن. بوونی جاف بە شێوەیەکی چروپر لە دەڤەرەی شارەزووردا بەدەردەکەوێت، دوو تیرەشیان بەناوی تەلان و سمایل عوزێری لە ناوچەی دۆکان و سورداشدان، جافە رەشکەش بەزۆری لە ناوچەی پشدەردان لە باکووری سلێمانیدا. هەروەها ژمارەیەکی بەرچاو لە تیرەی گلاڵی و بەگزادەی جاف و یوسیف جانی لە شاری هەولێر و گوندەکانی دەوروبەریدا دەژین. ئەمە وێرای ئەوەس کە چەندین تیرەی دیکەی جاف وەك: تایشەیی و قادر میروەیسی و بێویانی و.... لە سنووری قەزای خانەقی، پارێزگای دیالە لە رۆژهەلاتی رووباری سیرواندا دەژین . هەمیسان دەڤەری بەرینی گەرمیان بە گشت شوێنە جیاجیاکانییەوە دەیان هەزار جاف لەخۆ دەگرێت.
لە کوردستانی ئێرانیشدا، رۆڵەکانی عێلی جاف لە هەردوو پارێزگای کرماشان و کوردستاندا بە گشتی نیشتەجێن و دەتوانین شوێنی نیشتەجێبوونیان بەم شێوەیە دیاری بکەین:
قەسری شیرین، سەرپێلی زەهاو هەتا سنووری رووباری سیروان و، دۆڵی عەلی عاسی تا سنووری عەشرەتی سنجاوی لە باکوور و رۆژهەلاتی شاری کرماشاندا، هەروەها جوانرۆ (جوانرۆ مەڵبەندی رەسەن و دێرینی گشت جافە) .
دیسان زێد و شوێنی جاف درێژ دەبنەوە تا دەگەنە ناوچەکانی درۆڵە و مەرەخێل و شمشێر و پاوە و دەوروبەری نەوسود. لە رووی شوێنی جوگرافییەوە دەتوانین عێلی جاف بکەین بە هۆزی باوا، ئێناخی، ئیمامی، سێ بەشی سەرەکییەوە:
موڕادی جافی موڕادی لە عێراق:
میکایلی، شاتری، وردەشاتری، رۆغزایی، تەرخانی، باشکی، جنگنی، هارونی، گلاڵی، سەدانی، کەمالەیی، بێداخی، نەورۆلی، یەزدان بەخشی، وەلی، نەژوێنی، مەسۆیی، مامۆیی، شێخ سمایلی، سۆفی وەن، عەشیرەتی باوا، عەشیرەتي تاوگۆزی، میراولی، پشتماڵە، عەمەلە، عیسالی، بێسەری، تەلان، یەسوجانی، چوچانی، قەویلەیی، تیلەکۆ، سمایل عوزێری، جافە رەشکە...!
جافی جوانرۆ لە ئێران
جافی گۆران لە ئێران
(ئەم بەشە ئەو جافانەش دەگرێتەوە کە لە کەناری رۆژهەلاتی رووباری سیرواندا لە سنووری خانەقیدا دەژین).
عەشرەت وتیرەکانی جافی کوردستانی ئیرانیش (جوانرۆیی و گۆران) بەگشتی ئەمانەن: رۆستەم بەگی، وەکیلی، قوبادی، عەشیرەتی باوا، باوەجانی، ساتیاری، شمشێری، کلاشی، زەردۆیی، کۆکۆیی، کوێرەکی، وەلەبەگی، قادر میروەیسی، کویك نیرجی، عەلی یاخەیی، بەبلی، دۆرۆیی، دەلەزیری، دەروێشی، قەلخانجك، کورەك کج، نێرژی، ئەلیاسی، سۆفی، کاکە رەشی، گاخۆری، کشتی، یەسویار ئەحمەدی، دارخۆر، گاوری، ئەلیارەکی، بێویانی، قوجالی، عالی، کوزەرەیی، بازانی، جوخەیی، هاوری، سەیالی، ع قادری، میرکی و...
ناودارانی جاف
وێژە
ئەحمەد موختار جاف
تاهیر بەگی جاف
مینە جاف
خەسرەو جاف
کەریم بەگی جاف
سیاسەت
عادیلە خانم
هونەر
تارا جاف
پەیوەند جاف
کۆنینەناس
فریدوون بگ لری

موختارعومەرخەلیفە

## ماموستای ئەوان و ئیمە

یەکەم رستەی کە لە فێرگەکانی کوردستان لە لایەن ماٌموستاوە بە خوێندکاران ئەوترێت بۆ ئەوەی فێربن، بریتییە لە:
# دارا دوو داری دی.
ئەمە بۆ منالان لە قوناغی سەرەتاییدایە، کە یەکەم شت کە بینووسن و بیخوێننەوە!.
# کاوە کار دەکات.
ئەمەشیان بۆ ئەو کەسانەیە کە لە سەرو تەمەنی ١٨ ساڵن و نەخوێندەوارن و لە خوێندنگەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواری، فێریان ئەکەن.
ئەمەش یەکەم رستەی ئینگلیزەکانە، کە منالەکانیان فیر ئەکەن لە قوتابخانەکانیان:
# من ئەتوانم بخوێنم و بنووسم.
ئەي بزانین ژاپۆنییەکان یەکەم رستەیان بۆ منالەکانیان چییە؟ :
# من ئەبێت بزانم.
ئینگلیزەکان توانیان بخوێنن و بنووسن، ئەوان توانیان بەو یەکەم رستەیە، زمانەکەیان بکەنە نووسین و خوێندنیی یەکەمی جیهان و هەزاران شاکاری ئەدەبی و هونەریی لوتکەی پێ بخولقینن.... .
ژاپۆنیەکانیش، توانیان هەموو شت بزانن، و ە ئەبوایە کاریکی وا بکەن کە شارەزای هەموو شت بن، وە کردیشیان، کە پێشرەوی زانستە سەردەمییەکانیان بۆ خۆیان بچری.... .
ئەم رستە بێ مانا و ناوەرۆکەی کورد، کە هیچ هێزێکی مەنەوەی و ئاوەزەیی تێدا نییە، نەک ئایندەیەکی بۆ خوێندکار دروست نەکرد، بەڵکو هەمیشە توشی دوش دامان و داماو وەستان و دەمداچەیو کردنیان کردن کە پشت بە گێرانەوە و داستان ببەستن، کە گوایە دارایەک هەبوو دوو داری دیبوو. ئاخر فەلسەفەی گێرانەوەی رووداوێکی ئاوا سادە لە کوێدایە؟.
ئەوەشی کە نەخوێندەوار بوو، ناچارە کار بکات، ئیتر کاوە کار بکات یا نەیکات، چ هونەرێکی بۆ ئەو کەسانە تیدایە و کام کێویان بۆ ئەگرێت؟.
مامۆستای ئەمرۆش هەمان نەوەی پیشووی هەمان ئەو قوتابیانەی دوو دارەکەی دارا بوون، کە خۆیان ئەم پەکەم رستە بێ مانایانە دووبارە ئەڵێنەوە، کۆمەلگەی کوردیش هەمان تاس و هەمان حەمام،.
من چاوەرێی ئاوی سازگار لە کانییەکی روون ئەکەم، پەروەردە و یاسا، دوو بنەمای سەرەکی وڵاتن، لێ ئەوەندەی ئەم دوو کێڵگەیە ئافات لێیداوە، هیچ سەکتەرێکی دیکە، وا وورد و خاش نەبووە.
ئیدی ئەگەر، چ خودی دەغڵ و دانەکە، چ کێڵگە و بەرهەمەکەی. خۆرانە کۆڵەواری کردبێت، چاوەرێی چی سوپرایزێکی لێ ئەکرێت؟.
مامۆستا و پەروەردە، واتە درووستکردنی کۆمەڵگە و کەلتور و شارستانییەت، بەڵام ئایا لە کوردستان ئەو کەش و هەوایەیان بۆ فەراهەم کراوە؟. ئەگەر وەڵامەکە نەخێر بێت، ئیتر ئەرکی لە خۆیان سەنگینتر بۆ بخەینە کۆڵیان، ئەوان داوای موچە و بەهای کارەکانیان ئەکەن و بەس،

دانا هەڵەبجەیی
هۆلاند

# هەڵەبجە نیوز

Halabja News

بایەخ بە کاروباری پارێزگای هەڵەبجە دەدات

ژمارە(١٢)

١٦ی کانونی دووەمی ٢٠١٧

خاوەن ئیمتیازوسەرنوسەر

سەلاح سەعید ئەمین


# باساڵیادی کیمیاباران بێ ئەنجومەنی پارێزگا نەکرێتەوە

## سکاڵای یاسایی لەسەر دانیشتویەکی وڵاتی ئەمریکا تۆماردەکرێت

ژیار کامیل

٢ـــی کانونی دووەمی ٢٠١٧ کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە سکاڵای یاساییان لەسەر کوردێکی دانیشتوی ئەمریکا تۆمار کرد کە سووکایەتی بە شەهیدان کردووە. لوقمان عەبدولقادر سەرۆکی کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا رایگەیاند:»کەسێک بەناوی (ئاسۆ رەش) کە کوردە و دانیشتووی ئەمریکایە لە بابەتێکیدا کە لە یوتیوب بلاوی کردووەتەوە بە قسەی نەشیاو و ناشرین هێرشدەکاتە سەر شەهیدانی هەڵەبجە و کیمیاباران و بەقسەی نەشیاو سوکایەتیان پێدەکات». راشیگەیاند:»ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە بریارمان داوە کە وەک کۆمەڵە لەدادگای هەڵەبجە سکاڵای یاسایی لەسەر تۆمار بکەین و پەیامێکیش ئاراستەی قونسولی ئەمریکا بکەین بۆ بەدواداچونی بابەتەکە» .



دیمەنێکی پروپاگەندەی کیانەسیاسیەکان لەهەڵەبجە-ئەرشیف

## بەرکەوتوویەکی دیکەی چەکی کیمیایی گیانی لەدەستدا

رۆژنیوز – جیهاد هەورامی

بەرکەوتوویەکی دیکەی چەکی کیمیایی کیمیابارانی هەڵەبجە گیانی لەدەستدا و سەرۆکی کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجەش دەڵێت: بەبەرچاوی هەمومانەوە ئەو بریندارانە گیان لەدەست دەدەن و حکومەتیش لەئاست چارەسەرکردنیان خۆی کەرکردووە. نورەلا سەید ئەحمەد، بەهۆی سەختی برینەکەی و چارەسەرنەکردنی گیانی لەدەستدا و بەمەش ژمارەی گیان لەدەستدانی بریندارانی چەکی کیمیایی کیمیابارانی هەلەبجە گەیشتە ٩٣ بەرکەوتە. لوقمان عەبدولقادر، سەرۆکی کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەلەبجە بە رۆژنیوزی راگەیاند:»بەداخەوە شەوی رابردوو بەرکەتویەکی دیکەی چەکی کیمیایانی هەڵەبجە گیانی لەدەستدا، ئەمەش بەهۆی کەمتەرخەمیەکامی بەرپرسان و حکومەتە کە تائێستا نەهاتون بەدەم چارەسەرکردنیان و لەئاست داواکاریەکانی ئێمەشدا گوێیان کەر کردووە»رۆژانە بەدیار هەموانەوە گیان لەدەست دەدەن،


نانی هەورامی جێگە بەنانی سوری لێژدەکات ..ل٢

کۆکردنەوەی بەڵگەکانی جینۆسایدی کورد ..ل٣

ماستەرنامەیەك لەسەرهەڵەبجە ..ل٤


# بایکۆت لەڕووی شەرعی و یاساییەوە تاوتوێ دەکرێت

بزاف پرێس

یەکێتی مامۆستایان و دەستەی داکۆکیکردن لە مافی مامۆستایان لە هەڵەبجە بایکۆت لە رووی شەرع و یاساوە لەرێی ئەنجامدانی سیمینارێکەوە روونکردەوە.
سیمینارەکە بۆ هەر یەکە لە حاکم شێخ لەتیف و د.عەبدولدائم هەورامی و فاروق غەفور و دانا عەبدول سازکرابوو، ئەوەش بە ئامانجی خستنەرووی گرنگی بەردەوامی بایکۆت و دەرئەنجامەکانی.سەرەتا د.عەبدولدائم هەورامی، مامۆستای ئایینی لە رووی شەرعەوە باسی لە بایکۆتی دەوام لەلایەن مامۆستایان کرد و وتی:»لە رووی شەرعەوە بایکۆتکردن دروستە و زۆربەی شەرع زانەکانیش لەگەڵ بایکۆتدان، تەنها رێژەیەکی کەم نەبێت و لەگەڵ ئەوەشدا بایکۆتی خوێندنیش بەدروست زانراوە».
وتیشی: هەربۆیە بایکۆتی مامۆستایان و فەرمانبەران لە هەرێمی کوردستانیش لەپێناو بەدەستهێنانی مافەکانیان رەوا و شەرعیە و پێویستە حکومەتیش زۆر بەجدی سەرجەم داواکاریەکان جێبەجێ بکات».دواتر دانا عەبدول ئەندامی دەستەی داکۆکی لە مافی مامۆستایان وتی:»ئێمە بایکۆتمان لەپێناو فشارخستەسەر حکومەت دەستپێکردوە چارەسەری کێشە و قەیرانەکانیش لەدەست حکومەتدایە»وتیشی:»زۆر کەس پێیوایە بایکۆت چارەسەری ئەم قەیرانانەیە، ئێمە بەردەوام دەبین لەسەر بایکۆت و فشارەکانمان و ئەوە حکومەتە کە پێویستە گوێ لە داوا رەواکانی ئێمە بگرێت و چارەسەری قەیرانەکان بکات.پاشان هەر لەو سیمینارەدا حاکم شێخ لەتیف ئەندامی خولی پێشووی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، وتی:»بەداخەوە نیوەی داهات و پارەی ئەم وولاتە لەلایەن بەرپرسانی بالاوە قوماری پێوە دەکرێت، بۆیە زۆر بێ باکانە سەیری داوا رەواکانی مامۆستایان و فەرمانبەران دەکەن،ئاماژەی بەوەشکرد:»دەسەلاتداران نایانەوێ کێشەکان چارەسەر بکەن و بەردەوام بێ ئاگان لە حال و گوزەرانی چینی موچەخۆران کە لە ئێستادا بەهۆی سیستمی پاشەکەوت و دواکەوتنی موچەکانیان ژیانیان ئەستەم بوە».
پاشان فاروق غەفور ئەندامی لقی هەڵەبجەی یەکێتی مامۆستایان باسی لەبایکۆت کرد و وتی:»ئێمە وەک لقی هەڵەبجەی یەکێتی مامۆستایان هەر لەسەرەتای بایکۆتی دەوامەوە و لە ٢٠١٦/٦/٢٥ بایکۆتی سەرتاسەریمان راگەیاندوە».
روونیشیکردەوە:»پالپشتیمان لە داوا رەواکانی مامۆستایان کردوە .

# نانی هەورامی جێگە بەنانی سوری و ئێرانی لێژ دەکات

نانی هەورامی لەبازارەکانی کوردستان سەرنجی هاوڵاتیانی راکێشاوە لەئێستەشدادەیان کارگەی دروستکردنی نانی هەورامی کراونەتەوە کە ئەم کارگانە تەنها لەلایەن ژنانەوە بەرێوەدەبرێن و دەیان ژن هەلی کاریان بۆ رەخساوە.

ئاوێنە، عەزیز رەسوڵ: کەژاڵ رەئوف محەمەد لەکاتی نانکردن لەکارگەی نانی هەورامان لەهەڵەبجە رۆژانە چوار کاتژمێر لەم کارگەیە کاردەکات و (٢٠٠)گونکی هەویر دەکاتە نان، وتی "لەبەرامبەر کارەکەم برە پارەیەك وەردەگرم کە دەتوانم پێداویستەیەکانی رۆژانەی خۆمی پێپربکەمەوە".
ئێستا لەهەرێمی کوردستان بەتایبەت بەپارێزگای سلێمانی و هەڵەبجە کردنەوەی ئەم جۆرە کارگانە روی لەزیادبون کردوە بەجۆرێك تەنها لەهەڵەبجە نزیکەی (٢٠) کارگەی نانی هەورامی تێدایە، هاوڵاتیانیش هاوشانی نانی تەنورو ئەو جۆرە سەمونانەی کە بیانین نانی هەورامی بەکاردەهێنن".
سەلمان جەمال خاوەنکاری کەژاڵی نانکەرە ئەو جگە لەکەژاڵ، ٩ ئافرەتی دیکەش نانی بۆ دەکەن و کاری ئەویش ساخکردنەوەیەتی، بەپێی قسەی خۆی لەرێگەی دو شەفتی کارکردنەوە رۆژانە (٢٠٠٠)هەزار نان لەکارگەکەی بەرهەمدێت، ئەوتی وتی "بۆهەر(٣٠) گونك هەویرێك ئێمە بری (١) هەزار دینار دەدەین، رۆژانە هەر ژنێك زیاتر لە (١٥)هەزار دینار حەقدەستی دەبێت لامان".
وتیشی" خاوەنی موڵەتی فەرمی حکومەتین، ئەم نانانە رۆژانە بەسۆپەرماکێتەکانی سلێمانی و هەڵەبجەو هەولێر دەفرۆشین بازارێکی زۆر باشمان هەیە، هاوڵاتیان لەئێستادا رویانکردوەتە کرینی نانی هەورامی".
وەزارەتی بازرگانی: ئامادەین هاوکاری کارگەکانی نانی هەورامی بکەین
دانانی کارگەی نانی هەورامی تێچوی زۆری تێناچێت ئەوەش وایکردوە کەسانێك ترسیان لەکردنەوەی نەبێت چونکە دەزگایەکی دەوێت بۆ شێلانی هەویرەکەو چەند ساجێکی غازی، ئەوی دیکەشی دەکەوێتە سەر دەستی کار کە زۆربەی ژنان کاریان تێدادەکەن، پاشان ئامادە دەکرێت بۆ فرۆشتن.
کارزان حسێن خاوەنی سۆپەرماکێتی کۆژین لەسلێمانی ئاماژەی بەوەدا "نانی هەورامی لەسۆپەرماکێتەکەمان دەفرۆشین رۆژانە زیاتر لە(١٠٠)نان دەفرۆشین هاوڵاتیان لەئێستادا زۆر حەزبەخواردنی نانی هەورامی دەکەن، بەجۆرێك ئێمە (٥)نان بەهەزار دینار دەکرین دەیفرۆشینەوە بەهەزارو دوسەدوپەنجا دینار".
کارزان حسێن وتیشی"ئێمە دو جۆر کریارمان هەیە، یەکێکیان کوردەکانی خۆمانن ئەویدیکەیان عەرەبن بەئاوارەیی هاتونەتە هەرێمی کوردستان کە ئێستا ئەوانیش فێری خواردنی نانی هەورامی بون، بۆیە زۆر گرنگە حکومەتی هەرێمی کوردستان هاوکاری ئەو کەسانە بکات کە ئەم جۆرە کارگانە دەکەنەوە، نانی هەورامی لەبازاردا جێگەی نانی سوری و ئێرانی گرتوەتەوە".
زیادبونی بەکارهێنانی نانی خۆماڵی جگە لەوەی گەشەدانە بە بەرهەمێکی خۆماڵی، هاوکات دەستی کاریشی بۆ ژنان رەخساندوە.
فاروق غەفور ئابوریناس ئەوە دەڵێت "کردنەوەی کارگەی نانی هەورامی و پەرەپێدانی لەبازاری ئەمرۆی ئێمەدا کە قەیرانی دارایی بەرۆکی هەرێمی کوردستانی گرتوە زۆر گرنگە، چونکە دانانی ئەم جۆرە کارگانە تێچوی زۆرکەمیان تێدەچێت و بەرهەمێکی باشیان دەبێت کەسانێك هەلی کاریان بۆ دەرەخسێت".
ئەو ئابوریناسە وتیشی"یاسایەك هەیە لەئابوریدا باسی ئەوەدەکات کاتێك داهات دابەزی ئەوکات لەوڵات زۆرتر دەستدەبرێت بۆ ئەوکارگانەی کە بەتێچوی زۆرکەم بنیات دەنرێت و بەدەستی کار بەرێوە دەبرێن، ئێمە زۆر پێویستە پەرە بەم کارە بدەین چۆن نان لەوڵاتانەوە هەناردە دەکرێت ئاوهاش ئێمە بتوانین نانی هەورامی هەناردەی وڵاتان بکەین".



عەرەبەکان بەئاوارەیی هاتونەتە هەرێمی کوردستان کە ئێستا ئەوانیش فێری خواردنی نانی هەورامی بون
لای خۆشیەوە دکتۆر عەبدورەزاق عوسمان بەرێوەبەری گشتی دیوانی وەزارەتی بازرگانی بەوەکالەت ئاماژە بەوەدەدات "ئێمە هەرکەس بێت داوامان لێبکات لەدانانی کارگە بەگشتی پاش دیراسەکردنی کارەکەی بەخۆشحاڵیەوە هاوکاریشی دەکەین لەدانانی کارگە، لەئێستەدا خەڵکانێك رو لەدانانی کارگەی نانی هەورامی دەکەن، ئەمەش گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لامان کە کرێکارەکانی ئەم کارگەیە دەبێت ژنبن بۆیە هەمو هاوکارییەکیان دەکەین".
وتیشی "ئێمە لەئایندەدا گرنگی زیاتر بەکردنەوەی ئەم کارگانە دەدەین تاوەکو نانی هەورامی بەرامبەربێت بەنانی کولێرەو سەمون و بشتوانین لەئایندەدا هاوردەی دەرەوەی وڵاتی بکەین وەك کاڵایەکی خۆماڵی کوردی بەڵام تائێستە ئێمە ئاماری دروستمان لانیە چەند کارگەی نانی هەورامی لەسەر ئاستی کوردستان کراونەتەوە".
جگە لەکارگەکان بەشێك لەژنان لەماڵەکانی خۆیان نانی هەورامی دەکەن بۆ ئەو سۆپەرماکێتانەی کە گرێبەستیان لەگەڵ دەکەن، بۆیە ئێستا نانی هەورامی کە تەندروستترین جۆری نانە لەهەرێمی کوردستان بوەتە جێگەی سەرنج و دورنیە لەماوەیەکی کەمدا بازاری نان کۆنترۆڵبکات.

# پەیوەندیەکانی هەرێم و بەغدا و کێشەکانی بودجە

لە ژێر ناونیشانی ( پەیوەندیەکانی هەرێم و بەغدا و کێشەکانی بودجە ) رۆژی دووشەممە (بەرواری ٢٠١٧/١/٩ ) کۆلێژی زانستە پراکتیکییەکانی هەڵەبجە کۆرێکی بۆ بەرێز (د. بەختیارشاوێس) ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق سازکرد، لە کۆرەکەدا بەرێزیان بە ووردی باسی لە کێشە داراییەکانی نێوان هەرێم و بەغدای کرد و ئاماژەی کرد بەوەی کەپەیوەندی ئاڵۆزی نێوان هەرێم و حکومەتی ناوەند دەگەرێتەوە نەبوونی ستراتیژێکی دوورمەودا و کێشەناوخۆییەکان . لەهەمان کاتدا بە ئیجابی پرۆژە کوردیەکەی هەڵسەنگاند کە لە بودجەی عێراقی ساڵی (٢٠١٧) جێگیر کراوە بۆ چارەسەری قەیرانی دارایی هەرێم..
شایانی باسە لە کۆرەکەدا چەندەها کەسایەتی حکومی و ئەکادیمی خوێندکارانی زانکۆ ئامادەبوون

# گروپی خانمانی دەست رەنگین پرۆژەی ریسایکلین جێبەجێ دەکەن

جیهاد هەورامی

گروپی خانمانی دەست رەنگین لە شاری هەڵەبجە کاری ریسایکلین ئەنجام دەدەن و کەلوپەلە فرێدراوەکان بۆ کاری هونەری و رازاندنەوەی ماڵ بەکاردەهێنن.
گروپی خانمانی دەست رەنگینی هەڵەبجە، لە کۆمەڵێك ژنی چالاکوان و بەهرەمەندی بوارەکانی وێنەکێشان و پەیکەرتاشی و بەرگدور پێکدێت و سەرەتای ساڵی ٢٠١٥ دامەزراون، لە ئیستادا پرۆژەی ریسایکلین ئەنجام دەدەن و کەلوپەلە فرێدراوەکان بە شێوازی هونەری بەکاردەهێننەوە.
سندوس حسێن، بەرپرسی گروپی خانمانی دەست رەنگین، لەبارەی ئامانجی دامەزراندنی ئەم گروپە بە رۆژنیوزی راگەیاند:»ئامانجمان لەدامەزراندنی ئەم گروپە کۆکردنەوەی ژنانی دەست رەنگین و بەهرەمەندە، کە دەرفەتیان بۆ نەرەخساوە تا تواناکانیان بخەنەرو و پەرەی پێ بدەن و لەگەڵ ئەوەشدا رۆڵیان وەکو ژنێکی بەهرەمەند بخەنەروو بۆ تەواوی کۆمەڵگا و چیتر لەماڵدا گۆشەگیر نەکرێن».
سندوس حسێن، وتیشی:»ئێمە لەئێستادا پرۆژەیەکمان لەبەردەستە کە ئەویش بریتیە لە دووبارە بەکارهێنانەوەی ئەو کەلوپەل و ئامێرە خراپ و دورخراوانەی کە لەماڵان سودی لێ نابینن و فرێی دەدەن، ئێمە جارێکی تر وەکو شێوازی هونەری و جوانکاری دروستیدەکەینەوە و لەپێشانگا و شوێنە گشتیەکان نمایشیان دەکەین

# دۆکیۆمێنتکردنی بەڵگەکانی جینۆسایدی کورد

ئا: ئیراد منوچر سان ئەحمەد



کۆمپانیای ( مارتن ئیمنی لیی) Imani Lee company]) بۆ کۆکردنەوەی بەڵگەکانی جینۆسایدی گەلی کورد.

کۆمپانیای ( مارتن ئیمنی لیی) ، بە هاوکاری حکومەتی هەریمی کوردستان کە کار دەکەن بۆ وەرگێرانی ئەو دوکیومێنتانەی فەرمانەکانی جینۆسایدی گەلی کوردی تیدایە لەلایەن رژیمی پێشووی عێراق کە بەزمانی عەرەبی یە وەرگێرانی بۆ دەکرێت بۆ سەر زمانی ئینگلیزی،تائێستا نزیکەی ١٠٨ دوکیومینت لە بەردەست ئەو کۆمپانیادا هەیە کە هەموویان بەڵگەن لەسەر بەکردارێکردنی جینۆسایدی گەلی کورد، وە کۆمپانیای ناوبراو تائێستا نزیکەی سەد دوکیومێنتیان وەرگێراو لە سەر هەوڵەکانی رژیمی بەعس بۆ لەناوبردنی گەلی کورد لەرێ ی بەکارهێنانی چەکی کیمیاییەوە و پرۆسەی ئەنفالەوە.

ئەم دوکیومێنتانە کە وەرگێرینراون بۆ زمانی ئینگلیزی سەرجەمیان لە کونگریسی ئەمەریکا دا هەڵگیراون وەك هەوڵێك بۆ ناساندنی بە جینۆسایدو خستنەرووی نەهامتیەکانی گەلی کورد و لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا.

شایانی باسە لیی مارتن بەرێوەبەری کۆماپانیاکەو بەهار مارتن کەبە رەچەڵەك کوردە و خێزانی (لیی مارتن)ە جێگری کۆمپانیای ناوبراوە ، بەهار مارتن رۆڵی بەر چاو و کارای هەیە لەم کۆمپانیادا ، و هونەر ئەنوەر ئەندامی گروپەکەو بەرێوبەری پرۆژە ی پەیمانگای دایلۆگ لە زانکۆی تیمبل ، لە هەوڵەکانیان بەردوام بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی فەرمی دانپێدانان بۆ بە جینوساید کردنی گەلی کورد بکرێت.

ئەمەش لەبەرئەوەی زۆرێك لە ئەمەریکییەکان شارەزان لە ناوەکانی: بیرگن ، بیلسن،بۆچین والد، ئوشویتز بیرکیناون کەهەموویان ناوی ئەو کەمپانەن کە نازیەکان تاوانی جینۆسایدکردنیان تیدا ئەنجامداوە. ئەم لەکاتێکدا زۆرێك لە ئەمەریکیەکان بیرۆکەیان نیە لەسەر هەڵەبجە و ئەنفالی گەرمیان و خۆشناوەتی و بەرزانیەکان.

بە پێی ئاژانسی فرانس پریس، BBC ، واشنتون پۆست، RBS، FOREIGN Policy، INDEPENDENT ،هیومان رایت وۆچ ،CIA، دۆکیمینت هەیە لەسەر ئەوەی ئەمەریکا بەتەواوەتی ئاگاداربووە لەسەر ئەوەی کەبەسەر کوردەکان هاتووە لەسەر دەستی رژێمی پێشووی ئەو ولاتە.

لەو دوکیومێنتەکان پێنج کەیس دیاریکردوە بە بەڵگەوە وەرگێرانی بۆ کراوە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی:

کەیسی یەکەم / هێرشی کیمیایی بووە بۆ سەر هەڵەبجە لە ١٦/٣/١٩٨٨.

کەیسی دووەم ئەنفال کە بە هەشت قۆناغ دیاری کراوە:

١-ئەنفالی دۆڵی جافایەتی لە مانگی ٢٣ شبات تا ١٩ ئازاری ١٩٨٨.

٢- ئەنفالي قەرداغ لە ٢٢ ئازار تا ١ ی نیسان سالی ١٩٨٨ بووە.

٣- ئەنفالی ناوچەکانی گەرمیان لە ٧ تا ٢٠ نیسان سالی ١٩٨٨.

٤-کۆیە و کەرکوك لە ٣ تا ٨ئایاری ١٩٨٨ .

٥ و ٦ و ٧ ئەنفالی خۆشناوەتی و باڵەکایەتی لە ١٥ ئایار تا ٢٦ ئابی ١٩٨٨.

٨- ئەنفالی ناوچەی بارزان لە ٢٥ ئاب تا ٦ئەیلول ١٩٨٨ .

کەیسی سێهەم /کەیسی بەرزانیەکانە:

کەتێیدا لە سالی ١٩٨٣ نزیکەی هەشت هەزار کەس لە گەنج وپیاوی بەرزانی کوژاون بۆ چاو ترساندنی کۆمەڵگای کوردی بۆ چونە نێو خزمەتی سەربازی . کەیس کەیسی چوارەم/کەیس کوردە فەیلیەکانە دوای ئەوەی بەزۆ ر کوردە فەیلیەکان دەنرێنە ئێران لە سنوری ئەو ولاتە و دوای کوشتنی ژمارەیەکی زۆریان لە سالی ١٩٨٠ دەستی پێیکرد.

کەسی پێنجەم/ کەیس گەرمیان ، ئەو شارەی کە بەناوی( داودە) هێزەکانی عێراق لە سالی ١٩٨٨ جینوسایدیان تێدا ئەنجام داوە.

جگە مانە هەزارەها دۆکیومێنتی دی لەلایەن کۆمپانیای ئیمی لیی وەرگێراوە بەزۆری لەلایەنً ئەو کەسانەی خزموتی سوپایان هەبووە ، لە هێزەکانی عێراقدا و وەك وەرگێر کاریان کردوە.



004546

کانی عاشقان ١١(١-٢)



004547

کانی عاشقان ١١(٢-٢)

ئەگەربێت و بە فەرمی ئەمەریکا دانپێدانی جینۆ سایدی کورد بکات ، ئەوا دە توانرێت سەرجەم بەڵگەکان لە مۆزخانەی هۆلۆکۆست لە واشنتۆن دابنرێت.

سەر چاوەکان:

١- http://www.delmartimes.net/carmel-valley-/١١/١١/٢٠١٣ company-translates-classified-documents-on-halabja-chemical-attack/

٢- http://www.journalscene./٢٠١٣١١٢٢/com/article ١٣١١٢٩٨١٧/SJ٠١

- پسپۆری بایلۆجی و سەرپەرشتیاری پەروەردەی هەڵەبجە

## بەداخەوە ئەم ئۆتۆمبێلە خەریکە دەرزێت

ئەم ئۆتۆمبێلە لە رۆژی کیمیابارانی شاری هەڵەبجەدا کە بۆ دەربازبوون لە مەرگ ئەو هەموو خەلکەی شارەکەی هەلگرتبوو بەلام کیمیاییەکە زۆرینەیانی شەهیدکرد و هەندێکیشیان بریندار بوون. ئەم ئۆتۆمبێلە پیکابە بوو بە شاهیدحاڵێك بۆ مەزلوومیەتی خەلکی هەڵەبجە و هەموو کورد، ئێستا لە مۆنۆمێنتی هەڵەبجە وەك بەڵگەیەکی زیندوو دانراوە، بەلام داخەکەم خەریکە ژەنگ دایدەرزێنێت و لەناوی دەبات. دەبوو چوارچێوەی شووشەی بۆ دروستبکرایە و بە مادەی دژە ژەنگ و ئەوەی پێویستە بۆی دابینکرایە. کەچی ئەوە سەرما و گەرما و باران لەناوی دەبات. خۆزگە بەرپرسان نەیهانهێشتایە




بەو دەردە بچێت.

بەداخەوە ئەم ئۆتۆمبێلە خەریکە دەرزێت ئەم ئۆتۆمبێلە لە رۆژی کیمیابارانی شاری هەڵەبجەدا کە بۆ دەربازبوون لە مەرگ ئەو هەموو خەلکەی شارەکەی هەلگرتبوو بەلام کیمیاییەکە زۆرینەیانی شەهیدکرد و هەندێکیشیان بریندار بوون. ئەم ئۆتۆمبێلە پیکابە بوو بە شاهیدحاڵێك بۆ مەزلوومیەتی خەلکی هەڵەبجە و هەموو کورد، ئێستا لە مۆنۆمێنتی هەڵەبجە وەك بەڵگەیەکی زیندوو دانراوە، بەلام داخەکەم خەریکە ژەنگ دایدەرزێنێت و لەناوی دەبات. دەبوو چوارچێوەی شووشەی بۆ دروستبکرایە و بە مادەی دژە ژەنگ و ئەوەی پێویستە بۆی دابینکرایە. کەچی ئەوە سەرما و گەرما و باران لەناوی دەبات. خۆزگە بەرپرسان نەیهانهێشتایە بەو دەردە بچێت

سەلاح سالار

هەڵەبجە نیوز
لەهەڵەبجەدەردەچێت
ساڵی یەکەم ژمارە(١٢)کانونی دووەمی ٢٠١٧
موبایل:٠٧٥٠٨٣٥٤٦٠٦
فەیسبوک :هەڵەبجەنیوزحلبجە نیوز

دوالاپەرە

شەوێ پیاوێ لەبەفرا ما نەمرد
ئاگرێکی دووری دی
لەلای من نائومێدي کوفره
ئەی ئەم ئاگرەی دڵم بۆ کێ؟

پیرەمێرد

# کاک سەیفەدین،رۆح سوک و ژینگەپارێز

لەئەکاونتی بەهادین غەریب-ەوە وەرگیراوە

# شەن یان شیواندن؟

•هەرچی رۆژنامە و سایتە، چەند نووسەرێکی خۆیانەی خۆیان تاپۆیان کردووە، جگە لە پێنج شەش دەم وچاوێک نەبێت، کەسی کە بۆی نییە، یا نایبینم نووسراوێکی تێدا بڵاوبکەنەوە. لە هەفتەنامەی گەرەک و شار دەچن،،،،.

•میدیای حیزب، ئەو دیاردەیەی کە میدیای کوردستانی هەڵوەشاندووە. ئەوەشی خۆی بە سەربەخۆ و بێلایەن ئەزانێت، لە حیزبییەکان زیاتر پڕەنسیب و سانسۆریان بۆ دلنەوایی هەندێک حیزبی دیکە، داناوە،،.

•دوای داخستنی زیاتر لە ٥٠٠ دەزگا و کەناڵی ڕاگەیاندن لە تورکیا، کەچی (ڕوداو) لە هۆتێل و سیستەمی کابلی تەلەفزیۆنیی شوینە گشتییەکانی تورکیا، کەناڵەکەیان هەر هەیە و هەر ماوە!.

•ڕێنووسی کوردی، جگە لە سۆسیال میدیا، لە میدیای فەرمییش، وا وێران بووە، کە لە زمانی (دیوانی)نووسینەوە بووە بە زمانی کوچەوبازاڕ.

•بەلارێبردن، درۆودەلەسە، شێواندن، گومراکردن و هەڵتەکاندنی ئاوەز و هۆشی تاکی کورد، بە ئاشکرا لە هەواڵ و پرۆگرامەکانی میدیای کوردیدا هەستی پێئەکرێت.

•زنجیرە دراما دۆبلاجکراوەکانی تورکی، وا لە بینەری ئەکات کە خیانەت، درۆ، ناپاکی، بێ وەفایی، پارەپەرستی، زۆڵخستنەوە و بێ متمانەیی،،، کارێکی ئاساییە لە ناو خیزان و کۆمەڵگادا. وە جگە لەو پەیامە هیچ فەلسەفەیەکی دیکەی بە دیاری پێ نییە. بەڕای من بە پلانەوە بۆ هەڵتەکاندنی خێزان و کۆمەڵگەی کوردی پەخش ئەکرێت.

•لە کوردستان هیچ دەزگایەکی فەرمی باوەڕپێکراوی میدیا نییە، کە خوێنەر و بینەر و بیسەری کورد، پشتی پێ ببەستیت بۆ وەرگرتنی هەواڵ و ڕوداوەکان، هەریەکە بە بای خۆی شەن ئەکات.

• دەزگایەکی نیشتمانیی بۆ کۆنترۆڵ و چاودێری میدیای کوردی بە هەموو بەشەکانییەوە نییە، بە تایبەتی شیواو و نەشیاویی بەرنامەکان بۆ منال و خیزان و کۆمەڵگە.

•نە لە پەرلەمان و نە لە دەزگا حکومی و نە لە لێدوانە فەرمییەکاندا، زمانیکی نووسین (ستاندار) بەکار نایەت، واتە زمانی ئاخافتنی ناوچەیی و کوچە و بازاڕی، ئەوانیشی گرتوەتەوە، کە مایەی شەرمە لە ئاستە گەورەکانیشدا وا بەو ڕیتم و ئەکسێنت و فۆرمە ئاخافتن بکرێت.

•جاران کۆڕی زانیاری کورد، وشە داتاشینی بۆ وشەی نوێ و نامۆکان ئەکرد، لە لایەن ڕۆشنبیران و نووسەران و خەڵکیش، پەسەند ئەکرا. بەلام بە داخەوە ئێستا نەک هەر دەزگایەکی وشەسازی و داڕشتنی زمانەوانی نییە، بەڵکو هەڵە گەورەکان لە لایەن گەورەکانەوە ئەکرێت.

•زمان و موزیک، ئەدەب و هونەر، موڵکی نەتەوەن، ئەرکی سەرشانی تاک و کۆی کوردە کە بیپارێزێت و پەرەی پێبدات،،،. حیزب و هێزی سیاسی مافی شێواندنیانی نییە، چونکە دەسەڵات و حیزبی سیاسی ماوەیین، بەلام نەتەوە هاتاهەتاییە.

**دانا هەڵەبجەیی**

# گفتوگۆی ماستەرنامەیەك لەسەر دابەشبونی خزمەتگوزاریی فێرکاری لە پارێزگای هەڵەبجە

ڕۆژی چوارشەممە ٢١/١٢/٢٠١٦ لە هۆڵی بابان لە کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان لەزانکۆی سلێمانی گفتوگۆی نامەی ماستەری خوێندکار (هەردی عبدالرحمن حمە علی) لە بەشی جوگرافیا بە ناونیشانی (دابەشبونی خزمەتگوزاریی فێرکاری لە پارێزگای هەڵەبجە) ئەنجامدرا، پاش گفتوگۆیەکی زانستی ورد لەلایەن لیژنەی گفتوگۆوە نامەکە ، بە پلەیەکی باش وەرگیرا.



لیژنەی گفتوگۆ لەم بەڕێزانە پێکهاتبوون:

١- پ.ی.د شیروان عومەر رەشید سەرۆکی لیژنە
٢- پ.ی.د کامەران گاهر سعید ئەندام
٣- د. رۆستەم سەلام عەزیز ئەندام
٤- پ.ی.د. نیان علی حسین ئەندام و سەرپەرشتیار

بایەخ بە کاروباری پارێزگای هەڵەبجە دەدات
ژمارە(١٣و١٤)
١٦ی ئازاری ٢٠١٧
خاوەن ئیمتیاز وسەرنوسەر
سەلاح سەعید ئامین

# هەڵەبجە نیوز
Halabja News

# هەڵەبجە دەبێتە حکومەت

## لقی هەڵەبجەی سەندیکای رۆژنامەنوسانی کوردستان کرایەوە

هەڵەبجە نیوز

لەچوارچێوەی پەیرەو و پرۆگرامی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان و وەک ئەرکی سەرشانی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان، ١ی٣ی٢٠١٧ لقی هەڵەبجەی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان کرایەوە. لەم قۆناغەی ئێستادا نوێنەری پارتە سیاسیەکان دەبیەن بەڕێوە و ئیبراهیم هەورامانی بە سکرتێری لق هەڵبژێردرا تا کاتی بەستنی کۆنگرەکردنەوەی ئەم لقە دوای بەپارێزگابونی هەڵەبجە دراو لەچوارچێوەی پەیرەوەی ناوخۆی سەندیکادایە .هەڵەبجەنیوز پیرۆزبایی کردنەوەی لقی هەڵەبجەی سەندیکای رۆژنامەنوسان دەکات و هیوا دەخوازێت هەنگاوێک بێت بەئاراستەی خزمەتکردنی بزاوتی رۆژنامەگەری لەناوچەکەدا و ماڵێک بێت بۆ تەواوی رۆژنامەنوسانی شارەکە.

## پارتەسیاسیەکان لەهەڵەبجە رێکدەکەون

هەڵەبجەنیوز سەرچاوەکان

رێککەوتنەکە دوای کۆبونەوەی لایەنەکان هات لەبارەگای بزوتنەوەی ئیسلامی کە ٤١ یەکەمین کۆبونەوە بوو لەدوای سێ ساڵ لە بریاری بە پارێزگابونی هەڵەبجە. لە رێککەوتنەکەدا بزوتنەوەی ئیسلامی پۆستێکی بەڕێوەبەری گشتی بەخشی لەپێناو رێککەوتنی لایەنەکان. بەپێی رێککەوتنەکە، یەکێتی شەش کورسیی لە ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە دەبێت لەگەڵ چوار بەڕێوەبەری گشتی، هەروەها گۆران پێنج کورسی دەبێت لەگەڵ سێ بەڕێوەبەری گشتی، لیستی خزمەت الئومەل و یەکگرتووا حەوت کورسی ئەنجومەن و چوار بەڕێوەبەری گشتی، پارتی سێ کورسی و سێ بەڕێوەبەری گشتی، بزوتنەوە دوو کورسی ئەنجومەن بەبێ هیچ بەڕێوەبەرایەتیەکی گشتی، لیستی هاوپەیمانی الشیوعی و سۆسیالیستدا یەک کورسی ئەنجومەن، کۆتاکان یەک کورسی ئەنجومەن کە بۆ کاکەییەکان دانراوە.لایەنە سیاسییەکان دوای کۆبونەوەکە لە راگەیەنراوێکی هاوبەشدا رایانگەیاند، لەسەر پێکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە گەیشتونەتە «رێککەوتنی مێژوویی و جیاوازییەکانیان تێپەڕاندوە»،هەروەها سوپاسی بزوتنەوەی ئیسلامیان کرد کە «رۆڵی یەکلاکەرەوە» هەبووە لە رێککەوتنەکەدا.لایەنە سیاسییەکان هەروەها داوایان لە ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان کرد کە بریاری پێکهێنانی ئەنجومەنەکە بدات بە جۆرێک کە لە ١٦ ی ٣ ی ئەمساڵ یەکەمین بکرێتەوە.

## کتێبخانەی بیارە سەرچاوەی پێویستی تێدا نییە

کتێبخانەی بیارە، تاکە کتێبخانەی ناوچەی هەورامانە، کە دەکەوێتە شارەدێی بیارە، بەڵام کەمی سەرچاوە و کەمی کاتی کردنەوەی کتێبخانەکە، ئاستەنگی لەبەردەم خوێنەراندا دروستکردووە و بەو هۆیەشەوە کەمترین کەس رووی تێدەکات.

بارودەر عەلی، گەنجێکی ناوچەی هەورامان و دەرچووی قۆناغی ١٢ی ئامادەیی لەبارەی گرنگی کتێبخانە و گرفتەکانی کتێبخانەی بیارە بۆ رۆژنیوز وتی: هەبوونی کتێبخانە پێویستیەکی هەنوکەیی کۆمەڵگایە، چونکە لە ئەمڕۆدا کۆمەڵگە بەوە دەناسرێتەوە، کە ئاستی رۆشنبیری و خوێندەوارییان لە چ ئاستێکدایە.

باوەڕ، ئاماژەی بۆ ئەوەشکرد، «هەبوونی کتێبخانەی بیارە بۆ چینی خوێندکاران زۆر پێویست و گرنگە بەتایبەت بۆ دەستخستنی سەرچاوە بۆ نوسینی لێکۆڵینەوەکانیان، بەڵام بەداخەوە کتێبخانەکە سەرچاوەی پێویستی تێدا نییە».

ئەم گەنجەی ناوچەی هەورامان، زیاتر قسەی لەسەر بابەتەکە کرد و وتی: بەداخەوە زۆرێک لە کتێبخانە حکومییەکان لە زۆربەی شاروشارۆچکەکان تەنها بۆ ئەوە کراونەتەوە کە کۆمەڵێک کەسیان بۆ دابمەزرێنرێت و مووچەی لەسەر وەربگرن، بەڵام لەناوەرۆکدا چەند گۆڤار و رۆژنامە و کتێبێک و سەرچاوەیەکی کۆنی تێدا دانراون هەر ئەوەش وایکردووە کە کەمترین کەس رووبان تێبکات

## ئاهەنگەکانی کیمیاباران هەفتەیەک ماتەمینیان راگەیاند

لەکاردبونەوەیەکدا ئاهەنگەکانی کیمیاباران،داوای بلاکردنی گۆرانی ئاهەنگەکانی کوردستانیان کردوبەیاننامەکیان بلاوکردەوە

محەمەدی مەلاکەریم کۆچی دوایکرد
ل.٢

ئێمە لە رۆژی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە دا
ل.٣

. هۆمۆ هۆمینی لۆپۆس امروف گورگی مرۆڤە)
ل.٦

# محەمەدی مەلاکەریم کۆچی دوایی کرد

خەندان

محەمەد مەلا کەریم نوسەرو کەسایەتی دیاری کوردستان بەرەبەیانی ئەمڕۆ و پاش چەند ساڵێک نەخۆشی لە سلێمانی گیانی لەدەستداو نیوەڕۆی ئەمڕۆش لە گۆڕستانی سەیوان بە خاک سپێردرا.کورێکی محەمەدی مەلا کەریم بەخەندانی راگەیاند، باوکی ماوەی پێنج ساڵە نەخۆش بوو،و سێ هەفتەشە هیچ قسەیەکی نەکردووەو دۆخی تەندروستی زۆر خراپ بوو.محەمەدی مەلا کەریم، کوڕی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسە، لە ١٤ی ئابی ١٩٣٦ لەناوچەی هەورامان لەدایک بووە. پاش خۆی دوو کوڕو کچی بەجێهێشت.محەمەدی مەلا کەریم سەرەتای خوێندنی لای باوکی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس دەستپێکردووە و ماوەی دوو ساڵیش لای مەلای گوندەکەیان خوێندنی ئاینی درێژپێداوە.دیار ئەجیب عەبدولکەریم مودەڕیس دوای بەخاکسپاردنی بەخاوی بنەماڵەی محەمەد مەلا کەریمەوە لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا رایگەیاند «محەمەد مەلا کەریم تەنها لەنێوە ئەرۆشتووە بەڵکو لەهەموو کورد رۆشتووە، ئەو دەستی لەهەموو بوارەکاندا دیاربوو، هیوادارین لەسەر رێچکەی ئەو بەردەوام بین».خوشکێکی محەمەدی مەلا کەریم لەکاتی ناشتنی تەرمەکەدا بە قوڕگی پڕ لە گریانەوە هاواریدەکرد «بەداخێکی سەختەوە کە من تۆ ناوا دەبینم، شەوان بەهۆی ئێش و ئازارەوە ئەدەخەوتی، تۆ برا گەورەمان بووی، لەجێگەی باوکمان بووی».

محەمەدی مەلا کەریم ماوەی چەند ساڵێک بوو توشی نەخۆشییەکی کوشندە ببوو، پاش چەند ساڵێک مانەوەی لەو دۆخەدا دواجار گیانی سپارد.مەلا عوزێر حافز کەسێکیکە لەهاورێکانی محەمەد مەلا کەریم لەکاتی بەرێکردنی تەرمەکەی لە مزگەوتەوە بۆ گۆڕستان بەخەندان-ی وت «مامۆستا مەلا محەمەد کەریم گەنجینەیەک بوو لەئەدەب دۆستی و فکری و سیاسی، هەر لەسەرەتای فاسکردنی و دوای تەواوکردنی خوێندن لای باوکی».

مەلا عوزێر پێش چەند مانگێک لە گیان لەدەستدانی سەردانی محەمەدی مەلا کەریمی کردووەو پێکەوە قسەیان کردووە.بینیم وەزعی زۆر خراپ بوو، من یەک دوو پرسیارم لێکرد، پێم وت کاک محەمەد ئەچی پەشیمانی کەلەجوابە بتکردایەو نەتکردووە، وتی ئەوەیان لێگەڕێ بۆ خۆم با هەر خۆم بیزانم»، مەلا عوزێر وایوت.

روونیشیکردەوە «پێم وت ئەگەر خودا توانات بداتێ و هەڵبستیتەوە چی دەکەیت، وتی ئەمجارە تەفسیرێکی قورئان دەکەم بەشێوەیەکی هاوچەرخ، بەڵام بەداخەوە ناواتەکەی نەهاتەدی».

پاش ئەوەی بەخێزانەوە روویانکردووەتە شاری سلێمانی، محەمەدی مەلا کەریم لای باوکی درێژەی بەخوێندن داوە تا گەیشتۆتە پلەی زانای ئاینی. بەهۆی بیری ئەتەوایەتی و نیشتمانپەروەری ئێکەلبوونی بەبواری سیاسی، توشی زیندانیکردن بووە.

مەلا عوزێر دەڵێت «بنەماڵەی محەمەدی مەلا کەریم و بنەماڵەکەی تۆشکی ئەدەب و زانستن، لەدەستدانی مامۆستا خەسارەتێکی گەورەیە ئەکوردو ئەدەبی کوردی».

«لەدوایین سەردانیدا پێی وتم ئێوەی مەلا رۆڵتان زۆر کاریگەرە ئەگەر بتانەوێت و پێی هەڵبستن، خەڵک گوێتان لێدەگرێت، ئەتوانن کۆمەڵگە بگۆڕن بەلام پێویستتان زانست و تەکنەلۆجیای سەردەم هەبەو دەتوانن سودی لێببین لەوتارەکانتاندا»، مەلا عوزێر وایوت.

محەمەدی مەلا کەریم ساڵی ١٩٥٣ بۆ ١٩٥٤ یەکێک بووە لە کەسە دیارەکانی جوڵانەوەی ئاشتی، ساڵی ١٩٥٤ لەلایەن حکومەتی شاشینی عێراقەوە ماوەیەک دەستگیرکراوە.

هەروەها یەکێک بووە لەدەستەی دامەزرێنەرانی یەکێتی قوتابیانی ئاینی وانا فەقێ، هەروەها دەستەی دامەزرێنەری گۆڤاری دەنگی فەقێ بووە، کەسانێکە لەشاری سلێمانی بەشێوەی دەستنوس دەردەکرا و چەند کۆپییەکی بۆ شارەکانی کەرکوک و هەولێر دەنێردرا، بەپێی ئینسکلۆپیدیای مێژووتامە.

مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم لەساڵی ١٩٤٩وە دەستی کردووە بەنوسینی بابەتەکانی و لەرۆژنامەی ئەدا لەشاری بەغدا بلاویکردوتەتەوە، هەروەها لەساڵی ١٩٥٢وە لەرۆژنامەی ژینا نوسینەکانی بلاوکردوتەوە.

لەودەمەوە لەنوسین و وەرگێڕان و لێکۆڵینەوە قوناغ بە قوناغ بەپێی گۆڕانکاری باری رامیاری و کۆمەلایەتی بەردەوام بوو.محەمەدی مەلا کەریم، ساڵی ١٩٥٦ یەکەمین کتێبی لەبواری رەخنەدا بەچاپ گەیاندوە، تەواوی ژیانی بەنوسین و خوێندنەوە بردۆتەسەر، بەدەیەها پەرتوکی بەنرخی لەبوارەکانی ئاینی و رامیاری و ئەتەوەیی و شیعر و ئەدەبدا پێشکەش بەخوێنەرانی کورد و کتێبخانەکانی کوردستان کردووە.

هاوشانی باوکی، چەندین لێکۆڵینەوە و شرۆڤەی بۆ گەورە شاعیرانی کورد لەوانە نالی، مەحوی، سالم، کوردی، وەفایی و چەندین شاعیری دیکەی کورد کردووە.

## بۆ یەکەمجار
# لەهەڵەبجە و خورماڵ و سیروان ترافیک لایت دادەنرێت

جیهاد هەورامی

بۆ یەکەمجار لەمێژووی خۆیدا، هەڵەبجە دەبێتە خاوەن سیستەمی ترافیک لایت و دەست کراوە بەجێبەجێ کردنی پرۆژەکە و بەڕێوەبەری هاتوچۆی هەڵەبجەش دەڵێت: دانانی ترافیک لایت ئەرکی کارمەندانی هاتوچۆ کەمتر دەکاتەوە.دوای دوو ساڵ بە پارێزگا بوون، شاری هەڵەبجە سیستەمی ترافیک لایتی بۆ دادەنرێت، لە ئێستاشدا دەستکراوە بەجێبەجێ کردنی پرۆژەکە، ئەوەش لە کاتێکدایە، لە

رابردوودا هاوڵاتیانی ئەو شارە چەندین جار داواکارییان بۆ ترافیک لایت خستبووەڕوو.یەکێک لەشۆفێرەکانی هەڵەبجە بەناوی بەرهەم کامل، لەسەر دانانی ترافیک لایت بۆ شارەکەیان بۆ رۆژنیوز دواو وتی:«دەبوو ئەم پرۆژەیە پێشتر دابنرایە، چونکە پێویستیەکی گرنگە بۆ شۆفێران و هاوڵاتیانی شاری هەڵەبجە و کارئاسانییە بۆ بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی پارێزگاکە».

بەرهەم کامل، وتیشی:«لەئێستاشدا کە دەست کراوە بەدانانی ترافیک لایتەکان، پێویستە شۆفێران و هاوڵاتیان بەگشتی پابەندی رێنماییەکانی تایبەت بە سیستەمی ترافیک لایت بن، کە شێوازێکی ستاندارد و یاساییە بۆ بەرژەوەندی خۆیان و پاراستنی سەلامەتی هاوڵاتیان لەکاتی پەڕینەوەیان».لای خۆشیەوە بەڕێوەبەری هاتووچۆی هەڵەبجە فازیل حەمەئەمین، باسی لەگرنگی و چۆنیەتی دانانی سیستەمی ترافیک لایتی بۆ رۆژنیوز کردو وتی:«پاش ئەوەی لەساڵی ٢٠١٤ لەیەکەمین هەنگاومانداا هەوڵی دانانی ترافیک لایتمان دا بۆ پارێزگای هەڵەبجە و بڕیاردرا کە پێنج ترافیک لایت بۆ ناو شاری هەڵەبجە دابنرێت، بەڵام دواتر بەهەوڵی بریکاری وەزیری ناوخۆ

خۆشبەختانە ئەو رێژەیە زیاتر بوو بۆ حەوت دانە، کە پێنجیان بۆ ناو شاری هەڵەبجە و شارەدێکانی سیروان و خورماڵیش یەکی یەک دانەیان بۆ دادەنرێت».فازیل حەمەئەمین، ئاماژەی بەوەشدا:«لە ئێستادا پرۆژەکە کەوتوەتە بواری جێبەجێ کردنەوەو ئەگەر رەوشی کەشوهەوا باش بێت بەزووترین کات و لە ماوەی کەمتر لە سێ مانگێتردا ئەو پرۆژەیە تەواو دەکرێت و بڕی تێچوونەکەشی نزیکەی ٥٠٠ ملیۆن دیناری عێراقیە».

# قایمقامی پێشووتری هەڵەبجە کۆچی دوایی کرد

کەناڵی ئاسمانی پەیام

رۆژی ٨ی٢ی٢٠١٧ قایمقامی پێشووتری هەڵەبجەی شەهید کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا جەمیل عەبدولرەحمان کەسایەتی ئیسلامی دیاری هەڵەبجە و شارەزوور رۆژی رابردوو لە تەمەنی (٦٣) ساڵیدا و بەهۆی نەخۆشیی شێرپەنجەوە گیانی لەدەستدا.

مامۆستا جەمیل لە ساڵی ١٩٨٨ەوە پەیوەندی بە بزووتنەوەی ئیسلامییەوە کردووەو لەنێوان ساڵانی ١٩٩٦-٢٠٠٦ قایمقامی هەڵەبجە بووە.

# چیرۆکی ئێمە لە ١٦ ی ٣ ی ساڵی ١٩٨٨ دا

هیوا موحەممەد کەریم



کات نزیکی نیوەڕۆ بوو دەنگی تۆپ و تەیارەکان کەم کەمێک دەهات لەناوشاری هەڵەبجەدا، ماڵی خاڵە حاجی محمد (خوا لەگوناهەکانی خۆش بێت کە ئێستە لەژیاندا نەماوە) بەباوکمی ووت محمد منداڵەکان ئامادە بکە بابچین بۆ دەرەوەی هەڵەبجە لە غابەکەکە بژین لەم وەزعە بەرەو کوێ دەڕوات، چونکە دەنگوو باسێک بڵاوە دەڵێن حکومەتی بەعس لەوانەیە کیمیابی بڕێژێت.

ئێمەش خۆمان کۆکردەوە پێکەوە لەگەڵ ماڵی ئەوان و ماڵی خاڵە حاجی (محمد ئاسراو بە ئەحمەدی موزەعیدا و ماڵی کاک علی ( کەدەکاتە هاوسەری پورە سۆزیە) بەرێکەوتین بۆ غابەکەی دەوری هەڵەبجە لەوێوە سەیری ناو هەڵەبجەمان دەکرد، بە ئاشکراو ڕوونی دیمەنی تۆپ باران و تەیارەکەکانمان دەدی کە لە شاری هەڵەبجەی دەدا دوکەڵێکی ڕەشی ئاسایی دەکرد، بەڵام پاش ماوەیەکی تر هەستمان کرد کە ڕەنگی دوکەڵەکە گۆڕا بۆ ڕەنگێکی سپی تۆخی زۆرتر کە ئاسایی نەبوو وەک ئەوانی پێشووتر، ئەوکات زانیمان کە کیمیابی ڕژاوە بەسەر شارداو هەمان کاتدا گوێمان لە پاسداری ئێرانی بوو کە دەیان ووت شیمیایی زەدە، واتە کیمیابی وەشێنراوە.

ماوەیەک پێش ڕۆژی کیمیابیەکە دایک و باوک و براکەم گەڕابوونەوە بۆ ناو شار بە مەبەستی هێنانی ئەو ئەسکەرەو ئەوراقانەی کەئامادەمان کردبوو لەگەڵ خۆمان بیبەین پێشتر ، بەڵام لەبەر بەپەلە دەرچوون ئەمان بردبوو.

بۆیە ئێمە بەناچاری لەگەڵ خزمانمدا لە گوندی چاووگ و باوەکۆچەکەوە بەرێکەوتین بەرەو سنووری ئێران، من ئەو کات تەمەنم ١٠ ساڵ دەبوو، گەورەی هەموو منداڵەکانی تر بووم کە ژمارەمان ٧ منداڵ بوو، ئەنکیشم لەگەڵمان دەژیاو ئەویشمان لەگەڵ بوو هەموومان بەو شەوە بەرێکەوتین بەرەو سنووری ئێران بەبێ دایک و باوک و براکەم کە لە کاتی کیمیابیەکەدا گەڕابوونەوە بۆ ناوشار...

بەرێکەوتین بەو شەوە، منداڵێکی دووساڵانەی کێش قورسم بە کۆڵەوە بوو ، کە خۆم تەمەنم تەنها ١٠ ساڵ دەبوو، ئەنکیشم یەکێک لە منداڵەکان و کاک ڕفیق عەلیش ئەوانی تریان بە یەکێکیانی هەڵگرتبوو، ئەو شەوە شەوێک بوو نازانم چۆن چۆنی باس کەم نازانم چۆن بۆتان وێنا بکەم، بەڵام ئەوەندە دەڵێم شەوێک بوو وێنەی حەشر چۆنە وابوو ، گریانی منداڵ و ناڵەی پیرەکان و دەنگی قرقەی جەنگی هەمووی تێکەڵ بوو بوو لەگەڵ یەکدا.

بەهەرحاڵ هەر دەڕۆشتین ڕێگە تەواو نەدەبوو سەعاتێک ، دووسەعات ، سێ سەعات ، چوار، پێنج، قرقەکەش بە ڕاسەرمانەوە بوو دەنگ و ناڵەو شریخەی ئەوەندەی تر بارودۆخەکەی ترسناک کردبوو...

لەرێگەدا گوێم لە خزمانم بوو لەنێو خۆیانداو بەتەپێنی دەیانووت بەخوا لەوانەیە محمدو نەسرین ووریا، کیمیابیەکە کوشتبێتی کەمەبەستیان باوکو دایک و براکەی من بوو، چونکە ڕێک لەوکاتەدا ئەوان گەڕابوونەوە بۆ ناو شار کە کیمیابیەکە دابووی لە هەڵەبجە.

منیش کە گوێم لەم باس و خواسەیان بوو هەردوو لەژنۆم شکابوو، ئاو لە چاوە ماندووەکانمدا قەتیس مابوو بە منداڵێکی دووساڵەی کێش قورسەوە کە هەڵم گرتبوو بە کۆڵ، توانای هەنگاو نانیشم نەمابوو...

بەڵام چاریش نەبوو هەر دەبوایە ڕێت بکردایە، چونکە گەڕانەوەو وەستان مردنی لە دوا بوو، ڕۆشتنیش پشت شکان و مردنێکی تر بوو بۆمن چونکە کۆڵەکەم تەواو تەواو قورس بوو...

هەر ئاو ئاناوێک پرسیارم لە خاڵە حاجی محمد دەکرد ئۆردوگاکە(؟) ئەوەی پر نوربێت ! ئەمووت خاڵە زۆرمان ماوە، ئەویش دەیووت تا هیوا گیان کەمێکی تر دەگەین ، لەبەر مەعنەویات و هاندانی من وای دەووت، ئەگینا زۆرمان مابوو..

لەرێگەدا کە دەڕۆشتین من هەر دڵم لای دایک و باوک و ئەو برایەم بوو کە گەڕابوونەوە بۆ ناو شار، لەبەر ناڕەحەتی و تاریکی ڕێگەو ماندوێتی زۆر و قەرەباڵغی ڕێگەکە پاش ماوەیەک لە ڕۆشتن خوشکێکمان لێ وون بوو، کە ئەمن بچوکتر بوو، ئەوەش کارەساتێکی تری گەورە بۆم، چار نەبوو دەبوایە هەر ڕێت بکردایە.

ڕۆشتین ڕۆشتین ،،،، ماوەیەکی تر لە پاش ڕۆشتن لەبەر تاریکی و قەرەباڵغی ڕێگاکە برایەکی ترمان لێ وون بوو کە ناوی ئاوات بوو...

کارەسات لەدوای کارەسات بۆ من زیاد دەبوو، چونکە لەهەموو منداڵەکانی تر گەورەتربووم ، وەئەنکیشم پیر بوو بوو، کەمتر ئاگری مابوو، خوا لە گوناهی خۆش بێت..

لە کاتژمێر نزیکی ٣ و ٤ ی بەیانیدا بوو پاش برینی ڕێگەیەکی زۆری ئاقەت پڕوکێن، لە جێگایەک کە ئێستە ناوی بیرم نەماوە کوێ بوو، بە دایک و باوک و براکەم گەشتینەوە، ڕاستە هەم بۆ من و ئەوانیش ناڕاحەتیەک و دڵخۆش بونێک بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا کە هەواڵی توانای برام و خوشکم و چۆنی خوشکمیان پرسی، ووتمان وون بوون، لە ئێمە دابڕاون و دیار نەماون ، ئیتر دایک و باوکم تووڕەیان لێ برا بوو ، دایکم لەبەر خۆیەوە دەیگوت ڕۆڵەکانم خۆزگە ئێستە بەم سەرمایە لە بن چ بەردێکدا لەسەرما ڕەق بووبنەوە، باوکیشم لەم دۆڵ و شاخ و گردی بوو ڕای دەکردو فرمێسک لە چاوەکانی دەهاتە خوارێ و بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد ئاوات گیان... چنووووووور گیان لەکوێن ئێوە،،،،

شتی زیاتری دەووت لەبەر خۆیەوە.

ئەم دیمەنانە بۆ منێکی منداڵ، لەو کاتەدا سەرگەشتەییەکی قورس و جەرگ بڕ بوو، خەریک بوو دڵم لەت لەت دەبوو بۆ ئەو هەموو دیمەنانە کە بە ووشە ناسرێن..

بەڵام پاشینیەک بۆ من لەوەدا بوو کە کاتێ ئەوان گەشتن بە ئێمە، ئەو منداڵە دوو ساڵەی بە کۆڵمەوە بوو گۆڕرا بۆ منداڵێکی یەک ساڵانەی تر کە لەو بچوکترو سوکتر بوو، کەوام دەزانی دوو کیلۆم هەڵگرتووە لە چاو ئەوی تریاندا..

هەرچەند کە منداڵەکەی ترم لە کۆڵ دابگرت لەو کاتەدا پشتم تەواو چەمیبووەوەو توانای ڕاست کردنەوەیم نەبوو تا ماوەیەکی زۆر..

خولاسەی کەلام ، ئەمان توانی ئەو براو خوشکەم بدۆزینەوە، ئەوانەمان کە پێکەوە بووین لە شوێنێک کە پێی دەڵێن (دەوەرە ) بەرێ کەوتین بەرەو ڕوباری سیروان ، بۆ ئەوەی بپەڕینەوە بۆ خاکی ئێران، کاتێ گەشتینە لای بەلەمی ئێرانییەکان بۆ پەڕینەوە بە ڕوباری سیرواندا لەوێ هەندێکمان بە بەلەمێک ڕۆشتین کە پێکهاتبووین لە من و ئەنکم و دوو خوشکی بچوکم ، ئێمەیان زووتر پەڕاندەوە بۆ ئەو بەر ڕوبارەکە، لەوێوە ماوەیەکی تر بە پێ ڕۆشتین تا گەشتینە سەیارەی ئێرانییەکان کە پێیان دەووتن تونوبوس، ئێمەیان سواری ئەو پاسانە کردوو بەرەو شاری کەنگاوەریان بردین، بەڵام بەداخەوە جارێکی تر ئێمە توشی لێکدابڕانێکی تر بووین لە دایکم و باوکم و ووریای برام ، چونکە ئەوان سواری پاسێک کرابوون کە بەرەو شاری سونقورد برابوون، واتە ئێمە بووین بە چوار بەشی ڕێگەوە، ئیتر منیش ئەم دەزانی خەفەت بۆ کامیان بخۆم ...

زۆر جار دەڵێم ئەو شەوە هەر تاڵێکی خەڵکی هەڵەبجە بگرێت، بەقەدەر ماندوو بونی زۆربەی سیاسیەکان ماندوو شەکەت بووبوین.

خوایە ئیتر هیچ کەسی تر دەربەدەری لێ قەوماتێکی تر نەبینێت، چونکە تاڵاوی زۆرمان چەشت..

کۆتایی بەشی یەکەم

# خوێندەواری نیە
# مایجەمین، ٤٦ ساڵەچارەسەری نەخۆشیەکانی ژنان و منالان دەکات

ڕۆژنیوز – جیهاد هەورامی

ژنێکی هەڵەبجەیی ماوەی ٤٦ ساڵ دەبێت بە مۆڵەتی فەرمی لە ڕێگای گیای سروشتیەوە چارەسەری ئەو نەخۆشانە دەکات، کە سەردانی دەکەن.

مایجەمین سان ئەحمەد، ئەو ژنە نەخوێندەوارە تەمەن ٦٨ ساڵەی شاری هەڵەبجەیە، کە ماوەی ٢٢ ساڵی لەڕێگای گیای سروشتیەوە چارەسەری نەخۆش دەکات و بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش مۆڵەتی فەرمی لەلایەن حکومەتەوە پێدراوە.

مایجەمین سان ئەحمەد، بۆ ڕۆژنیوز باسی لە ئەزموونی کاری خۆی چۆنێتی فێربوونی چارەسەرکردن کرد و وتی: دایکم هەمان ئەم کارەی دەکرد و منیش لەبەردەستیدا توانیم ئەو شارەزاییە وەربگرم و لە تەمەنی ٢٢ ساڵیشەوە دەستمکردووە بە چارەسەرکردن و دوای تێپەربوونی نزیکەی ١٠ ساڵ ناوبانگم پەیدا کرد.

سەبارەت بە چۆنیەتی چارەسەرەکان، مایجەمین، وتی: «لەڕێگەی گیای سروشتی و کوردەواری چارەسەری نەخۆشییەکانی نەزۆکی ژنان و سکچوونی منالان و سووتانەوە و ملهەسیری دەکەم و ئێستاش ڕۆژانە نزیکەی بیست نەخۆش سەردانم دەکەن بەمەبەستی چارەسەر وەرگرتن».

مایجەمین، وەک خۆی دەڵێت، جگە لە سنووری هەڵەبجە نەخۆش لە شار و شۆچکەکانی تری هەرێمی کوردستان و ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشەوە سەردانی دەکەن.

سەبارەت بە ڕێگەپێدان و مۆڵەتی کارکردن لەلایەن وەزارەتی تەندروستی یەوە و هەماهەنگی لەگەڵ پزیشکەکانی شارەکە، مایجەمین سان ئەحمەد، وتی: «زۆرێک لەپزیشکەکان کۆبوونەوەم لەگەڵ دەکەن و ڕێنمایی یەکتر دەکەین.

تائێستاش هیچ ڕێگریەکم لێ نەکراوە و مۆڵەتی فەرمی کارکردنم هەیە».

هەرچەندە، ناوبراو خوێندەواریشی نییە، بەڵام وەک خۆی دەڵێت: «چەندین بڕوانامەم لە بواری پزیشکی پێ بەخشراوە لە هەولێر و سلێمانی و هەڵەبجە و نازەربایجانی ڕۆژهەڵات لە وڵاتی ئێران».

سەبارەت بە شوێنی کارکردنەکەشی، مایجەمین، وتی: «تەنیا لەماڵەکەی خۆم خەریکی چارەسەر کردن و بینینی نەخۆشەکانم و شوێنێکی تایبەتم نییە لە دەرەوەی ماڵەکەم.

لە کۆتایی قسەکانیدا، مایجەمین سان ئەحمەد، خۆشحاڵی نیشاندا بەوەی، کە یەکێک لە چوار کچەکەی لە بەردەستیدا کاردەکات وتازەیەک فێری چۆنیەتی چارەسەرکردنی نەخۆش بووە و وتی: «هەوڵ دەدەم بەتەواوەتی ئەم بوارە پێی بگەیەنم، بۆ ئەوەی لە دوارۆژ وەک خۆم ببێتە چارەسەرکارێکی لێهاتوو».

# قەیرانی دارایی بازاری خواردنگەوکەبابخانەکانی هەورامانی سست کردوە

هاوکار و جیهاد

بەمەبەستی دابینکردنی بژێوی ژیان و ئاسانکاری زیاتر بۆ گەشتیاران، ژمارەیەک چێشتخانە و کەبابخانە لەسەر ڕێگە سەرەکیەکانی ناوچەی هەورامان دروستکراون، بەڵام خاوەنەکانیان ئاماژە بە کەمبوونەوەی بازار دەکەن و گەشتیارانیش گرفتی نەبوونی شوێنی مانەوەیان هەیە.

ناوچەی هەورامان بەهۆی هەبوونی سروشتێکی جوان و لەبارەی کەشوهەواکەیەوە، ساڵانە بە هەزاران گەشتیاری ناوخۆیی و بیانی سەردانی دەکەن، بۆ ئەو مەبەستەش زیاتر لە ١٠ چێشتخانەو کەبابخانە لەسەر ڕێگە سەرەکیەکانی هەورامان دروستکراون، بەڵام هیچ ئوتێلێک بۆ مانەوەی گەشتیاران بوونی نیە.

بێساران حەمەرەحیم، خاوەنی یەکێک لە چێشتخانە و کەبابخانەکانی سەر ڕێگای بیارە – تەوێڵە بۆ ڕۆژنیوز ئەوەی خستە ڕوو: کردنەوەی چێشتخانە و کەبابخانەکان لەسەر ئەم ڕێگا سەرەکیانە گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە، چونکە سەرەڕای ئەوەی بوونەتە هۆکارێک بۆ بەدەستهێنانی بژێوی بە دەیان خێزان لە هەمان کاتیشدا ئاسانکاریەکی زۆریان بۆ گەشتیاران کردووە و هۆکاریشیش بوون بۆ ڕاکێشانی گەشتیاری زیاتر.

بێساران حەمەرەحیم، وتیشی: ئەو گەشتیارانەی کە لە شوێنە دوورەکانی وەک هەولێرو دهۆک و پارێزگاکانی تری عێراقەوە دێنە ناوچەکە ناچارن کە ڕوبکەنە ئەم چێشتخانەو کەبابخانانە، بەڵام نزیکەی ساڵێکە تێبینی ئەوەمان کردووە کە بەهۆی قەیرانی دارایی و پێنەدانی موچەوە لەکاتی خۆیدا ژمارەی ئەو کەسانە کەمی کردووە، کە پێش قەیرانی دارایی دەهاتن لە چێشتخانە و کەبابخانەکان نانیان دەخوارد، هەر ئەوەش وایکردووە کە ژمارەیەک لەو چێشتخانەو کەبابخانانە دابخەن بەتایبەت ئەوانەی کە بەشێوەی کەپر دروستکراون و بینایان نەبوو.

ئەو خاوەن چێشتخانەیە، وتیشی: «ئەو لیژنە تەندروستیانەی کە سەرپەرشتی چێشتخانە و کەبابخانەکانی ناوشار دەکەن، بەهەمان شێوە سەردانی ئێمەش دەکەن مەرجی تەندروستیمان بۆ شێوازی کارکردنمان داناوین».

لەسەر هەمان بابەت گەشتیارێک بەناوی هێمەت ئەکرەم، کە لە شاری هەولێرەوە هاتبوە ناوچەی هەورامان، بۆ ڕۆژنیوز وتی: ئەو چێشتخانە و کەبابخانانەی کە لەسەر ڕێگا سەرەکیەکانی ناوچەی هەورامان دروستکراون تا ڕادەیەکی باش کارئاسانییان بۆ گەشتیاران کردووە و توانیویانە خزمەت بە گەشتیار بکەن، بەڵام ئەوەی بوەتە گرفت بۆ ئێمەی گەشتیاران بەتایبەت ئەوانەی لە شارە دورەکانەوە دێن، ئەوەیە کە لە ناوچەکەدا هیچ هۆتێل و مۆتێلێک بوونی نیە و گەشتیاران ناتوانن شەو لەکوێ بمێننەوە.

هێمەت ئەکرەم، وتیشی: بە شێوەیەکی گشتی بەهۆی قەیرانی داراییەوە ڕێژەی هاتنی گەشتیار بۆ ناوچە گەشتیاریەکان ڕووی لەکەمی کردووە، چونکە من بۆخۆم سێ ساڵ بەر لە ئێستا سەردانی ناوچەی هەورامانم کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەبوونی هەر کێشەو گرفتێک هۆکار دەبێت بۆئەوەی کە هاتنی گەشتیاران کەمبکاتەوە بۆ ئەو ناوچەیە بەپێچەوانەشەوە هەبوونی ئاسانکاری و شوێنی مانەوە دەبێتە هۆی زیاترکردنی ڕێژەی هاتنی گەشتیار بۆناوچەکە.

ئەو گەشتیارە، ئەوەشی خستەڕوو: بۆئەوەی بتوانن ناوچە گەشتیاریەکانی هەورامان و شوێنەکانی تری کوردستان بەشێوەیەکی ستاندارد پێشوازی لە گەشتیار بکەن، دەبێت کاری زۆر لەوە زیاتریان تیادا بکرێت و حکومەت پرۆژەی ستراتیژیان تیادا ئەنجام بدات.

لای خۆشیەوە، ئەرکان حەمەصالح، خاوەنی یەکێکی تر لە کەبابخانەکانی هەورامان لە نزیک گوندی بەڵخە، بۆ ڕۆژنیوز وتی: «لە ئێستادا بازاری ئێمەش زۆر کەمی کردووە بە بەراورد بە ساڵانی ڕابردوو، چونکە ئەگەرچی گەشتیاریش دێنە ناوچەکە، بەڵام زۆربەی گەشتیاران خۆراک و پێداویستی لەگەڵ خۆیان دەهێنن و کەمتر ڕوو لە چێشتخانە و کەبابخانەکان دەکەن ئەوەش بەهۆی بەردەوامی قەیرانی دارایی و پێنەدانی موچەیە لەکاتی خۆیدا».

# ڕووبەری سەوزایی هەڵەبجە ڕوی لەکەمیکردوە

## شێوازی چاندنی ڕووبەری باخات لە ناحیەکانی سیروان و بیارە و ناو هەڵەبجە زیاتر تەقلیدییە

ڕاپۆرتی:
ڕێکخراوی ژینگەپارێزی هەڵەبجە

ئاو هەوا و کەش: کەش و هەوا ڕەگەزێکی گرنگی ژینگەیە وەك لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا. قەزای هەڵەبجە ئاو و هەوای دەریای ناوەڕاستی هەیە واتە زستانی سارد و باراناوی، هاوینی گەرم و ووشك (ئەم جۆرە ئاو و هەوایە بەشێکی زۆری قەزاکە دەگرێتەوە) بەڵام ئاو و هەوای مامناوەندی دەریای ناوەڕاست بەشێکی تری قەزاکە دەگرێتەوە (ئەوانیش شارۆچکەی تەوێڵە ناحیەی بیارە، ناحیەی خورماڵ). ئەم جۆرە ئاو و هەوای قەزایە وایکردووە جۆری ڕووەکی سروشتی کشتوکاڵ پشت بە بارانی زستان وبەهار ببەستێت. بری بارانی پێویست لە قەزاکە وایکردووە کە ڕووبەری سەوزایی فراوان بێت لە چاو ناوچەکانی تر، ئەمە جگە لە ناوچەی شلغاوی بوونی کە چەندین سەرچاوەی ئاوی گرنگی تێیە وەك: زەڵم، ئەحمەد ئاوا و سیروان و چەمی بیارە و ...

ئەم ساڵانەی دواییدا ڕووبەری سەوزایی ڕووی لە کەمی کردووە بە هۆی فاکتەرە سروشتی و مرۆییەکانەوە لەبەر ئەوەی ڕێژەی خۆڵبارین ڕووی لە زیادبوون کردووە وە ئەمەش کاریگەری نەرێنی (نێگەتیڤی) هەبووە لەسەر ڕووپۆشی ڕووەکی و ڕووبەری سەوزایی. سوتاندنی گژ و گیای باخ و باخات و ڕووەکی سروشتی چیاکان بەهەر هۆکارێك بێت (سیاسی و ... ) کاریگەری نەرێنی دەکەوێتەوە سەر کۆی گشتی سیستمی ژینگەیی قەزاکە.

هۆکاری مرۆیی کەمکردنەوەی ڕووبەری سەوزایی، ئەبوونی پلانێکی گشتی یە لە لایەن حکومەتەوە بۆ دابەشکردنی زەوی نیشتەجێ بوون بەسەر هاوڵاتیاندا بە پێی پلان، یان پێشوەخت بە پێی پلان زەوی دیاری بکرێت و بەشە پێداویستییەکانی تر دابەش ئەکرێت بۆ نیشتەجێبوون (شوێنی فوتبۆڵخانە پارك زەوی کشتوکاڵی، مزگەوت و ... ) یان ناشتن و دیاریکردنی شوێن بۆ ئەمام ناشتن وە جێ بە جێکردنی یاسا بۆ ڕواندنی درەخت لە ماڵاندا و دواتر چاودێری کردنیان.

دابەشبوونی ڕووبەری سەوزایی قەزای هەڵەبجە:

یەکەم / ناوچەی دارستان: بڵاو بوونەوەی دارستانی سروشتی لە قەزای هەڵەبجە دەگاتە نزیکەی ٧٦٢٣٦ دۆنم لە ناوچەی چیاکانی ڕۆژهەڵات و باشوور و باشووری ڕۆژهەڵات، بەڵام لە ئێستادا بە هۆی ئاگرکەوتنەوەی ئەم ساڵانەی دوایی ئەم ڕێژەیە کەمی کردووە.

دارستانی چڕ: ڕووبەرەکەی دەگاتە ٦.٨ کم دوجا، ئەمەش یەکسانە بە ٠.٩ ٪ ی کۆی گشتی ڕووبەری دارستانی قەزاکە.

دارستانی چڕی مامناوەند: چڕی دەگاتە ١٦٤.٧ کم دوجا وە ئەمەش یەکسانە بە ٨٦.٥ ٪ ڕووبەری گشتی دارستانی قەزاکە.

دارستانی کراوە (چڕی کەم): ئەمەش ڕووبەرەکەی دەگاتە ٢٤ کم دوجا وە بەرامبەرە بە ١٢.٦ ٪ کۆی گشتی دارستانی قەزاکە.

ناوچەی دارستانی بەروو: لە ناوچەی باشوور و ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵاتی قەزاکە بە شێوەی سروشتی بڵاوبووەتەوە وە ڕووبەری ٩٩.١ ٪ ی دارستانی گەڵا وەرێن پێك دەهێنێ بە گشت جۆرەکانیەوە.

ناوچەی دارستانی دۆڵ و ڕووبارەکان: ڕووبەرەکەی دەگاتە ٠.٨ ٪ ی کۆی گشتی دارستانی قەزاکە.

گژ و گیا (کورتە گیا): ڕووبەرەکەی دەگاتە ٣٣.٧ ٪ ی کۆی ڕووبەری قەزاکە.

کێشەکانی ڕووبەری سەوزایی لە قەزای هەڵەبجە لە دیدی ڕێکخراوی ژینگە پارێزی هەڵەبجەی شەهیدەوە

١- کەمی ڕواندنی ئەمام و چاودێری نەکردنی تەواویان لە لایەن دام و دەزگا حکومییەکان و هاوڵاتیانەوە. بۆ نموونە لە نووسراوێکی بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی هەڵەبجەدا کە بۆ ڕێکخراوی ژینگە پارێزی هەڵەبجە نێردراوە، هاتووە:

- ڕێژەی ئەمام ڕواندن لە ناحیەی سیروان لە ساڵی ٢٠١١، ١٤٠٠٠ ئەمام بووە بەڵام لە ساڵی ٢٠١٢ ئەم ڕێژەیە بووە بە ٨٠٠٠ ئەمام، ئەمە بۆ؟!
- هەروەها لە ناحیەی بیارە لە ساڵی ٢٠١١ ڕێژەی ئەمام ڕواندن ٢١٠٥ ئەمام بووە بەڵام لە ساڵی ٢٠١٢، (٤٤٥) ئەمام بوو، کە ئەم کەمکردنانە هەمووی جێی پرسیارە ؟!
- لە خشتەی لیستی ئەمام ڕواندنی فەرمانگەکانی حکومەت لە ناو هەڵەبجە و دەوروبەری لە وەرزی ٢٠١١ بۆ ٢٠١٢ بەو شێوەیەی کە پیشان دەدرێت: دەبینین کە ئەو لایەنانەی کە دەبێ گرنگی زیاتر بە ناشتنی ئەمام بدەن، بەداخەوە ئەوان لە هەموو زیاتر کەمتەرخەمن، کە نازانین هۆکارەکەی چییە.
- لە خشتەی لیژنەی پشکنینی کێڵگەیی بۆ تۆوی گەنمی باوەڕپێکراو لە جۆری ئاقاتنۆ کە لە ١٥/٥/٢٠١١ دەست بەکاربوون تا ١٥/٦/٢٠١١ کۆتایی بەکارەکانیان هات، ئەنجامەکەی بەم شێوەیە بوو کە ڕووبەری پشکێنراو ٣٣٩٠ دۆنم بوو، بەڵام ڕووبەری پەسەندکراوی ٣٦٠ دۆنم ە. ئەو ڕووبەرەکەی کە پەسەند نەکراوە هۆکارەکانی بۆ چی دەگەڕێتەوە، ئایا کەمتەرخەمی بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵ نییە لە ئاست کەرتی کشتوکاڵدا و چارەسەر نەکردنی کێشەکانی جووتیاران؟

یان لەهەمان خشتەدا ژمارەی جووتیاری پشکێنراو ٧٨ جووتیارە، بەڵام ژمارەی جووتیاری پەسەندکراو ١٨ جووتیار، کە ئەمەش هۆشیار نەکردنەوەی جووتیارانە بە کردنەوەی خولی فێربوون بۆیان لە لایەن بەڕ. کشتوکاڵی هەڵەبجەوە.

> **کەمی ڕواندنی ئەمام و چاودێری نەکردنی تەواویان لە لایەن دامو دەزگا حکومییەکان و هاوڵاتیانەوە،یەك لەکێشەکانی کەمی سەوزاییە لەهەڵەبجە**

- لە خشتەی باخداری گوندەکانی سنووری بەڕ.کشتوکاڵی هەڵەبجە هاتووە: کە شێوازی چاندنی ڕووبەری باخات لە ناحیەکانی سیروان و بیارە و ناو هەڵەبجە زیاتر تقلیدی بە تا ئەندازەیی، بەڵام لە ناحیەی خورماڵ شێوازی چاندنی ئەندازەیی زیاترە لە تقلیدی، ئەم شێوازی چاندنی تقلید بە کاریگەری هەیە لەسەر کەمکردنەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی دواجار کاریگەری بەسەر ژینگەوە هەیە. بۆیە بۆ زیاتر گرنگی دان و پەرەپێدانی کەرتی کشتوکاڵ لە سنوورەکەمان داوا لە بەڕ.کشتوکاڵی هەڵەبجە دەکەین کە کار لەسەر ئەم بوارە بکات و جووتیاران ناچار بکات کە شێوازی چاندنیان ئەندازەیی بێت.

چارەسەری کێشەکانی ڕووبەری سەوزایی لە دیدی ڕێکخراوی ژینگەپارێزی هەڵەبجەوە

لایەنی کەم ئەو کارانەی کە بۆ پاراستنی ڕووبەری سەوزایی دارستانەکان و لەوەڕگاکان دەتوانرێ جێ بە جێ بکرێت:

١- ناچارکردنی هاوڵاتیان و لایەنە پەیوەندیدارەکانی حکومەت بە دەرکردنی یاسایەك بۆ ناشتنی ئەمام بەڕێژەی پێویست لە وەرزی ئەمام ناشتن دا و هەروەها چاودێریکردنیان لە لایەن لیژنەیەکەوە کە قائیمقامی شار دەتوانێت سەرپەرشتی ئەو لیژنەیە بکات.

٢- بۆ پاراستنی دارستانەکان و درەختەکان دەبێ زانیارییەکانی خۆمان سەبارەت بە سوودەکانی ئەوان لە ڕێگە جۆر بە جۆرەکانەوە زیاد بکەین و زانیارییە بەدەستهاتووەکان بۆ کەسانی تر بگوازینەوە. تێگەیشتن لە پێویست بوونی درەخت و ڕۆڵی بەرچاوی لە ژیانی مرۆڤ و زیندەوەرانی دیکە گەورەترین فاکتەری پاراستنی ئەم بوونەوەرە بە سوودە دەبێت.

٣- دابین کردنی سەتڵی خۆڵ و خاشاك لە سەیرانگاکان و شوێنە سەوزاییەکاندا بە مەبەستی پیس نەبوونی ڕووبەری سەوزایی.

٤- دابین کردنی بودجەی تایبەت بۆ ڕووبەری سەوزایی بە پێی پێویست لە لایەن پەرلەمانی کوردستانەوە بە مەبەستی داڕشتن و جێ بە جێکردنی پلانی سەوزایی لە شار.

٥- ناشتنی جۆرە جیاوازەکانی دار و درەخت بەمەبەستی جوانتر کردن و زیاتر پاككردنەوەی هەوای شار.

٦- کردنەوەی خولی فێربوون و هۆشیار کردنەوەی جووتیارانی سنوورەکە بەمەبەستی باشترکردنی کەرتی کشتوکاڵ.

٧- دابین کردنی ئاوی پێویست لە کاتی خۆیدا بۆ ئەمامەکانی ناوشار و پاك کردنەوەی بنی ئەمامەکان.

٨- ئاگرکەوتنەوە لە دارستان یەکێکە لە هۆکارەکانی لە ناوبردنی دارستانە سروشتی و دەستکردەکان، لەبەر ئەوە پێویستە هاوڵاتیان هۆشیاربن و دوای تێپەڕبوونی کاتی حەسانەوە و سەیرانکردن لە شوێنە سەوزاییەکان، دڵنیابن لە کوژانەوەی ئاگرەکان. هەروەها ئامێرەکانی ئاگرکوژێنەوە زیاتر بۆ بنکەکانی ئاگرکوژێنەوە دابین بکرێن، تیمەکانی ئاگرکوژێنەوەش پێویستە لە وەرزی ئاگرکەوتنەوەی دارستان و لەوەڕگاکاندا زیاتر و باشتر خۆیان ئامادە بکەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەر ئاگرێك.

٩- ڕێکخستنی خێزان و ڕێگری لە زۆربوونی دانیشتوان ڕۆڵی گەورەی لە پاراستنی دارستانەکان و سەرچاوەکانی تری سروشتی هەیە.

١٠- بەرەنگاربوونەوەی ئەوانەی کە دار دەبڕن لە ڕێگەی یاساوە بە توندی پراکتیزە بکرێت.

# هەرگیز لەبیر ناچن

ئەرشیفی موحەمەد حاجی فەرەج





## ماڵپەڕی هەڵەبجە

کاتێک لە کۆتایی ئەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو و سەرەتای ٢٠٠٠، یەکەم ماڵپەڕی کوردی بەناوی (هەڵەبجە)م، دامەزراند و کاری ڕۆژنامەوانیم تێدا بردەوە پێدا. ئەو سەردەمە سایتی کوردی بە پەنجەی دەست ئەژمێردرا کە بریتی بوون لە ماڵپەڕی هەڵەبجە و کوردستانپۆست، کە سەرەتا بە کوردستان تودەی بوو، کوردستان نێت، کە کوردی بوون،،، میدیا و کوردلاندیش بە ئینگلیزی پەخش ئەکران.

ئەو سەردەمە پیتی کوردی لە کۆمپیوتەردا زۆر ناستەم و دانسقە بوو، سەرەتا وەک وێنە بڵاومان ئەکردەوە، و پاشان کە عەلی فۆنت و فۆنتی فارسی و هەندێک فۆنتی دیکە کەوتە دنیای ئینتەرنێتەوە کارەکە ئاسان بوو، بەڵام هەر ئەبوایە وەک پەی. دی.ئێف، بڵاومان بکردایەتەوە، پاشان ئەتوانرا بخوێنرێتەوە،،،. لە پاش ماوەیەک یەکێتی و پاشان پارتی سایتی خۆیان دروستکرد و ڕۆژنامەکانی کوردستانی نوێ و خەبات و برایەتییان تێدا بڵاو ئەکردەوە،،،.

ئەوەی زیاتر برەوەی دا بە کاری نای تی و فۆنتە کوردییەکان، کۆمەڵێک سەربازی وون بوون، لە دڵسۆزانی شارەزا، کە گەورەترین خزمەتی ووشە و نووسینی کوردییان کرد، لەو ساڵانەدا، کوردانی ڕۆژهەڵات، خێرا کۆمەڵێک ماڵپەڕی زانستی و ئەدەبی باشییان بەرهەم هێنا، کە ئەویش لەبەر ئەوەی ئێرانییەکان زوو برەوەیان بە فۆنت و نووسینی خۆیاندا.

ئەو سەردەمە هەموو شتێک بە ئومێد و هیوای ڕووناکی بۆ نەتەوەوەکەمان، جوان بوون. زۆربەی نووسەرە کان، خۆبەخشانە و بە شەونخوونی و دارایی خۆیان، کارییان ئەکرد،،،. ئەزموونێکی پڕ سەمەرە بوو بۆمن، هەم زمانی نوێی ئەوروپا و هەم دنیای ئەو شتە تازەی کە پێیان ئەووت کومپیوتەر،،.

ئەوکاتەی من دەستم بە خولی فێربوونی کۆمپیوتەر کرد، لە شتێک هەبوو ناوی ماوس بێت، لە شاشەیەکی ڕەنگاوڕەنگ،،بەڵکوو ڕەش وسەوزێک و پاشان بوو بە شین.

لە ساڵی ١٩٩٥ وە کە ئینتەرنێتش کەوتە بازاڕاوە، لە کوردستانەوە بە پارە هەواڵەکانیان بە فاکس بۆ ئەناردم، هەواڵی هەڵەبجە و جوندلئیسلام، تایبەت بوو بە ماڵپەڕی هەڵەبجە، لەوێشەوە وەک سەرچاوە وەرئەگیرا بۆ ئاژانسەکانی تری هەواڵ،،.

ئەوەندە سەرقاڵی بیووم، سێ کومپیتەرم سووتاند، تاکەیێک شارەزای بووم، وە لە پەیمانگای ڕۆژنامەوانی نای. تین. ئێل، دەستم کرد بە خوێندن، سوودێکی باشیشم لەو کۆرسانە وەرگرت،،،. ئەوکاتە دیسکێکی بچووک هەبوو، بۆ هەڵگرتنی بابەتەکان، پاشان سی دی هاتە کایەوە، کە ئەویش ئەیئەتوانی هەموو ئەو وێنە و دۆکومێنتانە لە خۆیداجێبکاتەوە،،،.

هەرچەند زۆربەی ئارتیکڵەکان فەوتان، بەڵام خۆشبەختانە وەک مۆزەیەک و بەجێماوەیەکی یادگارییەکان، سایتێک بە ناوی ئەرشیف دۆت ئۆرگ، کە لینکەکەی لە خوارەوە دائەنێم، لای خۆی ئەرشیفی کردوون،،. لەم سایتە ئەتوانرێت هەموو ئەو سایتە کۆنانە ببنرێت کە ئەگەر لینکەکەی بە تەواوی بنووسرێت، هیوادارم خوێندکاران و توێژەرانی بواری مێژووی ڕۆژنامەوانی ئەلەکترۆنی سوودی لێ ببینن. لە کۆتاییدا، ئەمەوێت ئەوە بڵێم، کە ئەوە چووە ناو ئینتەرنێتەوە، قەد نافەوتێت، بە تایبەتی دوای ئەو هەموو گۆڕانکارییە خێرا و پێشکەوتووەی بەسەر دنیای نای تێدا هاتووە. سەردەمانێکی کاری ڕۆژنامەوانیشم وەبیرهێنانەوە.

دانا هەڵەبجەیی

هەڵەبجە نیوز
ئەهەڵەبجەدەردەچێت ساڵی نۆیەم ژمارە(١٣١و١٣٢)ئازاری ٢٠١٧
مۆبایل:٠٧٥٠٨٢٥٤٦٠٦
فەیسبوک:هەڵەبجەنیوز/حلبجە نیوز

دوالاپەرە

به نەرم و نیاني قسه بکه تا دەرگاي دڵەکاني بکەیتەوە، هەمیشه با دڵت گەرم بێت تا ویژدانەکان به بیرەکانت بڵێن 'فەرموو'! به دڵسۆزیەوە رەفتار بکه، تا هەمووکات کاریگەر ابیت

فەتحوڵڵا گولەن

# با رێکخراوەکان رێز لەهاوسەرەکەم بگرن



من ناوم ئەحمەد محەمەد غەفور ناسراوم بە کوڕی حەمەی وەستا غەفوری خەیات
برازای علی غەفوری چاپچی،
تەمەنم ٤٨ ساڵەلە٢١ی٥ی١٩٩٥ ژیانی هاوسەریم پێکهێناوە،دوو کچی جوانی بەرێزم هەیە،یەکێکیان بەشی زمانی ئینگلیزی لەزانکۆ تەواو کردووە و ئەویتریانم لەکۆلێژی یاسایە.
٢١ ساڵە ئەخۆشکەوتوم و چارەسەرم نیە،خێزانەکەم خزمەتی هەرسێکمان دەکات بێ ئەوەی کەمترین نارەزایی دەربڕێت،لەلایەک کەسێکی من لەلایەکیتر،بەخێوکردنی منداڵەکان.
هاوسەرەکەم کەناوی گەلاوێژ محەمەد عوسمان،ە،خەڵکی گوندی تەپی سەفایە،بەراستی نمونەی ژنە،هیوادارم هەموان چاوی لێ بکەن.ئەحمەد محەمەد غەفور،گلەیی لەرێکخراوەکانی ژنان و ئافرەتان دەکات،بۆ رێزێک لەم هاوسەرەی من ناگرن،کەنمونەی ئافرەتە و هەتا ئێستا نارەزاییەکی بەرامبەرم دەرنەبڕیوە و هیچ کێشەیەک نەکەوتوتە نێوانمانەوە.
ن/هەڵەبجەنیوز



# تاوانەکەی خان شەیخون: "زەنگی خەتەر"ێکی دیکە

ئاسۆس هەردی

کێ هەیە وێنەی ئەو منداڵە سوریانەی بەدەم ئازاری برینی چەکی کیمیاییەوە دەتلێنەوە، ویژدانی نەهەژاندبێ، دڵی پڕ نەبوبێ و ئازاری هەڵەبجەو کیمیابارانی کوردستانی بیر نەکەوتبێتەوە؟ دیمەنەکان ئەوەندە دڵتەزێنن کە بەراستی دڵێکی دەوێ بەرگەیان بگرێ و تا کۆتایی تەماشایان بکات.

ئەمە یەکەم جار نیە رژێمە خوێنڕێژەکەی بەعس چەکی کیمیایی دژی خەڵکی مەدەنی بەکاردێنێ. پاش ئەوەی ساڵی ٢٠١٣ ئەسەد چەکی کیمیایی بەکارهێنا، گوایە ئەمەوە بەنگرتوەکان لێژنەی لێکۆڵینەوەی پێکهێناو پاشانیش بەپێی ڕێکەوتنێک چەکە کیمیاییەکانی رژێمی سوریا گوایە لەناوبران. کەچی ئەمرۆ تاوانە گەورەکەی (خان شەیخون) دەری دەخات چاودێری و کۆنترۆڵکردنی چەکی کۆمەڵکوژ لەلایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە، هیچ متمانەیەکی پێناکرێ. لەوەش گرنگترو ترسناکتر، ئێمە لە سەردەمێکدا ئەژین کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی تواناى ڕێگەگرتن یا تەنانەت لێپرسینەوەی لە ئەنجامدەرانی تاوانی کۆمەڵکوژی یا تاوان دژی مرۆڤایەتی هەبێت. ئەمەش بۆ میللەتێکی وەکو ئێمە، هەڕەشەیەکی جدی و نەگەریکی ترسناکە. ئەو دۆخە ئاڵۆزەی لە ناوچەکەدا هەیە پێمان دەڵێت، هیچ گرێنتییەک نیە کە ئێمەش لە داهاتودا نەبینە قوربانی

**کێ هەیەهەیەوێنەی ئەو منداڵە سوریانەی بەدەم ئازاری برینی چەکی کیمیاییەوە دەتلێنەوە، ویژدانی نەهەژاندبێ، دڵی پڕ نەبوبێ و ئازاری هەڵەبجەو کیمیابارانی کوردستانی بیر نەکەوتبێتەوە؟**

دەستی ئەو تاوانە، بەتایبەت کە پێشتر بەسەرماندا هاتوە بێدەنگ و بێ کاردانەوەی جدی تێپەڕیوە. بۆیە کاردانەوەی ئێمە بۆ تاوانەکە، نابێ تەنها لە ئاستی هاوسۆزی و ئازاری ویژداندا بوەستێ، بەڵکو وەک زەنگێکی خەتەری راستەقینەو مەترسییەکی نزیک لەسەر خۆمان تەماشای بکەین و لە ئێستاوە خەمی بخۆین.

ئەو کاتەی شاری حەڵەب کەوتە دەست ئەسەدو هێزە هاوپەیمانەکانی، سەرچاوە هەواڵییەکان باسیان لەو کۆمەڵکوژییە کرد کە لەسەردەستی ئەو هێزانە لەناو خەڵکی مەدەنیدا رویدا. ئەو کاتە لە نوسینێکدا بەناونیشانی (کوردستان لە جیهانی دوای کۆمەڵکوژییەکەی حەلەبدا) باسم لەوە کردبو کە: "ئەوەی لە حەڵەب روودەدا، دەیسەلمێنێ دەوڵەتەکانی ناوچەکە، دەتوانن لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا بە پشتیوانی زلهێزێک، هەمو تاوانێک ئەنجام بدەن و کەسیش ناتوانێ لێیان بپرسێتەوە یان ڕێگەیان لێ بگرێ. هیچ گرێنتییەکیش نیە گەلێکی بێکەسی وەک ئێمە جارێکی تر توشی دۆخێکی ئەو جۆرە نەبێتەوە."

ئێستاش هەمان وتەکانی ئەو نوسینەی پێشو دوبارە دەکەمەوەو دەڵێم:

"هیچ گومانێک لەوەدا نیە کە تاکە سەرچاوەیەکی هێز کە بتوانێ لە نەگەرێکی کارەساتباری ئاوادا تواناى بەرگریمان پێ ببەخشێ، یەکبون و ئیرادەی سیاسی و خۆئامادەکردنمانە بۆ روبەڕو بونەوەی، بەداخەوە ئەویش کراوەتە قوربانی کورسی و بەرژەوەندییەکانی گروپێکی بچوکی دەسەڵاتدار."

سەرچاوە: هەڵەبجە نیوز

# خان شەیخۆن، هەڵەبجەی ٢٩ ساڵ بەر لەئێستا..

کاوە عەلی کریم

(بای زنب قتشا)

تاوانی خان شەیخۆن کەلەلایەن رژێمی بەعسی سوریاوە ئەنجامدرا، دووبارەکردنەوەی هەمان تاوانە کە ٢٩ ساڵ بەرلەئێستا رژێمی بەعسی عێراق لەهەڵەبجە ئەنجامیدا.

ئێمەی خەڵکی پارێزگای هەڵەبجە، لەهەموکەس زیاتر هەست بەئازارو ژانەکانی قوربانیانی خان شەیخۆن دەکەین، چونکە هەردوولامان لەئازارێکدا هاوبەشین کە ئازاری بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکراوی کیمیاییە بەرامبەرمان.

بەدرێژایی مێژوو ئەو رژێمە دیکتاتۆرانەی بەرەوکۆتایی ئەمنییان دەرۆن دەست دەکەن بەئەنجامدانی تاوانی گەورەی دژە مرۆڤایەتی و ئیتر جیهان ناتوانێت بێدەنگ بێت لەئاست ئەو تاوانانەدا، بۆیە بەئەنجامدانی تاوانی کیمیابارانی خەڵکی مەدەنی لەشارۆچکەی خان شەیخۆن، رژێمەکەی بەشار ئەسەد جارێ مەرگی خۆی بەگوێی دنیادا دەدات.

تاوانی خان شەیخۆن ئەگەر بەژمارەو ژمارەی قوربانییان بپێورێت بچوکترە لە ئاست قوربانیانی شاری هەڵەبجە، کەزیاتر لە ٥٠٠٠ مرۆڤی بێتاوان شەهیدبوون و دووهێندەی ئەو ژمارەیەش بریندار بوون، ئەگەرچی بۆهەڵەبجە جیهان بێدەنگی نواندو لەناو ململانێی هەردوو بلۆکی کۆمۆنیستی و سەرمایەداریدا تاوانی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە بەبێدەنگی تێپەڕی، تابێت تاوانی

خان شەیخۆن بێدەنگی لێبکرێت و پێویستە وڵاتانی جیهان هەڵوێستی روونیان بۆ ئەم تاوانە بخەنەڕوو.

دوای ٢٩ ساڵ ئێستا کە باڵیۆزی وڵاتان لەعێراق یان کونسوڵی وڵاتان لەهەرێم، یان دیپلۆماتکارو سیاسەتمەدارانی وڵاتان کەدێنە هەڵەبجەو لەمۆنۆمێنتی شەهیدانی هەڵەبجەدا دیمەنەکانی کیمیابارانی هەڵەبجە دەبینن فرمێسکی غەمناکی بەچاویاندایێتە خوارەوە، ئێمە لێرەوە بەجیهان دەڵێین تەنها فرمێسک ڕشتن بەس نییە، ئەمڕۆ هەڵەبجە و ئەمڕۆ خان شەیخۆن، بەڵکو پێویستە جیهان یەک دەنگ بێت بۆ قەدەغەکردنی چەکی کیمیایی.

ئێمەی هەڵەبجەیی ٢٩ ساڵە داوای قەدەغەکردنی ئەم چەکە دەکەین، ئەگەر ئەم چەکە قەدەغەکرابایە ئێستا هەڵەبجەیەکی تر لەخان شەیخۆن دروست نەدەبوو.

- جێگری پارێزگاری هەڵەبجە

# نۆتاوا.. ساڵیادی هەڵەبجە بەرز رادەگیرێت

لە بیرەوەری تێپەڕبوونی ٢٩ ساڵ بەسەر کارەساتی هەڵەبجە، لە نۆتاوای پایتەختی کەنەدا، لەرێورەسمێکی شایستەدا بە ئامادەبوون ژمارەیەکی بەرچاوی کوردستانیان و نوێنەری حزب و رێکخراوە کانی کوردی و عیراقی ساڵیادی قوربانیانی هەڵەبجە بەرز وپیرۆز راگیرا. سەرەتای مەراسیمەکە بە خولەکێک وەستان بۆ ڕێزگرتن لە گیانی پاکی شەهیدانی هەڵەبجە و تەواوی شەهیدانی کوردستان دەستپێکرد، پاشان خاتوو چاوان سەعید بەخێرهاتنی ئامادەبووانی کرد و لەوتەیەکدا ئاماژەی بە جینۆسایدی هەڵەبجە کرد و کە ٢٩ ساڵ لەمەوبەر لە رۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ رژێمی بەعسی لەناوچوو دوور لە هەموو بنەمایەکی مرۆیی بە چەکی کیمیاوی قەدەغەکراو شاری هەڵەبجەی بۆردومان کرد و لەئەنجامدا پێنج هەزار هاوڵاتی ژن و منداڵ و گەنج و پیری شەهید کرد و بەهەزارانی دیکەشی بریندار کرد کە تا ئێستاش برینەکانیان ساڕێژ نەکراون پاشان وتاری کەسایەتی و رێکخراوەکان خوێندرانەوە، بە گشتی وتارەکان هاوخەمی خۆیان بۆ کەسوکاری بنەماڵەی شەهیدان دەربڕی و راشیانگەیاند کارەساتی هەڵەبجە ئاوێنەکەو ویژدانی مرۆڤایەتی هەژاند هەر لەمیانەی مەراسیمەکەدا چەند پارچە شیعر و پەخشان پێشکەشکران، دواتر فیلمێکی دۆکیومێنتاری سەبارەت بە جینۆسایدی هەڵەبجە نمایشکرا، شەهرام دەستانی مۆزیکژەن چەند پارچە ئاوازێکی مۆتەمینی بەو بۆنەوە پێشکەشکرد. هەر لە میانەی یادەکەدا بورهان مستەفا چەند تابلۆیەکی شێوەکاری سەبارەت بە وێنەی شەهیدانی هەڵەبجە نمایش کرد

PUKmedia

# چیرۆکی ئێمە لە ١٦ ی ٣ ی ساڵی ١٩٨٨ دا

**هیوا موحەمەد کەریم**

بەشی دووەم

پاسەکان ئێمەیان بەرەو شاری کەنگاوەری ئێران برد، تا گەیشتینە قوتابخانەیەک بە ناوی (سومەیە)، چونکە هەموو خەڵکەکە لە چەند قوتابخانەیەکی شارەکانی ئێراندا جێگیر کرابوون، ئیتر هەر شەش تا حەوت خێزانێک لە پۆلێک لە پۆلەکانی قوتابخانەکاندا جێگیر کراین و بە بەتانییەک یان پارچە قوماشێک لەیەکتر جیا کرابوینەوە.
بەو شێوەیە لەوێ من بووم بە سەرپەرشتی کردنی ئەو چوارکەسەی کە بەیەکەوە بووین کە دایکم و دوو لە خوشکە بچوکەکانم بوون، هەر فریای ئەوە دەکەوتم بچم خواردن وەرگرم و بەتانی بێنەو چا لێ بنێ بۆیان جلەکانیان بشۆ، هەرچەند خۆم پێویستم بە کەسێک هەبوو کە دڵنەواییم بکات، بەلام چار نەبوو ئەوە قەدەری من بوو لەو کاتەدا.
جارێکیان قوتویەک ماسیمان وەرگرت، بردم هەر بە قوتوەکەوە گەرمی بکەمەوە لەسەر خەڵوز، بەلام سەری قوتووەکەم هەڵنەکەندبوو، لەناکاو هەر کەزانیم دەنگی تەقینەوەیەک هات، وامزانی کیمیایەکی تر لە قوتابخانەکەی داوە، بەلام کەسەیرم کرد قوتووە ماسییەکە تەقیوەتەوە بە مندا، یەک پارچە ئاگرو خەڵوزەکەی هات بە رووومداو هەرچی ماسییەکەو رۆنی ماسییەکەیە رژا بەجل و بەرگ و دەم و چاومدا، تا دووسێ رۆژ بەهەر کوێدا دەرۆشتم هەر بۆنی ماسیم لێ دەهات!، لەو کاتەدا سابون و تایدیش نەبوو جلەکانم بشۆم چونکە تازە چووبوینە ئەو قوتابخانەیەو ئیشتەجێ بوبوین هیچ شتێک دەست نەدەکەوت.
پاش چەند رۆژێک ئیتر وورده وورده خەڵک بەتەواوی بە ئاگا دەهاتەوەو ئەوکات دەیانزانی کە کێ لە بنەماڵەکەیان ماوەو کێ مردووە، بۆیە یەکێک لە ناخۆشییەکانی تر ئەوە بوو تاو تا ئاوارێک دەنگی گریان لەیەکێک لە ژوورەکانی قوتابخانەکەوە بەرزدەبوویەوە، چونکە ئەندامانی ژوورەکە هەواڵیان پێ دەگەشت کە کورێک یان برایەک یان خوشکێک یان هەموو خێزانەکەیان بەتەواوی لە کیمیابارانەکەدا تیاچوون.
هەرچەندە الحمدلله ئێمە لە خێزانەکەماندا کەسمان تیا نەچووبوین، بەلام هەواڵمان پێ گەشت کە برایەکی شیری باوکم کە ناوی رەئوف بوو(دایکم بە منداڵی بەخێوی کردبوو) بەخۆیی و خێزانەکەیی و شەش منداڵەوە هەموویان لە کیمیابارانەکەدا لەماڵەکەی خۆیاندا شەهید بوون، ئەوەش بۆ ئێمە زۆر ناخۆش بوو، چونکە بەراستی هێندە خێزانێکی چاک بوون و پەیوەندیمان بەهێز بوو، هیچ فەرقیان نەبوو بۆ ئێمە لەگەڵ برای دایک و باوکیدا..
دوای یەک دوو مانگی ئێمە لەگەڵ دایک و دوو خوشکەکەم گەرایەوە کە لەلای ماڵی خزمێکی خۆمان بوو بە ناوی کاک ئەحمەد کاکە خان و هەر لەهەمان شاری کەنگاوەر بوون، وە براکەشم گەرایەوە کە لە شاری کرمان بوو کە نزیکەی ٣٠ سەعات بە سەیارە دوور بوو لە ئێمەوە، خوشکەکەمدا لەوێ بوین، رۆژێکیان مامۆستا فەتاح کۆکۆیی دایکم و باوکمی ئاگادار کردبوو لە شاری سونقورد کە ئێمە لەکەنگاوەرین، ئیتر دوای ماوەیەک ئەوانیش هاتن بۆ لامان و یەکمان گرتەوە لە کەنگاوەر.
لای ماڵی کاک قادری دراوسێمان بوو(ماڵیان ئاوا بێت!).
هەر لەو کاتانەدا بوو هەواڵیان پێ داین کە ماڵەکەمان هەموو سوتێنراوە لەهەڵەبجە، هیچمان بۆ دەرنەچوو بوو جگە لە تەلەفزیۆنێک و سەلاجەیەک و فەرشێک کە کاک عومەر سان ئەحمەدی پورزای باوکم پێش سوتانەکە دەریکردبوو.
وە دوای ماوەیەکی تر زانیمان کە لەو شەوەدا کە بەرێگەدابووین بۆ ئێران ئەو پارەیەی کە پێمان بوو هەمووی کە هەزار دیناری سویسری ئەو کاتە کە بە دایکم بوو لێمان کەوتبوو لە رێگادا، وە ئەویش لەناو چوو نەدۆزرایەوە بەیەکجاری ( کە ئەگەر بەراوردی کەی بە پارەی ئێستە نزیکەی یەک دەفتەر دۆلاری ئێستە زیاتر دەکات!).
ئەم هەواڵە ناخۆشانە ئەوەندەی تر دەربەدەری و ئاوارەیی و کارەساتەکەی لەسەر گرانتر کردبوین.
پاشان هەر لەو شەوانەدا کە لە قوتابخانەکە بووین، خوای گەورە منداڵێکی تری بە خێزانەکەمان بەخشی و ناومان نا (سومەیە) بەناوی ئەو قوتابخانەی کە لەوێ تیایدا دەژیاین، ئیتر زۆر شەو هەموو لەبەر گریانی منداڵە ساواکەمان هەر حەوت خێزانەکەی تر بەئاگاهاتنەوە بوون و نەدەخەوتن لەبەر گریانی!.
پاش چەند مانگێک مانەوە لەو قوتابخانەیە، لە جێگایەک حکومەتی ئێران ئۆردوگایان دروست کرد بۆمان و بردیتیان بۆ ئۆردوگای گەنباران، خێمەیان بۆ هەموو خێزانێک هەڵدابوو.
لەو شوێنەش نزیکەی چەند مانگێکی ترمان بەرێ کردوو، پاشان وتیان حکومەتی عیراق عەفواتی داوە بۆ عێراقیەکان کە بگەرێنەوە، ئیتر خەڵک وورده وورده ماڵی دە پێچایەوەو دەگەرایەوە بۆ عێراق، ئێمەش هەروەها ماڵمان پێچایەوەو سەیارەیەکی گەلایەمان بەکرێ گرت و بارمان کرد بەرەو سنوری عێراق ، هەرچەند لەوێ پێیان وتین کە بۆ هەڵەبجە دەگەرێنەوە.
کاتێ گەشتینە سنوری عێراق و ئێران لەوێدا، دەبوایە ماڵ و کەل و پەلەکانمان لە گەلایە ئێرانییەکانەو بگوازینەوە ناو سەیارەی زیلی عەسکەری عێراقی، بەلام لەو کاتەدا دوو دڵی و پشێوییەک لەلایەن خەڵکەکەو سەربازە عێراقیەکانەوە دروست بوو، خەڵکەکە وتیان بە سەربازە عێراقیەکان ئایا بە دڵنیایی بۆ هەڵەبجەمان دەبەنەوە یان بۆ شوێنێکی ترمان دەبەن
وە خەڵکەکە وتیان بە پلەدارە سەربازییە عێراقیەکان ئەگەر بۆ هەڵەبجەمان نەبەنەوە ئەوا نایەینەوە بۆ ناو خاکی عێراق.
ئەبیرم دێت یەکێک لە پلەدارە عێراقیەکان، بۆ ئەوەی خەڵکەکە قەناعەت پێ بکات، سوێندی زۆری خوارد، وە ووتی(ئەم سمێڵە سمێڵی پیاو نەبێت و سمێڵی نازانم چی بێت!، بۆ هەڵەبجەتان دەبەینەوە!!!!
ئیتر هەموومان کەل و پەلەکانمان گواستەوە بۆ ناو زیلە سەربازییە عێراقیەکان.
سواری سەیارەی زیلی سەربازی کراین، لەئەوێکەوە بەرێ کەوتین بە هیوای ئەوەی بۆ هەڵەبجەمان بەرنەوە، بەلام کە گەشتینە زەردەهاڵ و بەرەو خورماڵ براین و بە ئاراستەی هەڵەبجە نەبراین ، ئیتر ئەو کاتە خەڵکەکە هەموو زانییان کە حکومەتی بەعس درۆی لەگەڵدا کردوین بۆ شوێنێکی ترمان دەبەن نەک هەڵەبجە.. وەسمێڵی کابراش سمێڵی پیاو دەرنەچوو..
هەموومانیان برد تا گەیاندینیانە شارۆچکەی عەربەت و لەوێ لەناو دەشتاییەکی ووشکی گەرمدا هەموومانیان فرێدا، بە خۆمان و کەل و پەلەکانمانەوە، بەراستی لە دەم وچاوی هەموو خێزانەکاندا یەک دنیا ئازارو موعاناتو خەمت دەخوێندەوە، بەو گەرمایە بێ شوێن و بێ جێگە لەوێ ماوەیەک بە بێ ئازی ئەو خەڵکە مانەوە لەوێدا.
( بەلام بەداخەوە چەند خێزانێک دوای ئێمە گەرابونەوە بۆ عێراق، چەند رۆژێک دوای عەفواتەکەی حکومەتی فاشستی عێراق بوو، واتە عەفواتەکە ماوەکەی تەواو بوو بوو، ئەوانە هەر هەموویان لە جێگەیەک بەژن و منداڵ و گەورەیانەوە زیندە بەچاڵ کران، کە وەک دەڵێن ژمارەیان ٣٠٠ کەس بووە، کە خێزانێکیان خزمی خۆمان بوو، خوا هەموویان بە شەهید قبول کات )

تێبینی / پشت بەخوا لە بەشی کۆتاییدا، باسی ئەو ئاسۆرو نەهامەتییانەی تر دەکەم، کە شێخ جەعفەری بەعسی قایمقامی سلێمانی و ملازم موحسین ( شەمال) کە بە ماڵە هەڵەبجەییەکانیان دەکرد لەناو شاری سلێمانیدا.



**چەند رۆژێک دوای عەفواتەکەی حکومەتی فاشستی عێراق، واتە عەفواتەکە ماوەکەی تەواو بوو بوو، چەند خێزانێک هەر هەموویان لە جێگەیەک بەژن و منداڵ و گەورەیانەوە زیندە بەچاڵ کران، کە وەک دەڵێن ژمارەیان ٣٠٠ کەس بووە، کە خێزانێکیان خزمی خۆمان بوو، خوا هەموویان بە شەهید قبول کات**

**خەڵکەکە ووتیان بە پلەدارە سەربازییە عێراقیەکان ئەگەر بۆ هەڵەبجەمان نەبەنەوە ئەوا نایەینەوە بۆ ناو خاکی عێراق.**

هەڵەبجە نیوز
ئەهەفتەنامەیەکی هەڵەبجەییە دەردەچێت ساڵی دووەم ژمارە(٤٥) نیسانی ٢٠١٧
مۆبایل٠٧٥٠٨٢٥٤٦٠٦
فەیسبووک هەڵەبجە نیوز/حلبجە نیوز



هەمیشە کەسانێک
دڵیان تەنگ کردووم
...کە بۆ خۆشحاڵیان هەموو کارێکم کردوە

## عەبابەیلێ و شاتۆ

وێنەیەکی کۆنی عەبابەیلێ_ئەرشیف

پیرەمێردی نەمر لە ڕۆژنامەی (ژیان) ژمارە (٤٩٦) ی ساڵی (١٩٣٦) دا، نووسیویەتی: نەمر عەبابەیلێیانە کە پاریس و ئەورووپایان نەدیوە چۆن ئەرتیبی ئاشتوا فێربوون؟ خانووی داود بەگ و شێخ ڕەشید کە میعماری هەردووکیان زەوق و تەمیمەتی خۆیانە، عەینی شاتۆی ئەورووپا و (فۆنتا) ئەکاتە... یەکێ لەزۆر جێگا ئەشتانی فوولە دەکەن، بەلام هیچ بینایەک نەبوو لەسەرشاخ و ئەهری ناوی پەیەردا بڕوات ئەمە خوا تەنها بە عەبابەیلێی داوە، ئەعریفی عەبابەیلێی بەشیعری گۆران دەردەکەوێ، وەک قوپی نیە، بلندترە و شیعری بلندتری گەرەکە... گۆران ببینم.

لەئەکاونتی:
سەلمان سەعید-
دوە وەرگیراوە

## منداڵە ونبووەکانی هەڵەبجە دووبارە ون دەبنەوە

ئازانس

"ئازانم من کێم" ناونیشانی ئەکاونتی فەیسبووکی ئەو کچە ونبووەی هەڵەبجەیە کە ساڵێک لەمەوبەر خۆشحاڵ بوو بەوەی گەڕاوەتەوە ئامێزی خێزانە ڕاستەقینەکەی، ئیتر ناوە فارسییەکەی لە مریەمەوە دەبێتەوە بە هاوناز، بەڵام ئەنجامی هەڵەی پشکنینەکان جارێکی تر ئەویان بێ ناسنامە کردەوە، لەگەڵیشیدا کەسوکاری ونبووەکانی تری خستە گومان و دڵەڕاوکێوە و ئامادە نین پشکنینیان بۆ ئەنجام بدرێتەوە.

زیاتر لە یەک ساڵ بەسەر ئاشکراکردنی ئەنجامی پشکنینی DNA ـسی مریەمدا تێدەپەڕێت، لە ئێستادا لەو ماڵە ئەژیاوە کە بە پێی ئەنجامی پشکنینەکە بوو بە کچیان، ئەندامانی ئەو خێزانە پێیان وتووە و ئەنجامی پشکنینەکان هەڵە دەرچوون و ئەو کچیان نییە.

لە ١٨ـسی ئابی ساڵی ٢٠١٥دا ئەنجامی پشکنینی مریەم لە هۆڵی مۆنۆمێنتی هەڵەبجە ڕاگەیەندرا و بووە کچی خێزانێک کە باوکی هەر لە کیمیابارانەکەدا شەهید بووبوو، برایەکیشی وەک خۆی ون بووە و تەنها دایکی و برایەکی ماون، مریەم ئێستا بە تەنیا لە شاری هەولێر دەژی و چاوەڕێی دووبارە ئەنجامدانەوەی پشکنینەکانە.

عەباد کاکەیی، پارێزەری مریەم، بە "ئازانس"ی ڕاگەیاند، کەیسی مریەم ماوەتەوە و چاوەڕوانن کەسوکاری منداڵە ونبووەکان لە دادگا سکاڵا تۆمار بکەن کە دووبارە خوێنیان لێ وەربگیرێت بۆ ئەوەی بەراورد بکرێت لەگەڵ پشکنینەکەی مریەم و ئەو پشکنینانە ببرێنە وڵاتی بەریتانیا یان سوید، لەوێ یەکلایی بکرێنەوە بۆ ئەوەی ڕاست و بێگومان بن.

وتیشی: "مریەمیش و کەسوکاری منداڵە ونبووەکانیش هەموان لە حاڵەتێکی دەروونیدان، ئازانن جارێکی تر چۆن بڕوا بە ئەنجامی پشکنینەکان بکەنەوە کە حاڵی خۆشیانە، چونکە ئەوەی بەسەر کەیسی مریەمدا هات زۆر کارێکی سەخت و ناخۆش بوو".

بە پێویستی زانی دادگا ئەو کەسانە ئاشکرا بکات کە پشکنینەکەی مریەمیان گۆڕی و بەم شێوەیە زیانیان ئاڵ کرد.

کچە هەڵەبجەییەکە لەلایەن ئەو خێزانە ئێرانییەی بە خێو کرابوو ناوی مریەمی لێ نرابوو، کە پشکنینی بۆ کرا، بوو بە کچی خێزانێکی هەڵەبجەیی، ناوی بوو بە هاوناز، دوای ئەوەی پێی وترا ئەنجامی پشکنینەکان هەڵەیە ئێستا لە چاوەڕوانیدایە بۆ ئەوەی بزانێت ئەمجارە چ ناوێکی لێ دەنرێت. ئەو لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووکدا ناوی خۆی ناوە "ئازانم من کێم"، کچە هەڵەبجەییەکە ئامادە نەبوو قسە بۆ "ئازانس" بکات.

سالار هۆشمەند، یەکێک لە ئەندامانی ئەو خێزانەی کە بە پێی پشکنین مریەم بووە کچیان، بە "ئازانس"ی ڕاگەیاند، ماوەی یەک مانگ مریەمیان هێنابووەوە ناو ماڵە و خێزانەکەیان، دواتر گومانیان لا دروست بوو.

وتی: "بە پێی جیاوازیی تەمەن و هەندێ وێنەی کۆن و چەند بەڵگەیەک و بەدواداچوونێک دەرچوو کە ئەو منداڵە منداڵی خێزانەکەی ئێمە نییە و بە هەڵە پشکنینەکە کراوە".

بە پێی ئاماری کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە، ٧٦ خێزان لە ئێستادا ناویان بۆ ١١٢ منداڵی ونبوو تۆمار کردووە، لە دوای ساڵی ٢٠٠٣وە تا ئێستاش ٩ منداڵی ونبوو، دوای ئەنجامدانی پشکنینی (DNA) بە خێزانەکانیان شاد کراونەتەوە، ١٢ منداڵی تریش پەیوەندییان بە کۆمەڵەکەوە کردووە، خۆیان بە ونبووی هەڵەبجە دەناسێنن و بڕیارە پشکنینیان بۆ ئەنجام بدرێت.

سەلاح محەمەد، یەکێک لە کەسوکاری منداڵە ونبووەکانی هەڵەبجە، بە "ئازانس"ی ڕاگەیاند، حکومەتی هەرێم بە تەواوی کەمتەرخەمە، لە کەیسی منداڵە ونبووەکاندا بودجە و یاسای تایبەتی نییە.

سەلاح محەمەد، دوو خوشک و برایەکی ون بوون و پێشتر پشکنینی کرد، کەیسەکەیان خراوەتە دادگا، وتی: "ئامادە نیم بڕۆم پشکنین بکەمەوە، چونکە هیچ باوەڕم بەو ئەنجامانە نەماوە، ئەوەتا مریەم بەو شێوەیە سەرگەردان بووە و کەس نازانێ کچی کێیە، هەموشمان کەوتووینەتە گومانەوە".

دوای ئەوەی گومان بۆ پشکنینەکەی مریەم دروست بوو، دادگای هەڵەبجە بڕیاری دا دەبێت لە ڕێگەی دادگاوە پشکنین بۆ ونبووەکان و کەسوکاریان ئەنجام بدرێت، دەبێت کەسوکاری منداڵە ونبووەکان بڕۆنە دادگا و سکاڵا تۆمار بکەن و لەوێ خوێنیان لێ وەربگیرێت، بەڵام کەسوکاری منداڵە ونبووەکان ئامادە نین بڕۆنە دادگا.

لوقمان عەبدولقادر، سەرۆکی کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە و ئەندامی لیژنەی منداڵە ونبووەکانی هەڵەبجە، بە "ئازانس"ی ڕاگەیاند، کەیسی مریەم وای کردووە، کەسوکاری منداڵە ونبووەکان باوەڕیان بە ئەنجامی پشکنینەکان نەمێنێت.

بابەخ بە کاروباری پارێزگای هەڵەبجە دەدات
ژمارە(١٦)
١٦ی مارسی ٢٠١٧
خاوەن ئیمتیاز وسەرنوسەر
سەلاح سەعید ئامین

# هەڵەبجە نیوز
Halabja News

## حزبەسیاسیەکان بەرژوەندی خۆیان لەپێش هەڵەبجەوە داناوە

# هەڵەبجە کۆیان ناکاتەوە و باسی ئەنجومەنەکەی ناکەن


وەرگیراوە

## دوو مانگ بەسەرڕێکەوتنی حزبەسیاسیەکاندا لەپارێزگای هەڵەبجە تێدەپەرێت

هەڵەبجەنیوز تایبەت

دوو مانگ بەر لەئێستا و ڕێک لەسەروەختی ساڵوەگەری جینۆسایدی هەڵەبجەدا حزبە سیاسیەکان ڕایانگەیاند لەسەر پێکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە گەشتونەتە ڕێکەوتن.

دوای دوو مانگ وهەوڵێکی زۆری دۆستان و کاندیدەکانی ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە نەک ئەنجومەن پێکنەهات بەڵکو ڕێکەوتنەکە بەهۆی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە هەڵپەسێردراوە وئێستا لەهەموو کات زیاتر بێدەنگی لایەنە سیاسیەکان هەست پێدەکرێت وئومێدێک نیە بەم نزیکانە ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە دەست بەکاربێت و یەکەم حکومەتی خۆجێی پارێزگاکە دەست بەکاربێت.

چاودێرێک بەهەڵەبجەنیوزی گوت:ئێستاکەکانی پارتی هەرچی بێ ناکاتەوە ئەوەی لەسەر ڕێکەوتنی لایەنەسیاسیەکان و ئێستای حزبێکیان ئەنجومەنی پارێزگای هەڵەبجە پێکنەهێنا.ئەو چاودێرە ئەوەشیگوت:بەداخەوە بەرژوەندی حزب خراوەتە پێش بەرژوەندی هەڵەبجەوە و کارەساتی جینۆسایدی هەڵەبجەو ئاسۆرەکانی ئەبوەتە هۆی ئەوەی حزبە سیاسیەکان کۆبینەوە ولەپێناو هەڵەبجەدا بگەنە ڕێکەوتن وکۆتایی بەململانێکانیان بهێنن کەتەنها خەڵکی پارێزگاکەو دانیشتوانەکەی زەرەرمەندی سەرەکی و کۆتایی ئەو ململانێی حزبیەن.

## بەرکەوتەیەکی دیکەی کیمیاباران شەهید بوو

هەڵەبجەنیوز

ڕۆژی ٢ی٥ی٢٠١٧ هاوڵاتی «دانا عمر عەلی» کەبەرکەوتەیەکی چەکی کیمیاوی لەهەڵەبجە دوای چەندین ساڵ لە ململانێ و ئازار چەشتن لە وڵاتی ئەڵمانیا شەهید بووتا ئێستا ئەژمارەی بەرکەوتوانی چەکی کیمیاوی لەهەڵەبجەدا دەست

بەکارنەبون و حکومەتی هەرێم بۆ ئەو مەبەستە پەنای بۆ وڵاتی ئێران بردوە .ئەمە ئەگاتێکدایە تائێستا نزیکەی ٩٤ بەرکەوتەی چەکی کیمیاویی گیانیان لەدەستداوە چەندینی تریش بەدەست ئازار و هەرەشەی برینەکانیانەوە دەناڵێن.

## مامۆستایەکی زانکۆی هەڵەبجە لە پرۆگرامی فولبرایت لە ئەمریکا وەردەگیرێت

مامۆستایەکی زانکۆی هەڵەبجە لە پرۆگرامی فولبرایتی سەردانی سکۆڵەرەکان لە ئەمریکا وەردەگیرێت
سومەیە خالید، مامۆستا لە بەشی ئینگلیزی کۆلێژی پەروەردەی بنەرەت و زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی هەڵەبجە لە پرۆگرامی فولبرایتی سەردانی سکۆڵەرەکان (Fulbright Visiting Scholars Program ٢٠١٧) وەردەگیردرێت.
پرۆگرامەکە بۆ ماوەی دوو مانگەو تایبەتە بە فراوانکردنی زانیاری مامۆستایانی زانکۆ و دروستکردنی پەیوەندییان لەگەڵ هاوپیشەکانی خۆیان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.
مامۆستا سومەیە کە یەکێکە لەو ٢٥ کەسەی کە لە سەرتاسەری عێراق لە پرۆگرامەکەدا وەرگیراون، لە نێوان مانگی ئەموز بۆ ئەیلول لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەشداری چەندین وۆرکشۆپ و کۆرس و چالاکی ئەکادیمی دەکات لە بوارەکانی سەرکردایەتیکردن، وانەوتنەوە، گەشەپێدانی پرۆگرامی خوێندن، میتۆدەکانی فێربوون و تیۆرەکانی پەیوەندییە کەسییەکان.



# مێژووی دروستبوونی هەڵەبجە

**ئامۆختار عومەر خەلیفە**

گومان لەوەدا نییە کە هەڵەبجەی ئێستا لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکاندا دروستکراوە، بەڵام بوونێک لەوەدا هەیە کە هەڵەبجە دوای ساڵی (١٧٠٠) ز دروستکراوە مێژووناسەکانی شوێنەکانی ناوەڕاستیان کردوەتەوە کە حەمەچاوش و سێ کوڕەکەی پیرۆز و سلێمان و عەبدوڵڵە بوو سیانزە ماڵ بوون و هەرئەم ناوەش لەو عەشرەتە دەڕێت. عەشیرەتی جاف دروستکەر و بنیاتنەری هەڵەبجەن. وردە وردە ئەم شوێنەی هەڵەبجە بە هۆی ناوداری شوێنەکەیەوە کە دەڕوانێت بەسەر دەشتی شارەزووردا، زیاتر ئاوەدان بوّتەوە و تەنیا (خێڵەکانی جاف) ی تێدابووە کە زیاتر لە (١٢) هەزار خێزان دەبن، ئاوەدانی ناوەکانی شارەزوور بووە، پاشان خەڵکی تر هاتوون و پاڵیان داوە بە هۆزەکانی جافەوە و زیاتر ئاوەدان بوّتەوە.

عەشیرەتی جاف لە ناوچەی جوانڕۆ سەریان بۆ کەس دانەنەواندووە، پاشان میرێکی ئەردەڵان ئەساع دەکاتە ناو و زەوی و زارە بەپیتەکانی ناوچەکە و دەیەوێ بە تۆپزی بۆ ژێر ڕکێفی خۆیان بخات، ئەوانیش ملی بۆ کەچ ناکەن و لە ئەنجامدا جەنگێک دەقەومێت و دوو سەرۆک خێڵی جاف دەکوژرێن و ئەوەی دەمێنێتەوە پاش ماوەیەک ڕوو دەکەنە شارەزوور ڕوو لە میرنشینی بابانەکان دەکەن و لە ناوچەی (ئاتی خێلانی) دەربەندیخان نیشتەجێ دەبن، ئەو کاتە ژمارەی جافە هەڵهاتووەکان سەد ڕەشماڵێکە و داوا لە میرنشینی بابان دەکەن کە ماڵی نیشتەجێ بوون و گەرمیان و کوێستانیان بدەنێ، ئەوانیش ڕێیان پێ دەدەن. بەهۆی چەند باروودۆخێکی نالەبارەوە، وەک جەمسەبەندی هێزەکانی سەرسنور بە شێوەیەکی قایمتر وای لە ئێلی جاف کرد بە شوێن ڕێگا چارەیەکی تردا بگەڕێن و بڕیاریان دا واز لە کۆچەرایەتی بهێنن و نیشتەجێ بن. لە هەموو ڕوویەکیشەوە گوزەران لە هەڵەبجەدا گونجاو بوو، بۆیە بڕیاریان دا دەست بە دروستکردنی شاری هەڵەبجە بکەن. ژمارەیەکی زۆر سەرچاوە و مێژوونوس لەوەدا یەکدەگرنەوە کە بە هەزاران ساڵ پێش زایین بوونی ژیان و شارستانیەتی بچوک و گەورە، کوردی و بێگانە، لەم ناوچەیەدا هەبوون، وەک (ئاشورییەکان، بیشدابییەکان، میدییەکان، هەخامنشییەکان، ئەسکەندەر لە سەدەی چواری پێش زایین، ئەشکانی، ساسانییەکان، هاتنی ئیسلام (٢١ ی ک ٦٤٣ ز)، ڕوادییەکان، سلجوقییەکان، ئەتابەکەکان، ئەیووبی، مەغۆلی، جەلائیری مەرعەشی، تەیموری لەنگ (١٤٠٠ ز)، ئەردەڵان و سەفەوییەکان، بابانەکان، عوسمانی، ئینگلیز، شێخ مەحمود، حکومەتی عێراق، حکومەتی کوردی (حکومەتی هەرێمی کوردستان).

لە ساڵەکانی کۆچی جولەکە بۆ عێراق و ئێران و کوردستان، ناوچەی شارەزوور و هەڵەبجە چەندین خێزانی جولەکە ڕووی تێدەکەن و نیشتەجێ دەبن و لە پاڵ خێڵەکانی جاف دا پەنا ئەدرێن، کاروباری بازرگانی ئەکەن لەو سنورەدا، بەمەش زیاتر ئەبێت بە مەرکەزێکی بازرگانی و ئاڵوگۆڕ لەو سنورەدا.

هەڵەبجە بازاڕێکی بازرگانی گەرمی هەبوو شارۆچکەیەکی کوردە نشینی قەرەبالغ بوو، ژمارەی دانیشتوانی ٦٠ هەزار کەس زیاتر بوو.

ناوچەکانی هاوسنووری هەریەک لەوڵاتانی ئێران و تورکیا هاوشێوەی ناوچەی هەڵەبجەن، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کام لەو ناوچانە هاوشێوەی هەڵەبجە نین و لە بواری ئەدەبی و هونەردا وەک ئەو خزمەتیان بە نەتەوەی کورد نەکردووە. پێش سەیوان و پەیاوە دێرینەکانی شار هەڵدێکیان دەبێن، یەکەم خانوو لە هەڵەبجەدا یەکەکانی (شیوەکان) دروستیان کردووە و پاشان ئەوەکانیان لەوێدا نیشتەجێ دەبن، کە ئەمانیش (حەمە چاوش) و هەریەکێ کوڕەکەی (پیرۆز و سلێمان و عەبدوڵڵا) ئەمانیش لەگەڵ خۆیاندا بنەماڵەیەکی تر دێنن، کە ئەمانە بوون، (پیرۆز) موختاری تورک بووە، کێخا ئەحمەد کوڕی پیرۆزەو کوڕەکانی یەخاوی (حەمە برا، حەمەبۆر، حەمەفەرەجی کوێخا) وەچەوەکانی ئەم سێ برایە زۆربەیان لەژیاندا ماون و (سلێمان) پش ئەم منداڵانەی هەبووە (حاجی محەمەد)، (قادر)، (حاجی فەرەج)، (ئەمین) و (عەبدوڵڵا) ش کە ئەم منداڵانەی هەبووە (عەبدولڕەحمان، ئەحمەد، مەحمود، سەعید، ئەمین، حەمە ساڵح) بەپێی ئەم بۆچوونە یەکەم بنەماڵەیەک هەڵەبجەی دروستکردبێ ئەم ماڵانە بوون کە ئێستا لەناو خەڵکی شار بە (١٣) سیانزە ماڵە ناسراون.

هەڵەبجە جاران دوو قەیسەری گەورەی هەبوو (قەیسەری پاشاو قەیسەری حامید بەگ) کە لە ساڵی ١٩٣٤ دروستکراوە، بیناو سەراو پۆلیسخانەی هەڵەبجە ساڵی ١٩٣٠ دروستکراوە، یەکەم قوتابخانە ساڵی ١٩٢٥ و ساڵی ١٩٢٩ بوو بەخاوەنی نەخۆشخانە، ساڵی ١٩٤٠ ئامێری کارەبای هەڵەبجە کەوتە گەڕ. لەساڵی ١٩٢٩ پرۆژەی ڕەسمی ئاوی هەڵەبجە تەواو بوو، لەساڵی ١٩٢٤ تەلەگراف خانە دامەزراوە، لەناو شاری هەڵەبجە تەنها یەک ئۆتۆمبێل هەبووە پێیان وتووە (لۆرییەکەی عەزە) ئەم لۆرییە بە دوو ڕۆژ ئەسەرو ئەوسەری ئەکرد لە هەڵەبجەوە بۆ سلێمانی لەساڵی ١٩٥٠.

ڕۆژی ١٣ ئازاری ٢٠١٤ لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان بە فەرمی کرایە چوارەم پارێزگای هەرێمی کوردستان

# بۆ نەخۆشخانە تایبەتەکەی بەرکەوتوانی چەکی کیمیاوی هەرێم هانا بۆ ئێران دەبات

بۆ بەکارخستنی نەخۆشخانەی هەڵەبجەی تایبەت بە بەرکەوتوانی چەکی کیمیاوی ئامادەکاری دەکرێت بۆ ئیمزاکردنی یاداشتێکی لێک تێگەیشتن لەگەڵ کۆماری ئێران پێش نیوەڕۆی ڕۆژی ٢٠١٧/٥/١٥ محمود حاجی ساڵح وەزیری کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوان و د. ڕێکەوت حمە رشید وەزیری تەندروستی لە دیوانی وەزارەتی کاروباری شەهیدان پێشوازیان کرد لە موزاری عەبادی سەرکونسڵی کۆماری ئێران لە هەرێمی کوردستان و بابەتی سەرەکی کۆبوونەوەکەش بەپێی ڕاگەیەندراوێکی وەزارەتی شەهیدان بریتی بووە لە ئامادەکاری بۆ دانانی میکانیزمی ڕێکەوتنێک لە نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و کۆماری ئێران تایبەت بە بەکارخستنی نەخۆشخانەی تایبەت بە بەرکەوتوانی چەکی کیمیاوی کە لە ماوەی ڕابردوودا بینەکەی لەلایەن حکومەتی هەرێمی بۆ دروست کراوە و ئامێر و کەرەستەی پێویستی بۆ دابین کراوە، بەڵام لە بەر ئەبوونی پسپۆری شارەزا و توانای مرۆیی لە بواری کیمیاوی نەتوانراوە بەکار بخرێت بەپێی ڕاگەیەندراوەکە کە ڕێنمایی بۆ کرادیو ڕەوانەکراوە هەردوو وەزارەتی کاروباری شەهیدان و تەندروستی لەلایەن ئەنجومەنی وەزیران ڕاسپێردراون تاکو ڕێکەوتنێک لەگەڵ لایەنی تایبەتمەندی ئێران ئەنجام بدەن تایبەت بەرکەوتوانی چەکی کیمیاوی و بەکارخستنی نەخۆشخانەی تایبەتی هەڵەبجە و داواش دەکەن ئێران ئاسانکاری بکات تاکو لە زووترین کات ئەم ڕێکەوتنە ئەنجام بدرێت نەخۆشخانەی هەڵەبجە ١٠٠ قەرەوێڵەیەو ئامێر و پێداویستی بۆدابین کراوە و پێویستی بە پسپۆر و بەڕێوەبردن هەیە، ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان بەهۆی ئەوەی زانیوە کۆماری ئێران وەکو دراوسێ و بوونی شارەزا لە بواری کیمیاوی هاوکاری بێت بۆ بەکارخستنی وچارەسەرکردنی بەرکەوتوانی چەکی کیمیاوی لە کۆبوونەوەکەدا سەرکونسڵی کۆماری ئێران ئامادەیی کونسوڵخانەی وڵاتەکەی نیشانداوە بۆ هەموو ئاسانکارییەک پێویست بێت بۆ ئەنجام دانی ئەم ڕێکەوتنە و ڕایگەیاند ئامێنساوە کار بۆ ئاسانکارییەکانی دەکەن و لەگەڵ لایەنی پەیوەندیدار پەیوەندی دەکەن

# زانکۆی هەڵەبجەو زانکۆی سلاشکی پۆڵەندی یاداشتنامەی لێکتێگەشتن واژوو دەکەن

لە پەراوێزی کۆنفرانسی پزیشکی نێودەوڵەتی زانکۆی سلێمانی لە ئوتێل گراند ملینیۆم لە سلێمانی و بە ئامادەبوونی بەڕێز (دکتۆر یوسف گۆران) وەزیری خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی، لە ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی (١٦\٤\٢٠١٧) بەمەبەستی پێشخستنی بواری ئەکادیمی و زانستی زانکۆ، بەڕێز (دکتۆر ئاراس مصطفی احمد) سەرۆکی زانکۆی هەڵەبجە و بەڕێز (ماسیەج گورکزا) سەرۆکی زانکۆی سلاشکی پۆڵەندی یاداشتنامەی لێک تێگەشتنیان واژوو کرد.

# راپەڕینەکەی ١٣ی ٥ی ١٩٨٧ ی هەڵەبجە

**هیوا موحەمەد کەریم**

کات نزیکی ١٠ ی سەر لەبەیانی بوو، خەڵك کەم کەم کۆدەبوویەوە، خۆپیشاندان دەستی پێ کرد دژی حکومەتی بەعس، خۆپیشاندەران لە گەرەکی کانی عاشقانەوە بەرێ کەوتن بە هوتاف و دروشمی کوردایەتی، وەك بڕوخێ بەعسی فاشی ، بژی کوردوکوردستان بژی شۆرش و لەو شێوەیە، هەرچەند ئەو کاتە من منداڵ بووم بەڵام کەمێك چواڵاو بزێو بووم ، لەناو خۆپیشاندانەکەدا کەدا بەشداریم کردبوو، هەرچەند پێیان دەووتین کە بگەڕێنەوە ئێوە منداڵن و توشی شتێك دەبن، بەڵام هەر بەردەوام بووین لەگەڵ گەورەکاندا، خۆپیشاندان و هوتاف کێشان بەردەوام بوو، ئێمەش بەحەماسەتەوە لەگەڵەی سەر هاوارمان دەکرد، بەردەوام بووین لە ڕۆیشتن تا گەیشتینە نزیکی ناو بازاڕوو لای بازاری مەزراخانەکەی ئێستە ، پاش ماوەیەك لەوێدا بەعسییەکان دەستیان کرد بە تەقە کردن بەسەر ڕاسەری خۆپیشاندەراندا، تا ڕادەیەك بڵاوەی لێ کرا، ئێمە تا ئەوێ ڕۆشتین ئیتر لە گەڵ منداڵانی هاوڕێمدا گەڕاینەوە، هەر لەو کاتەدا بوو هەندێك کەس بریندار بوون لە ئەنجامی تەقەکانی ئەوانەوە، تەنانەت ئەو ڕۆژە حکومەتی بەعس تەیارەی سەربازی هەستاندبوو بۆ خۆپیشاندەران، لەو کاتەدا کەسێکم دی هێندە حەماسەتی هەبوو، سیلاحێکی کلاشینکۆفی پێ بوو تەقەی لە تەیارەکە دەکرد، هەرچەندە کلاشینکۆف هیچ کارگەرییەکی بۆ تەیارە نییە.

ئەوەبوو خۆپیشاندان تەواو بوو، ئیتر حکومەتی بەعس (منع التجول) ی ڕاگەیاندبوو لە گەرەکی کانی عاشقاندا، تا ڕادەیەکی زۆر خەڵك گەرەکی کانی عاشقانی چۆڵ کردبوو، هەندێك لە خۆپیشاندەران گیران و زیندە بەچاڵ کران، هەندێکی تر لە خەڵکی ڕۆشتن بەرەو ئێران و ئەوانی تر هەر یەکەو بەلایەکدا ڕۆشتبوو، واتە گەرەکی کانی عاشقان هەمووی چۆڵ کرابوو.

ئێمەش ماڵی پوورێکم لە موجەمەعی زەعفەی بوو ڕۆشتین بۆ ئەوێ و چەند ڕۆژێك ئەوێ ماینەوە، ئیتر چەند ڕۆژێك دواتر بەعس دەستی کرد بە تەقاندنەوەی خانووەکانی گەرەکی کانی عاشقان و ڕوخاندنیان بە تی ئێن تی و شۆفڵ...

دەنگی تەقینی لەهەموو لایەکی شارەوە دەبیستراو دەنگی دەدایەوە، شار تەواو خامۆش و سامناك بوو، چونکە بەعسی و جاشەکان بەهەموو شوێنێکی شاردا بڵاو بوونەوە، داوای هەویە و ئەسکەرە لە هەموو کەس دەکرا.

ئەوەبوو زۆربەی خانووەکان ڕوخێنران ، لەو کاتەدا هەواڵیان پێ داین ووتیان خانووەکەی ئێوە لە هەرچوار لاوە شۆفڵ ڕوخاندویەتی بەڵام سەقفەکەی و دیوارەکانی ناوەوەی ماون، تارادەیەك ووتمان هەر باشە ئومێدی چاك کردنەوەی هەیە بە ئاسانی ، من لەوکاتەدا بەرێ کەوتم بۆ بینینی خانووەکەمان، چونکە باوکم لەهەڵەبجە نەبوو لەو کاتەدا، هێشتا پرۆسەی ڕوخاندنی خانووەکان تەواو نەبوو بوو، کە گەشتمە لای خانووەکە شۆفڵ دەسی گیر کرد لە سەقفەکەی و بە یەکجاری خانووەکەی هێنایە خوارەوەو تەپوو تۆزی چوو بەئاسماندا و ئەختی زەویان کرد، ئەم دیمەنە بۆ من زۆر ناخۆش و کاریگەر و دڵتەزێن بوو، کە بە بەرچاوی خۆمەوە ئەو شوێنە وێران دەکەن کە هەموو یادگارییەکانی منداڵیم لەو شوێنەدا بووە، ئەوە بوو خۆم پێ نەگیراو چوومە ناو پاشماوەی خانووەکەو دەستم کرد بەگریان و فرمێسك بەچاوانمدا هاتە خوارەوە، چونکە لەو کاتەدا منداڵ بووم، ئەوەندەشم لەبیرە لە سەر ئەژنۆ دانیشتم لەناو پاشماوەی خانووە ڕوخاوەکەداو دەستەکانم بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و بە چاوی فرمێسکاویەوە دوعای زۆرم لە بەعسییەکان و جاشە کوردەکانی ئەو کاتە کرد کەلەگەڵ بەعسییەکاندا بوون لەو کاتەدا، تەنانەت ئەوان ئەم دیمەنەی منیشیان هەموو دی...

ئەوەی شایانی باسە لەو ڕیزە ماڵەی ئەو گەرەکەدا تەنها خانووەکەی ئێمە ڕوخێنرا، چونکە ووتیان بەعسییەکان ووتوویانە ئەم ماڵەدا پێشمەرگەیان نیووە.

ئەمە بەسەر هاتێکی کورتی ڕاپەڕینەکەی ١٣ی ٥ ی ساڵی ١٩٨٧ ی هەڵەبجە بوو کە لە زاکیرەمدا مابوو، واتە ٣٠ ساڵ پێش ئێستە.

**کات نزیکی ١٠ی سەر لەبەیانی بوو، خەڵك کەم کەم کۆدەبوویەوە، خۆپیشاندان دەستی پێ کرد دژی حکومەتی بەعس، خۆپیشاندەران لە گەرەکی کانی عاشقانەوە بەرێ کەوتن بە هوتاف و دروشمی کوردایەتی**

**زۆربەی خانووەکان ڕوخێنران ، لەو کاتەدا هەواڵیان پێ داین ووتیان خانووەکەی ئێوە لە هەرچوار لاوە شۆفڵ ڕوخاندویەتی بەڵام سەقفەکەیی و دیوارەکانی ناوەوەی ماون، تارادەیەك ووتمان هەر باشە ئومێدی چاك کردنەوەی هەیە**

**کەسێکم دی هێندە حەماسەتی هەبوو، سیلاحێکی کلاشینکۆفی پێ بوو تەقەی لە تەیارەکە دەکرد، هەرچەندە کلاشینکۆف هیچ کارگەرییەکی بۆ تەیارە نییە**

## تەرمی خێزانەکەی عەبدورەحمانی دادە قەتەم دۆزییە وە

ئەو ئێوارە یە ی دوا ڕەتی
ئە قاندنە وەکە ی گەڕەکی موردانە
ئە ڤێترایە وە ئێمە وکاك عبدالقادرشادی
لە بە ڕزا بیە کە ی ئە ئێشت ماڵی
ئەحمەد بە گی سۆسە ن، وە ستابوین ،
بە دەم هاوارورازانی خە ڵکی
ترە وە ڕۆشتین وتیان، پیاو و
ژنێك بوون بە ژێرە وە کە گە
شتین کاك عبدالرحمان دە ستێکی
شکاوبوخوا ڕە حمی کردبو لە گە
لی لە بویو بە ژێرەوە بە لام وتی
خێزانە کە م، ئاڵە و بدا بوە بە ژێرە وە،
ماموستا عە بدول وتی ڕە حمە تتان لێ
س هە رکە س لە جیی خۆی
خۆڵ لابدات، ئیتر هە ریە ك لە ئاست
خۆمان دالە وێنە وە و دە ستمان
کرد بە لادانی خۆڵ وبە رد
بە ڕەنگی زەرپهان کە وت کە لە زوودا
بە ڕدی و ا لە چیتی ئیوارادا دادە ترادە
ورە کە بە ئیتر ایەوە و بە فورسی لێی
ئە ویم و بە ڕزم کردە وە ڕیك بە سە
رچە سنە بە وە بو کراسیکی قە زوانی
لە بە ڕدایو هاوارم کرد ووتم ئە مە تا،
ئە وان کە چە ند کە سێك بوون، دوهە
نگاو لە ولاترە وە بون ڕایان کرد بۆلام
، ئە ڕمە کە دە رکراکە ییم وابو
کاك عبدالقادر خۆڵی سە ردە موچاوی
لاداماموستاعبدول هاوارێکی کردو دوو
سێ مە تر ڕای کردە دواوە و پاشان
هاتە وە ئاهە قیشی لە بو چونکە
یە و چارە کە سە عاتە گوشتوپیست بە
دە موچاوی بە وە لە مابو...خیرا دارە
مە یتی مزگە وتی جمهوری یان هێنا و
مرراو من و کاك عبد القادریش گە ڕاینە
وە بۆماڵ.

ئەحمەد ڕەنجبار
نوسەروڕۆژنامەنوس

هەڵەبجە نیوز
لەهەڵەبجەدەردەچێت سالی دووەم ژمارە(٢٦)مارسی ٢٠١٣
مۆبایل:٠٧٥٠٨٢٥٤٦٠٦
فەیسبوک هەڵەبجەنیوز halabja news


## دوالاپەرە

ئەی خالقی من
با تائێستاش ئاواتەکانم بەدینەهاتبن،بەلاَم من بەدڵێکی پڕەوە بەردەوام
ئەبم لەدۆعاکانم چونکە تۆ،فەرموتە:دۆعابکەن،من وەلاَم دەدەمەوە




### مریەم هەڵەبجەیی

پێم خۆشە پێمەوە بە عزوزەیەکی دوازدە ساڵە، کراسێکی گوڵگوڵیم لەبەر بێ و سەبەتەیەکی سپی بە قۆڵمەوە هەڵواسیم و تەنیشتو بچمە بەر دەرگای هەموو ماڵێکی هەڵەبجە و داوای بەرات بکەم. خەڵاتی من لەم شەوی بەراتەدا جیاوازە، چونکە من نە چاوەڕوانی نوقڵ و نەبات، نە ئامەزرووی هیچ جۆرێکی تری خەڵاتم! چاوەڕێم لە بەر دەرگای یەکێک لەو ماڵانە ژنێکی میهرەبان بێت و پێم بڵێ من دایکی راستەقینەتم! دایکت ناوی لەو خەڵاتە خودایە! بۆچی دەبێ دۆزینەوەی تۆ ئەوەندە سەخت بێت دایە گیان! بۆچی دەبێ ئەوەندە چاوەڕێ بم؟ بۆچی دەبێ نەزانم چەندی تر چاوەڕێ بم خودایە! ئاخر تۆ لە کوێی دایە؟؟ پیاوێکی لەدوور بانگم بکات: ڕوڵە ڕاوەستا، بابە گیان وە ڕا باوەشی بابە ت.. دە زانیت چەن ساڵە چاوەڕوانی بوونی تۆم کچە کەم من باپی تۆم کە سی تۆم ! ئاخ باوکە گیان ئە م هەموو چاوەڕوانی منی کشتوو.. بە س پێم بڵێن دایک و بابم ماوان یان مردوون

لەئەکاونتی نوسەرەوە وەرگیراوە

KH
WWW.FACEBOOK.COM/KANALEHALABJAZ
هەڵەبجە 1972

هەڵەبجە و مێژوو:وێنەیەکی هەڵەبجە لە١٩٧٢دا

بایەخ بە کاروباری پارێزگای هەڵەبجە دەدات
ژمارە(١٧ و ١٨)
١٦ی حوزەیران و تەمموزی ٢٠١٧
خاوەن ئیمتیازوسەرنوسەر
سەلاح سەعید ئەمین

هەڵەبجە نیوز
Halabja News

# خەڵك تەواو ماندووگەنجان بێزارن

## هەڵەبجە شاری چایخانە و بەتاڵە

بریار سان

هەررۆژەو روو لەبازاردەکەیت سەیر دەکەیت دوکانێکی تازە کراوەتەوە کەپێشتر داخرابوو یان خەریکی نۆژەنکردنەوەی بوون ،وورد سەرنج بدە کراوە بەچایخانە کاکە خۆ چایخانە بۆپشویەکی کورت و چایەکی دیشلەمەو بینینی دوو دۆست و هاورێ پێویستە بەڵام نەك بەوێنەی هەڵەبجە واخەریکە هەموناوبازار دەبێتە چایخانە، قەساب، شیرینی، دوکانی وشکە، ماست فرۆش وفەرش فرۆشو ئاسنگەروو فیتەرو پۆشاکو پێلاو فرۆش و کارەبایی و زۆریتریش دوکان هەڵدەگرن لەتاو بێ بازاری شوێنەکەیان دەبێتە چایخانە ،یارەب ئەم شارە نە کارێك، نە پرۆژەیەك نە کارگەیەك ،نە بازرگانییەك هیچ هیچی تێدانییە هەموی بەیانیان دەوامیان لەچایخانەو ئێوارانیش هەر چایخانە ئاخر ئەم خەلکە بەتاڵە مەگەر هەر چایخانە ئامێزیان بۆ بگرێتەوە من تێناگەم ئەم هەموو دامودەزگا حکومی و رێکخراوی مەدەنی و پارێزگاو ناوی زل و شاری وێرانە ناپرسن ئەم هەموو مالە رۆژانە لەم شارە باردەکەنو دەرۆن لەهەمو گەرەکێکی ئەم هەڵەبجە سێ بۆچوار لافیتە هەلواسراوەو نوسراوە خانوو بۆ کرێ هەر لەبەر بەتالیو بێ کاری رادەکەن رۆژێك دێت ئەم بەناو پارێزگایەمان تەنها بمێنێتەوە خانوی چۆڵ و دوکانی چۆل و شەقامی چۆل و یەك دونیا پۆستی حکومی و حزبی بێ مانا.

### یارەب، ئەم شارە نەکارێك، نە پرۆژەیەك نەکارگەیەك،نەبازرگانییەك هیچ هیچی تێدا نییە

- لەئەکاونتی نوسەرەوە لەفەیسبوك



وەرگیراوە

## باوکێك منداڵەکەی دەکات بەژێر ئۆتۆمبێلەوە

لەناحیەی خورماڵی سەر بە پارێزگای هەڵەبجە، باوکێك منداڵەکەی خۆی دەکات بەژێر ئۆتۆمبیلەوەو دوای گەیاندنی بۆ نەخۆشخانە، گیانی لەدەستدا.عەزیزشەوکەوت، بەرێوەبەری مەلبەندی تەندروستی شەهید عەلی شیعە، لە خورمال، بە SNNی راگەیاند:» بەهۆی رووداوێکەوە، کە باوکێك منداڵەکەی خۆی کردبو بەژێر ئۆتۆمبیلەوە، هێنرایە نەخۆشخانە، بەلام پێش ئەوەی کاری پێویستی بۆ بکەین، گیانی لەدەستدا.
وتیشی: منداڵەکە تەمەنی ١٨ مانگە و تەرمەکەی رەوانەی پزیشکی دادی هەڵەبجە کراوە.
عەزیز شەوکەوت ئاماژەی بەوەشکرد، لەلایەن پۆلیسەوە پەراوی لێکۆلینەوە بۆ رووداوەکە کراوەتەوە.

SNN کۆسار مەحموود

## دەستەی چاودێری پارێزگای هەڵەبجە بەیاننامەیەکی بلاوکردەوە
## پشتیوانی لەکەرکوك و رەخنەی لە لایەنەسیاسیەکان گرت

( بەناوی خوای گەورە )
راگەیەنراوی دەستەی چاودێری پارێزگای هەڵەبجە وەك ئاشکرایە ئەمرۆ رۆژی دادگاییکردنی بەرێز رێبوار تاڵەبانییە لەسەر پرسی هەڵکردنی ئالای کوردستان لە کەرکوك !.
ئێمە وەك دەستەی چاودێری پارێزگای هەڵەبجە پشتگیری خۆمان بۆ بەرێزیان دووپات ئەکەینەوە و ئەو کەیسە بە کەیسی هەموو کوردێکی بەشەرەف ئەزانین و داواکارین لەسەرجەم خەڵکی کوردستان بەهەموو رەنگەکانەوە کاك رێبوار و هاوشێوەکانی بەتەنها جێ نەهێڵن و بەدەنگ بێن لەسەری.
لەلایەکی ترەوە ئیدانەی بێهەلوێستی و بێدەنگی زۆربەی لایەنە سیاسییەکان و میدیا کوردییەکان ئەکەین و پێمان وایە ئەم بێدەنگییەیان هاوئاوازییە لەگەڵ بەغدا دژی کەرکوك و کوردستان..
سەرکەوتن بۆ ئیرادەی خەڵکی کوردستان..
( دەستەی چاودێریی پارێزگای هەڵەبجە ) ٣ی٧ی٢٠١٧

## هەڵەبجە یەکەمی هەرێم بو



راڤیار جەبار لەقوتابخانەی سازگار یەکەمی هەرێم بو لەتاقیکردنەوەی نیشیمانی پۆلی نۆهەمی بنەرەتی،ئەمە لەکاتێکدا هەڵەبجە ناوچەیەکی سەرسەختی بایکۆتی خوێندن بو.

# سەرگوزەشتەی دکتۆر هۆشیار

ئەو روداوەم قەت بیرناچێ،یەکەم پاروم خوارد دوەمم گرت تا ئێستەش نەمخواردوە،رۆژی ٤ شەم بوو لە فریاکەوتنی هەڵەبجە یەکسەر کارمەندێك ووتی دکتۆر راکە سەیارەیەك زۆر خێرا هات،کە چوم ژنێکی شێواوبو هەمو جلەکانی تەڕ و قوڕاویبون بە پێپەتی منالێك بە باوەشیەوە بو ڕای ئەکرد بەرەو ژوری پێشوازیەکەو ئەی قیژاند و تا ئەیتوانی هاواری ئەکرد دکتۆرگیان کورەکەم مرد.

ڕاستی ئەڵێم ئەم ڕۆژانە زیاتر خۆم وەك قارەمانێ ئەهاتە پێشچاو کە شمشێرەکەم هەندێ کەس بریندار ئەکات بەڵام ئەتوانێ شارێك رزگار بکات،نزیکەی ٢٥ شەو نەمهێشت تەواری هەڵەبجە دابخرێت، بە بەردەوامی و بێ وەستان دەوامم کرد بەبێ ئەوەی هیچ شەوێك تا بەیانی ١ دەقیقە بخەوم،چونکە پزیشکە موقیمەکانی هەموو نزیکەی زیاد لە مانگێکە مانیان گرتوە(لەسەر مافی رەوای خۆیان)،لە کاتێکا هەمو شەو رۆژێك تەواری پێویستی بە ٢ یان ٣ پزیشك هەیە،نازانم بەرامبەرچی بەتەنیا ئەوەم کرد گرنگ نیە گرنگ ئەوەیە هیچ دکتۆرێکی ئەم دەڤەرە بە هیچ بەرامبەرێك ئامادە نەبو تەنها یەك شەو تابەیانی لە تەواری بمێنێتەوە،لەگەڵ ئەوەی کە فەرز نەبوو لەسەرشانمان و چەند ساڵە ئەو مەرحەلەیەمان جیهێشتوە چەند کەسێك ئەهاتن دەوامیان ئەکرد شیاوی رێزن بەڵام تەنها ئەوەندە بوو کە من بتوانم لە شەوو رۆژێکدا ٦ سەعات بخەوم و ئیسراحەت بکەم و بگەرێمەوە تەواری،باوەر بکەن لەو ٦ سەعاتەشدا هەر خەوم بە نەخۆش و بریندارەوە ئەبینی،جگە لەوە مەجالی نان خواردنێکیش زەحمەت بوو بۆم.

بە خێرایی چومە سەری تەنیا جەستەیەکی زەرد هەڵگەراوی بێ گیانم بینی لەوانەی کە ئەیبینی و بەبەرخۆتەوە ئەڵێی هەر پار مردووە نەك ئەمساڵ،بە خێرای دەستم دا لەسنگی جەستەیەکی سارد سارد وەك ئەوەی لە حەوزی سەهۆڵ دەریان هێنابێ قەترە قەترە ئاو لە سەر سنگ و رومەتیەوە یەوە خلۆر ئەبویەوە،منالێکی ناسك و تا بلێی جوان بو نزیکەی ٦-٧ ساڵ سەماعەم خستە سەر دلی هیچم نەبیست سەیری چاوم کرد بیلبیلەکانی کرابونەوە نەبزی نەئەدۆزرایەوە لە چاوتروکانێکا ئەمانەم کرد وتم جیهازە (D.C) یەکەم بدەنی کاتی خستمە سەر سنگی تەنانەت یەك لێدانی دلم نەئەبینی،ئەمانەم ئەکردو پرسیارم ئەکرد،دایکی ئەیوت بەخوا چوین بۆ بۆ باخ ئاگامان لە هیچ نەبووە ئەملا شەنکار ئەولا شەنکار لەپر نەما،کە بۆی گەراین کەوتبویە حەوزەکە، ووتم لەوێ تا ئێرە ١٠ دەقیقە رێگە ئەبێ؟ووتی زیاترررر ئەوەندەیتر بێ ئومێدی ئەکردم،چونکە ئەمزانی لە زانستی پزیشکیا ئەکرێ تا دە دەقیقەش دل بوەستێت بیبوژێنیتەوە،بەڵام وەڵامەکان بۆم دڵخۆشکەر نەبون،لەگەڵ ئەمانەش دایکی پرچـــی خۆی ئەرنی و قۆلی ئەگرتم تووووخووووا دکتۆر شتێ بکە توخوا با کورەکەم نەمرێ لە هەمو دلتەزێنتر برایەکی گەورەتری بۆ کە دواتر لێم پرسی وتی ١١ ساڵم، کە ئەگریاو خێرا خێرا ئەیوت دکتۆر شەنکار ئەمرێ؟

ئەمانە هەمو لە چەند چرکەیەکا رویان ئەدا لەگەڵ ئەوەی زۆر هیلاك و شێواو بوم بەڵام ئەبو کورت نەهێنم چونکە هەمو رۆژێك ئەموت تا سبەی بر ئەکەم و تواناى فیکریو جەستەییم نامێنێ بەڵام رۆژی دواتر گورێکی زیاترم هەبوو،تەنانەت خوێنی ٣ رۆژ پێش بە کراسەکەمەوە بو کە مەجال نەبو بچمەوە ماڵەوە بیشۆم، هەینیەك چومەوە کە گەشتمە ماڵەوە ئەوەندە ریشم هاتبوو خوشکەکەم ترسا خەریك بو نەمناسێتەوە یەکسەر ووتم جێگەیەك بۆ خەوتنم ئەوێ، بە دەم خەوەوە چەند جارێك ووتبوم:دادە تۆ پێشتر جەڵدە لێیداوی؟کوڕە نەوەڵا هههە ئەی قاچیان بۆ بریتەوە کورە ناوەڵا هههههە دە باشە برۆ وەرەقەیەکی پۆلیس بهێنە هاهاها،

بەهەرحاڵ ووتم بە هاوکارانم یاڵا کاکە حەمە CPR... تا توانیمان سنگی منالەکەمان شێلاو ئەترۆپینیشمان بۆ کرد بەڵام تەنانەت یەك لێدانی دلیمان دەست نەئەکەوت،من کەس و کارەکەیم ئەبینی نەمئەتوانی باوەر بهێنم کورەکەیان مردوە،بەڵام ڕاستی بلێم هیچ ئومێدێکم نەبو، باوکیم ئەبینی سوجدەی ئەبردو ئەپارایەوە،دایکی بە تەواوی ئەچەمیەوەو قاچی منی ماچ ئەکرد پێم ناخۆش بو بەڵام کات وەك بروسکە تێئەپەری و نەمەتوانی رێگری بکەم،١٥ دەقیقە تێپەری و لە مردویەك زیاتر هیچ لە بەردەستما نەبو،بەردەوام بوم




لە CPR زۆر هیلاك بوم هەموگیانم بو بە ئاو،ژوری پێشوازیەکە زۆر گەرم بو کراسەکەمم کردەوە عارەق بە نێوچاوانو لا ملما ئەهاتەخوارو ئەکەوتە سەر سنگی منالەکە راستی بلێم قژم تەواو بێزاری کردبوم،ئەوەندە بێ ئومێد بوین هەندێ لە هاوکارانم لە ژێر لێوەوە وتیان عەزیەتی مەدە دکتۆر تەواو بووە،من هەرگیز جورئەتی ئەوەم نەبو بلێم مردووە،ووتم با بەردەوام بین بەس یەکێکتان بیخەنە سەر لاو بۆم بگرن یەکێکیش هەناسەی بداتێ،دەستم پێکردەوە،تا گەشتە ئەوەی باوکەکەی باوەری هێنا کە مردوەو ووتی توخوا دکتۆر گیان عەزیەتی مەدەن،برا گەورەترەکەی لە هەمویان زیاتر پشتی ئەشکاندم و ئەیوت توخوا دکتۆر مەلێ مردوە،دایکیشی خەریك بو لەسەر قاچم ببورێتەوە،بۆیە نەمئەتوانی بلێم بەڵام بە جولەو چاو ئەمویست تێبگەن کە مردوە،زیاتر هەولم لەگەل دا ستافەکان زۆر هیلاك بون لەگەڵم راستی من بە بی هاوکاری ئەو کارمەندانە هەرگیز نەمئەتوانی ئەو رۆژانە کار بکەم،هەرچەند هەمیشە گلەییان لە خەلکەکەش و کاربەدەستانیش هەیەو کەمتر رێزیان لێ ئەگیرێت.

ئەمجار جیهازم خستە سەر سنگی منالەکە یەك دوو لێدان هەبوو بەس ووتم هیچ نیە کاریگەری دەرزیەکانە لەبەردەوام بون لەگەلی لە پر منالەکە هێلنجی دا نازانم چەند لیتر بو ناشزانم لە گەدەیەوە بو یا سیەکانیەوە،ئاوو قەوزەی هەڵهێنایەوە،هەمو دەموچاومان روناك بویەوە هەمو نیشانەیەکی سەرسورمان و بزەیەك بە ناوچاوانمانەوە بوو،بەڵام زیاتر لە هی ئەوە ئەچو زۆر پەستانمان خستبێتە سەر سنگ و سکی،لە کەس و کارەکەی زیاتر موحتاجی هەناسەی منالەکە بوم،بەڵام نەبوو.....

شانازی ناکەم و حەزیشم لە شانازی نیە چونکە هەمو پزیشکێکی هاورێم چەندینجار ئەوەی ئەنجامداوە،بەڵام ئەزانم هەموکەس تا ماندوبونە کەمەکەی خۆی وەستابێ هەرگیز ئامادە نیە ماندوبونە زۆورەکەی تۆ بگەیەنێت بۆ خۆ بردنە پیشەوە،راگەیاندن جگە لە چەواشەکاری و هێرش و نەهێشتنی متمانە کوا هەوڵیان ئەنرخێنێ بەو موچە کەمەوە،

بەڵام ئیتر ئەمە هەڵەبجەیە، ئەمسوتێنێ و ناتوانم خۆشمنەوێت،جگە لەوەی هەمو کەسی لێسەندومەتەوە هیچی پێ نەبەخشیوم بەڵام دور بم لێی سەرمای غەریبە ئەمخوات...

بەردەوام بوین بە ئومێدی زیاترەوە ئەمجار چێکم کردەوە هەستم بە نەبزی کرد دلی لێی ئەدا ئۆکسجینما دایێ و هەناسەی ئەیا،DC م خستەسەر دلی بەتەواوی و خێرا لێی ئەدا،دایکی هاواریکرد کورەکەم هەناسە ئەیا،باوکی ئەیوت دکتۆر گیان شتێ بکە کورەکەم ماوە هەمو ئەگریان فرمێسك وا تێکەڵبوبو نەتئەزانی هی خۆشیە یان مەرگ، دیواری نیوان ژیان و مردن تەواو تەنك بوو لەوێ،شەنکار هاتو چۆی ئەکرد لە نێوانیا ئێمەش هەروەها دایکی چەندینجار مردو زیندوبویەوە،ئەوانیتریش، منالەکە دوای ٢٠ دەقە توشی لەرزینێکی زۆر بو کە بە چەند کەسێك ئەنجا ئەمنتوانی کۆنترۆلی بکەین،کە لێی دلنیابومەوە دامنا و ووتم دەوری چۆلکەن،هاتمە دەرەوە ژمارەیەکی زۆر نەخۆش چاوەرێم بون بەڵام هەمو هەوالی منالەکەیان ئەپرسی و خۆیانیان لە بیر کردبوو،هاتمە شوێنەکەی خۆم دانیشتم باوکی و دایکی بەردەوام ماچیان ئەکردم،یەکێ وتی ئەوە دکتۆرەکەیە وەڵا لە دکتۆر ناچێ،ووتم لە حەزرەتی عیسا ئەچم؟وتی ئەرێوەڵا بە سەلیبەکەوە،ووتم ئاخر شێوەم یا ئیشەکەم؟وتی وەڵا هەردوکیان بەس ئەو مردوی زیندو ئەکردەوە هههە.

من زۆر خۆشبەخت بوم بەتەواوی چێژم لە ئیشەکەم ئەبرد،هەمان ئەو چێژە بو کەلە عەزفکردنی مۆسیقا ئەمبرد،هەر ئەو چێژەبو کە لە هەڵسورانی قامیشی خۆشنوسی لە نیوان پەنجەمدا بو،هەر ئەوەی کە تازە دوتەل ریشم هاتبو لە مزگەوت ئەچومە سوجدەوە.تەقەل و کۆردی گیتارو تەزبیح و فلچەی پر لە رەنگ بۆ من ئەزمونی هەمان چێژن،چومە دەرەوە هەوایەك هەلمژم هەستم ئەکرد میهرەبانترم،دلم پاکترە،رۆحم سوکترو خوێنی دەمارەکانم گەرمترن،هەستم ئەکرد پشیلەکە ئاسانتر سەیرم ئەکات،هەوا فێنکتر لێم ئەیا،گوڵی حەوشەکە بە چاوم جوانترن،درەختەکان هاژمیان سافترە،لە چیمەنەکە راکشام خەیالی قول بردمیەوە،نازانم خەوم لێکەوتبو یان نا لە پر راچلەکیم بە هاواری کارگوزارێك:

دکتۆۆۆر.....دکتۆررررر....حادیسەیەك هات کورێکی گەنجە راکە زۆر خەتەرەەەەەەەەە.......

..............................

داوای لیبوردن لە موقیمە مانگرتوەکان ئەکەم کە شوێنەکەیانم پرکردبێتەوە،ئەوەی شارەزای فەلسەفە بیت ئەزانی چ بەپێ قوتابخانەی سودمەندگەراکان یان ویژدانگەراکان کاریکی باشم کردوە،ئەم بەیانیە یەکیکیان گلەی کرد ووتی ئیشی ١٠ دکتۆرت خراپ کرد،هیچم بەو نەوت بەلام لە دلی خۆما ووتم (ئیشی ١٠ دکتۆر کەلەسەر حەقیشن خراپ بکەی یان شەنکار بمریت؟کامیان؟؟؟)

- لەفەیسبوکەوە

# چیرۆکی ئێمە لە ١٦ ی ٣ ی ١٩٨٨ دا

هیوا موحەمەد کەریم

بەشی سێهەم و کۆتایی

کات نزیکی عەسر بوو، لە شارۆچکەی عەربەتەوە بە ئۆتۆمبیلە سەربازییەکان بەرێ کراین بەرەو سلێمانی و لەوێوە بەرەو باینجان، دیسان لە جێگەیەکی دەشتی چۆڵەوانی فڕێ دراین، کە ئەوەندە چۆڵ بوو گیانداریشی تێدا نەدەژیاو هیچ شتێکی ژیانی تێدا نەبوو، برسێتی زۆری بۆ هێنابووین، ئەوەی دوومەتر لایلۆنێکی پێ بوایەو هەڵی بدایە بۆ خێزانێك پاشا بوو، ئەوەی پاچ و خاکەنازی پێبوایەو چاڵێکی هەڵکەندایە کە شوێنی سێ چوار کەسێکی تێدا بوایەتەوەو بچونایەتە ناوی مەلیك بوو، ئەوەشی پێی نەبوایە ئەوا ئەو بەتانییەی کە پێی بوو هەر لە زەوییە ووشك و برینگەکەدا بەتانییەکەی بەخۆدا دەداو کەمێك لەسەرمای شەو دەپاراست.

لەو کاتەشدا بایەکی بەهێز هەڵیکردبوو، ئەو کەل وپەل و ماڵەی کە پێمان بوو لەو زەوییە تەخت و ووشکەدا هەوا هەر جارەو بەلایەکی دا دەبرد، لایلۆنەکان رەشەبا دەیبردن بەئاسماندا، ئەوەی کەپرێکی بە قامیش دروست کردبوو ئەویش دەروخا....

لەبیرم دێت باووکم لەو کاتەدا هێندە نارەحەت و نیگەران بوو بوو، هەم بۆ خۆیی و هەم بۆ ئێمەی منداڵ، زۆر جار ناشکوری بەدەمدا دەهات...

چەند رۆژو شەوێکی تریش لەوێ ماینەوە، پاشان شەوێکیان ماڵی پورێکم کە لە سلێمانی دەژیان هاتن بە شوێنمانداو سەیارەیەکمان بەکرێ گرت و بەهەزار حاڵ و بەدزییەوە رۆشتین بۆ ماڵی ئەوان لە ناو شاری سلێمانی ، چونکە بەئاشکرا دەرچوون قەدەغە بوو.

بەڵام دوای چەند رۆژێك ئەو خەڵکەی کە لەوێ مابونەوە بردنیان بۆ گردەچاڵ لە شاری هەولێر.

گەشتینە ماڵی پورمان و چەند رۆژێك لە ماڵ ئەوان ماینەوە(ماڵیان ئاوا بێت)، ئێوارەیەك هەموو پێکەوە لە سەر سفرەیەك نانمان دەخوارد، لەپڕ خاوەنی ئەو خانووەی کە ماڵی پوورم کرێچی بوون تیادا، هات و ووتی دەبێت هەر ئەم شەو ئەو ماڵە هەڵەبجەییە لێرە نەمێنن و برۆن!!!

چونکە موختاری گەڕەکەکە، کە بەعسی بوو، ووتی ئاگادار کراووین لە رێی شێخ جەعفەری قایماقامی سلێمانییەوە هەر ماڵە هەڵەبجەییەك لە هەر خانوویەکدا بێت، ئەوا خانووەکەش دەروخێنن بە سەریاندا!!!!

بۆیە ئێمەش هەر ئەو شەوە بەپەلەپەل خۆمان کۆکردەوە، تەنانەت نەماتوانی نانی ئێوارەش بخۆین، ئەو شەوە باوکیشم لەماڵ نەبوو، سەیارەکمان گرت و ووتیان لە دەرەوەی سلێمانی لە گوندی ژاڵە چەند دەواجینێکی چۆڵی لێیە دەچین بۆ ئەوێ، ئیتر هەر ئەو شەوە رۆشتین بۆ ئەو شوێنە، لەوێ ماینەوە، هەرچەند شوێنێکی ناخۆش بوو، چۆڵەوانی بوو، دەبوایە بەهەزار دەردەسەری جاروبار بهاتیتایەوە بۆ سلێمانی و هەندێك شتت بکریایە، بەڵام لە ترس و راوەدوو نانی بەعسییەکان رزگارمان بوو ماوەیەك.

کەرۆشتین لەوێ ماڵێکی تری هەڵەبجەی خزمی خۆمانمان بینی ئەوانیش هاتبوون بۆ ئەوێ ئەو شەوە،کە ماڵی خاڵێکی دایکم بوو بەناوی خاڵە عومەر ( خوا لێی خۆش بێت)، کەلەماڵی م. عوسمانی برایدا بوو، کە خاڵە عوسمانم هەر خۆیان ماڵیان لە سلێمانی بوو پێشتر.

نزیکەی ٢٠ رۆژێك لە گوندی ژاڵە ماینەوە، هەرچەند لەوێش ترسمان لەسەر لانەچوو بوو، بەڵام پاش ماوەیەکی تر بۆ ئەوەی شوێن بگۆڕین و ئاشکرا نەبین، باوکم ووتی دەچم لە جێیەکی سلێمانی خانوویەك دەگرم بە کرێ ، بەڵام تکایە کە رۆشتین کەستان لە



دەمتان دەرنەچێت بڵێن خەڵکی هەڵەبجەین..

ئەوە بوو ماوەیەکی زۆر گەڕا بۆ خانوو، بەڵام خانوو دەست نەدەکەووت، باوکم دەیووت خاوەن خانووەکان پرسیاری زۆر دەکەن لەو بارەی هەڵەبجەیی بونەوە، چونکە زۆربەی خاوەن خانووەکان ئاگادار کرابونەوە کە نابێت خانوو بدەن بە ماڵە هەڵەبجەیی بەکرێ، یان لە کێشە دەترسان هەندێکیان، وە باووکم دەیووت پرسیار دەکەن و دەیانووت ئایا پاچ و خاکەنازتان هەیە( کە مەبەستیان کوروو کچی زۆر بوو )، ئێ وەڵا ئێمەش ماشاللە دنیایەك پاچ و خەکەناز بووین لەماڵەوە..

باش بوو جارێك باووکم تەنها ژورێکی دەست کەوتبوو لە شاری سلێمانیدا، لەخانویەکدا کە تازە دروست کرابوو هێشتا گەچ و چیمەنتۆکەی پێوە بوو، دەبوایە خۆمان پاکمان بکردایەتەوە، ئەوەبوو هاتینە ناوی و ماوەی نزیکەی ساڵێك بە ترس و لەرزەوە تیایدا ژیاین، بەڵام هەمیشە دڵمان لە مشتماندا بوو کەی ملازم شەماڵ و جەماعەتەکەی دەکەنە سەرمان ، چونکە هەر لەو شوێنەی کە ئێمەی لێ بوو بەبەرچاوی خۆمانەوە چەند ماڵێك بە شۆفل روخێران و ووتیان پێشمەرگەی تێدا بووە، ئەو دیمەنانە ئەوەندەی تر دڵی ئێمەی راچڵەکاندبوو..

رۆژێکیان شەوەکەی باوکم نەهاتەوە بۆ ماڵ، وەبوو بە هەفتەیەك دەنگو باسی نەبوو، دوایی بیستمان ووتیان ئەوەی هەڵەبجەیی بوبێت لە بازار گیراوون و برراوون بۆ سجن، لەدوایشدا بردبونیان بۆ هەولێر و گردەچاڵ لەوێ باش بوو ئازادیان کردبوون و دوای ماوەیەك هاتەوە بۆ سلێمانی.

ئیتر ئەوە کەس نەیدەوێرا باسی خوێندن بکات، چونکە منداڵە هەڵەبجەیی قەدەغە بوو کە بخوێنێت لە قوتابخانەدا، بۆیە هەموومان خوێندنی ئەو ساڵانەمان فەوتا، هەرچەند زۆر حەزیشمان لە خوێندن بوو، بۆیە دەستمان کرد بە کاسپی کردن و ئیشی دەست گێڕی لە بازاروو کۆڵانەکاندا.

لەبیرم دێت جارێك بەلای دوکانێکدا رۆشتم گوێم لەم گۆرانییە بوو کە دەیووت :

( ئەگەڕێمەوە بۆووڵاتەکەم ..دەگەڕێمەوە بۆ ووڵاتەکەم.. دوژمن پێی خۆش بێت یان پێی ناخۆش بێت ئەمرۆ یان سبەی دەگەڕێمەوە بۆ ووڵاتەکەم...)

ئیتر منیش یەکسەر دەستم کرد بەگریان و فرمێسك بە چاوەکانمدا هۆن هۆن دەهاتنە خوارەوە، چونکە هێندە ئازاروو نارەحەتییمان چەشتبوو دڵمان ناسك بوو بوو، گریان ئاسان بوو بۆمان، بەڵام لەهەمان کاتدا هیوایەك لە ناخمدا چەکەرەی کرد و ووتم خوایە تۆ بڵێی رۆژێك بێت کە بگەڕێینەوە هەڵەبجەو لەم کولە مەرگی و خەمە رزگارمان بێت، چونکە زۆر بیری هەڵەبجەشمان دەکرد ئیتر لەو کاتەوە تا ئێستەش حەزم لەو گۆرانییەو راستەو خۆ چەند کۆپلیەکم لێ لەبەر کرد، چونکە بەدڵ گوێم لێ گرتبوو، هەر لای ئەو دووکانە مامەوە تا گۆرانییەکە تەواو بوو، ئیتر شوێنەکەم بەجێ هێشت...

ژیانمان تا ماوەیەك بەو شێوەیە بەردەوام بوو، بەڵام تا بۆمان بکرایە و کەشف نەبوینایە نەمان دەووت کە هەڵەبجەیین، تا رۆژێك دیسان خاوەن خانوو هات و پێی ووتین دەبێت لێرە برۆن و بارکەن هەڵەبجەیی دەگرن!!!!

ئای خوایە هەڵەبجەیی بوون چەند زەحمەت بوو بۆ ئێمە، ئەمانە چەند قورس و گران بوون، چەند ئازار بەخش بوون ، چەند نیگەرانی دەکردین، چەند هەستمان بەو ستەمە دەکرد کە لێیان دەکردین......

بۆیە ئەمجارە بریارماندا سلێمانی بەیەکجاری بەجێ بهێڵین و برۆین بۆ مەجموعەی باریکە. باووکم ووتی ئەمە ناکرێت هەموو رۆژێك بێنە سەرمان و کێشەمان بۆ دروست کەن.

هاتین بۆ باریکەو لەوێ ژیانمان بەرێ کرد، بەڵام ئێمە لە خوێندن بێ بەش بووین تا رۆژێك ووتیان مژدە مژدە هەڵەبجەییەکان وەردەگیرێن لە خوێندن، دەستمان کردەوە بە خوێندن و تا راپەرینەکە رویداو حکومەتی بەعس رووخا، پاشان پێشمەرگە هاتنە ناوو شار.

لەبیرم دێت خەڵك دەچوون بۆ هێنانی شتی گرانبەها لەو شوێنانەی کە بەعس و سەربازگەی تێدا بوو، منیش رۆشتم بەڵام دەستم بۆ شتی تر نەبرد و حەزم نەکرد هیچ شتێکی تر بەرم، بەڵکوو هەندێك قیناع( دەمامك)ی دژە کیمیاییم هێنایەوە، خەڵك دەیووت ئەمەت بۆچییە!!!!!!، لەراستیدا من پێشتر ترسابووم لە کیمیایی ، بەڵام ئەوان نەیاندەزانی کیمیایی چییە.

بەهەر حاڵ دوای چەند رۆژێکی کەم لە ئازاد بوونی کوردستان لە ژێر چنگی رژێمی بەعسی خوێنرێژ، سەیارەیەکی دووتەنیمان گرت و گەراینەوە بۆ هەڵەبجە، منیش لەسەر سەرەوەی سەیارە دووتەنیەکە دانیشتبووم، هەوا لێی دەدام لەکاتی گەرانەوەماندا بۆ هەڵەبجە، بەدڵێکی زۆر زۆر خۆشەوە گۆرانییەکەی (ئەگەڕێمەوە بۆ شارەکەی خۆم دوژمن پێی خۆش بێت یان پێی ناخۆش بێت)، بەدەیەها جار دووبارەم دەکردەوە بە دەنگی بەرز...

هەرچەند کە هاتینەوە بۆ هەڵەبجە هاتینەوە سەر شارێکی سوتاو، شارێکی وێران، شارێکی رووخاو، شارێکی چۆڵ، شارێك بێ ئەوەی هیچ شتێکی بۆ ژیان تێدا مابێت، تەنانەت ئەو کاتە کە ئێمە هاتینەوە چەند ماڵێکی کەم بووین لەناو هەڵەبجەدا بە پەنجەی دەست دەژمێرراین، ئەگەر ماڵێك یان کەسێکت لە کۆڵانێکدا بدیبایە، یان لە شەودا چرایەکت بدیبایە کە بسوتایە و رووناك بووایە زۆر دڵت پێ خۆش بوو، لەترس رزگارت دەبوو، چونکە ئەو کاتە هێشتا هەڵەبجە بۆنی مەرگ و خەمی لێ دەهات، هێشتا بە بێ ترس نەمان دەتوانی ئاوی ناو بیرەکان بخۆینەوە، بەترسەوە دەستمان لە هەندێك کەل و پەل و شت دەدا نەوەك کاریگەری کیمیاییەکەی لەسەر مابێت....

سەیارەی زیل و دەبابەو مودەرەعەی سەربازی سوتاو هێشتا لە کۆڵانەکاندا بە سوتاوی مابوون.

بەڵام سەرەرای ئەمانە هەر دڵت بەشارەکە خۆش بوو، هیوات پێی هەبوو، کە رۆژێك لە رۆژان بەتەواوی ئاوەدان دەبێتەوەو خەڵك هەموو بۆی دەگەرێنەوە...

ئەوە بوو سەرگوزشتەی ژیانی ئێمە، کە بە دڵنیایی نمونەی ژیانی زۆربەی هەڵەبجەیەکانیش بوو.

بەهیوای ئەوەی زۆر ماندووم نەکردبن و سودێکتان لەم باسە تولانییە کورت کراوەیە بینیبێت. وەهەروەها نەوەی نوێش بەرچاویان روون بوبێتەوە کە ٢٨ ساڵ لەمەو پێش چی بەسەر کەس و کاروو ئەوانەی پێش خۆیاندا هاتووە..

١٧ ی ٣ ی ٢٠١٧.

هەڵەبجە نیوز
لەهەڵەبجەدەردەچێت ،ساڵی دووەم ژمارە(١٧ و١٨) حوزەیرانو تەموز
دوا لاپەرە
موبایل:٠٧٥٠٨٣٥٤٦٠٦
فەیسبوک :هەڵەبجەنیوزحلبجە نیوز

مەرج نیە
ئەوەی خودا منداڵی پێدا دایك بێت،ئەوەی خودا مناڵی
پێدا باوك بێت،رەنگە هەندێك هەر بەناو خوشك و برابن

## ( بەسۆرانی .. بۆ پیاوە رۆح سپییەکەی بەهۆرامی )

وەرزێر حمەسەلیم



رق رقی لێت بوو
کە نەت ئەزانی رق چی یە !
زیز بوون لێت زێز ئەبوو کە
ئەیزانی
بەینت لەگەڵیا خۆش نی یە !
پێکەنین لێت بێزار ئەبوو کە
ئەیبینی
رێگەی نادەی لە روخسارت
بێتە خوارێ
شەرم شەرمی لێ ئەکردی
کەتۆی ئەدی
حەیا لە سیمات ئەبارێ !

ئەرێ بەراست ؟
تۆ کورێ چ سەردەمێك بووی
؟
کە قەت لە ئێستا نەئەچووی ؟!
هیلاکیت ماندوو کردبوو
کەچی خۆت ماندوو نەئەبووی
!!
پێشمەرگە بوویت
هەر بەشاخا هەڵ ئەگەڕای
شێوەکار بوویت فڵچە ڕەنگی
دائەنای
شاعیر بوویت و شیعرت ئەکرد
بە بەرامە
پێشکەشکارو وێنەگر بوویت
هەورامانت ئەکرد بە گۆرانی و
چامە
لە سەفەرو لە سەیرانا
لە پیاسەو لە گەرانا
چەن هاوڕازو خەم ڕەوێن
بووی
کەرێت ئەکرد لەگەڵمانا !
ئیتر سەیران تامی نەما
گەران و پیاسەی ناو باخان
قاچی ووشك بوو
ئەژنۆی چەما
ئاخر بێ تۆ
وەجاخی سەیران چۆن گەش
ئەبێتەوە؟!
کێ وەکو تۆ ون ئەبێت و
دیار نامێنێ و
لەپاش کەمێك بە کۆڵێك چیلکەو
دارەوە
دەرکەوێ و بگەڕێتەوە ؟
دانیشە برا

دە ئیتر بەسە چی ئەکەی
هەموومانت فێری تەمبەڵی
کردووە
لەو ساتەوە لەم تەڵانەدا
دانیشتووین
تۆ هەر دێیت و دەجووڵێیت و
ئێمەش هێشتا دەستمان بۆ هیچ
نەبردووە !
بێ دانیشە
لاکۆپلە شیعرێکی هەورامی
بخوێنەوە
یادگاری بەرنامەیەکی (
بەهۆرامی )
یان ( گوڵزاری هەورامان )
بگێڕەرەوە
مەڵێ نایەم
ئیتر ئەرۆم نایەمەوە
بۆ ئەتەوێ
لەپاش ئەم هەموو تەمەنە
تازە بەتازە زویر بی و
دڵمان لەخۆت برەنجێنی ؟!
نا نا ئەوە هەرگیز تۆنیت
پشت هەڵکەیت و
برۆیت و ئیتر جارێ تر
نەماندوێنی !!
( خوات لە گەڵ هاورێ و
کەس و برا ئازیزەکەم )